عەلی بچکۆل

# سەختەڕێ
# لە چەمی ڕەزانەوە تا ترۆپک

پیاچوونەوە: محەممەد عەبدوڵڵا

سلێمانی - ٢٠١٨

# سەختەرێ
# لە چەمی ڕزانەوە تا ترۆپک

ناوی کتێب: سەختەڕێ
بابەت: بیرەوەریی
نووسینی: عەلی بچکۆل
مونتاژی ناوەوە: بەختیار ئەورەحمان
بەرگ: جەبار سابیر
شوێنی چاپ: چاپخانەی کارۆ
ساڵی چاپ: ٢٠١٨
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخ: ٥٠٠٠ دینار
چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠١٨
کوردستان-سلێمانی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٩٨٣) ساڵی ی پێدراوە.

## پێشەکی

ڕۆژێک لەڕۆژان پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵێک تێکۆشەرو هاوخەباتی ڕاستەقینەی گەلەکەمان زۆر بەدڵسۆزیی، گەنجیی خۆمان بەخشی بەم وڵاتەو لەدامێنی ئەم هەورازەدا دەستمان پێکردو هەنگاومان نا، جگە لە بەرگەگرتنی ئازارو نەهامەتیەکان، بەختیش بۆ ئێمەی هێناو گەیشتینە ترۆپکی سەرەوە، بەر لەئێمەش پۆل پۆل تێکۆشەرانی گەلەکەمان ئەم هەورازە ڕێیەیان بری، بەڵام مەخابن کرمی ناو خۆمان و گەلەکۆمەکێی نەیارەکانمان ڕێگایان لێبەستن و لەزەلکاوی نەزانیدا خنکاندیانن و لەکۆتادا هەرەس و نوچدان پێشی پێگرتن.

بەردەوامبوون و نوچنەدان زامنی سەرکەوتنە، ئەو ڕۆژگارەی من سەری خۆم سپارد بەگەلەکەم و ڕێی خەباتم هەڵبژارد، تروسکەی هیوا زۆر کزبوو، وەلێ من هەمیشە شەوقی ئازادییم بەدیکردووە، بۆیە هەرگیز بۆ ساتێکیش نەپەشیمان بووم و نەماندویێتی ڕایگرتووم.

ئەوەی ئێستا بەدیهاتووە من بە بەری ڕەنجی هەزارانی وەک خۆمی دەزانم، هەرچەندە ئەوەی ئێستا هەرگیز خەونی ئێمە نەبووە، بەڵام خەبات ناوەستێت و ئەرکی گەنجانی ئێستایە ڕێی سەختی خەبات بگرنەبەر و خەونی ئەم نەتەوە چەوساوەیە بهێننە دی.

من نەچیرۆکنووس و نەمێژوونووسم، خۆشم بەنووسەر دانانێم، بەڵام بەئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم ڕاستگۆیانە لەم کتێبەدا ئەوەی ڕوویداوە باسی بکەم و بیخەمە بەردەم گەنجانی خوێن گەرم، ئەوەی لەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە نەچیرۆکەو نەسیاسەتکردنە، ئەمە ڕۆژەکانی ژیانی خۆمەو بەخۆش و ناخۆشیەوە بەمافی خۆمی دەزانم بیانگێڕمەوە، چۆن ڕوویانداوە ئاوا، هیچ شتێکم باس نەکردووە کە خۆمی تێدانەبووبم، تا لە دوو توێی یاوەوەریەکانمدا ببمە شاهیدی ئامادەی ڕووداوەکان کە ئێستا بوونەتە مێژوو.

هەموو کات وتنی ڕاستیەکان هەندێک لە بکەرەکان زویر دەکات، بەڵام ڕاستیەکان موڵکی نەتەوەیەکە بۆیە زۆر بە بێگەردی و ئەمانەتەوە گواستومنەتەوە تا ببێتە ئەرشیفی ساڵانێکی مێژووی ئەم وڵاتە. گرنگە هەمووان قۆڵی لێهەڵماڵن و ڕاستیەکان وەک خۆیان باس بکەن، تا کەس نەتوانێت هەڵەکانی دوێنێ بەقارەمانێتی خۆی بگێڕێتەوە. ئەو ڕۆژگارانە بەهەڵەو سەروەریەکانیانەوە هی هەموومانن، بۆیە هەقە کەس لەباسکردنی ئەو ڕۆژگارانە دڵی گەرد نەگرێت، تا بە هەموومان ڕێ لە دووبارەبوونەوەی

هەڵەکان بگرین و سەروەریەکانیش وەک خۆیان لە مێژوودا بچەسپێنین.

داوا لەخوێنەری ئەم کتێبە دەکەم بمبەخشێت کە ماندووی دەکەم، بەڵام دڵنیای دەکەمەوە کۆمەڵێک زانیاری و گوزەرانی ڕۆژگارێکی بۆ باسدەکەم کە تا ڕادەیەکی باش نزیک دەبێتەوە لە خەیاڵ و فەنتازیا، ئێمە لەکونجی زیندان و لەو شاخ و کێوە وا ژیاین و خەباتمان کرد، دوژمنان و هاوکارانیشیان ئاوا ڕەفتاریان لەگەڵ کردین، ئەمە بەشێکە لە یادەوەرییەکانی من و بەشەکەیتریشی لەئایندەدا بەدوایدا دێت، چونکە من بە ماڵ و منداڵەوە لە ساڵی (١٩٩٠)ەوە بۆ ماوەی (٩) ساڵ ئاوارەی پاکستان بووم و نەهامەتیەکانم لەوێ کۆڵێک زیادیانکرد، ئەو باسەش لەکتێبێکی دیکەدا بڵاودەکەمەوە.

پێشتر دوو کتێبم بە ناوەکانی (هەورازە ڕێ) و (کوانوی بەرگری) بڵاوکردۆتەوە، هەردووکیان بیرەوەری خۆمن، لەم کتێبەشدا جگەلە کۆمەڵێک یادەوەری دیکە، زۆربەیم دووبارەکردۆتەوە، چونکە لەڕووی چاپ و هەندێک وردەکاریی و تیراژەوە بە دڵم نەبوون، ویستم دووبارەیان بکەمەوەو بەشێوازی زنجیرەی مێژووی ڕووداوەکان ڕێک بخەمەوە، ئەمەی بەردەستتان لەسەرەتای ژیانمەوە باسدەکات تا ئەوکاتەی بەناچاری بەرەو پاکستان کوردستانم بەجێهێشت، کە لەماوەیەکی نزیکدا ئەو کتێبەش بڵاودەکەوە چونکە باسی ڕۆژگارێکی سەختی ژیانی کۆمەڵێک مرۆڤ دەکات کە لە پێناوی نیشتماندا تاڵی دنیایان چێشت.

جێی خۆیەتی سوپاس و پێزانینم بۆ هەموو ئەو برادەرانە دەرببڕم کە هاوکاریانکردم لە نوسین و چاپکردنی ئەم کتێبەدا، بەتایبەت کاک محەمەد عەبدوڵڵا کە دۆستانە سەرپەرشتی کارەکەی گرتە ئەستۆی خۆی، هەروەها سوپاسی تایبەت بۆ بەڕێز نەوزاد عەلی ئەحمەد کە ئەرشیفەکەی خستە بەردەستمان.

سەرکەوتووبن

خۆشەویستیم بۆ ئێوە

عەلی بچکۆل

٢٠١٨/٨/٢٠

## ژیاننامەیەکی پڕ لەسەروەریی

باوکــم ناوی محەمەد قادر ئەحمەد بەگە، هاوســەرەکەی خەڵکی گوندی گەڕاوە لەناوچەی قەڵاســێوکەو کچی ســەید ئەحمــەدە. پێدەچێت محەمەدی باوکم خۆشــی لەناوچەی قەڵاســێوکەو هەر لەو دەوروبەرە هاتبێتە دنیاوە، بەڵام قادر ئەحمەد لەبنەماڵەی جافەر سوڵتانی هەورامانەو کارەساتی ڕۆژگار هەڵی بڕیوەو لەکانی مارانی کوێرەوەبووی کەڵەشێرەو گەورەدێ خۆی جێگیر کردووە، ئەوێی بەموڵکی خۆی زانیوە، ئەمە بەپێی قسەی هەندێک لەخزمانی خۆمان لەگوندی بلوکین، وەکو مەلا ســەعیدو حەمە ئەمینی برای و کوڕانی ئامە چەورەو حەمە سەعیدو براکانی.

پاش ماوەیەک باوکی محەمەد کۆچی دواییکردووەو ئایشەی دایکی ماوە، کاتێک کە ژنی هێناوە ئەویش هەر ناوی ئایشە بووە، بۆیە لای دەرودراوسێ بەحەمەی ئایشان بانگکراوە، واتە حەمەی دوو ئایشە.

ماوەیــەک ژیانیان بــاش بەڕێوەچووە، بــەڵام وردەوردە باری ئابووریيان گۆڕاوە. محەمەد منداڵی زۆری هەبووە، هەرچەند زۆریش بێدەرامەت بووە، بەڵام زۆر ئیشــکەرو بەدەسەڵات بووەو هەرگیز لەوە نەترساوە خێزانەکەی چەند زۆر ببێت. منداڵەکانی هەندێکیان کۆچی دواییانکردووە، ئەوەی مابوون لەژنی یەکەمی عەبدوڵاو عەبدولڕەحمان و عەلی و ئامین بوون.

عەبدوڵا محەمەد هاوســەرەکەی ناوی بەحری کچی ئەســعەدەو خەڵکی کارێزەی ناو شوانەو بەکرو سیروان و شوان و قومری و مەریوانی هەبووە، قومری کۆچی کردو مەریوانیش بەنارنجۆکێکی دەستی کە بەدەست خۆیەوە تەقیوەتەوە شەهیدبووە، هاوسەرەکەی ناوی سەبریەیەو کچێکی هەیە بەناوی مەردین.

بەکر هاوسەرەکەی ناوی پەروینەو کچی ڕەشە قەمەرەی کەرکوکەو سێ کچی هەیە، تافان و کۆژان و هەنسک، کوڕێکیشی هەیە بەناوی هەستیار.

ســیروان عەبدوڵا ژنەکەی ناوی ســەبرییەو دوو منداڵی هەیە، ئاڤێستاو محەمەد پاشان دوو ژنی تریش دەهێنێت.

شــوان عەبدوڵا ژنەکەی خەڵکی شــێخانی سوورقاوشــانەو کچی شــێخ قادری شــێخ مســتەفایە، ســێ منداڵی هەیە بەناوەکانی سەیوان و کەسان و باوان، پاشان کۆمەڵێک منداڵیتری بووە.

عەبدولڕەحمـــان محەمەد ژنەکەی ناوی زەهۆ ئەحمەدەو خەڵکی گوندی کڵێســـەی بەری کۆیەیە، ســێ منداڵی هەبوو عومەرو عوســـمان و دڵشـــاد. عوسمان پێشمەرگەبوو لەلایەن زۆڵە کوردێکەوە ئیخباری کراو دەستگیرکرا، پاش ئازاردانێکی زۆر لەموســڵ لەســێدارەدرا. عومەریــش ماوەیەکی زۆر پێشــمەرگەبوو، لــەدوای هــەرەس دیســـان بــووەوە بەپێشــمەرگەو پلەی فەرماندەی کەرتی پێدراو لەبەر ســەختی بارودۆخەکەی ئەوسا دووچاری نەخۆشی هات و بەنهێنی برایە سلێمانی و لەئەنجامدا کۆچی دواییکرد. سێ کچی لەپاش بەجێماوە، بەناوەکانی پرشنگ و مەشخەڵ و پەیمان، ئەوانیش لەئەنفالە بەدناوەکەی بەعســیەکاندا بێسەروشــوێن کــران. لەگەڵ زۆربەی زۆری خەڵکــی گوندەکەیـــان و لەگەڵ خاوەری دایکیـــان کە ئەویش خەڵکی عەسکەربوو، کچی سەید کەریمی ناڵبەندبوو.

عەلی محەمەد قادر ژنەکەی ناوی ڕووناکەو کچی شێخ مەحمودی شێخ مستەفای شێخانە، شەش کوڕی هەیە بەناوەکانی کاروان و کارزان و کاراو هەژان و کوڕەو و کۆڤان.

بەپێی یاسای ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەوەی ڕۆژی لەدایکبوونی نەزاندرابێت زۆر ئاســاییە لەیەکی حەوتی ساڵدا بنووسرێت، منیش بەهۆی هەژاری و کەمدەرامەتی باری ئابووری بنەماڵەکەمان مێژووی (١٩٤٣/٧/١) بەرکەوتووە. بەمەرجێک ئەمەشــیان دروســت نییە، چونکە برایەکی لەخۆم گەورەترم بووە بەناوی عەلی چەند ســاڵێک ژیاوە پاشان کۆچی کردووەو دوابەدوای ئەوە منیش ســەرەم بەرکەوتووە بێمــە دنیای نائارامەوەو هەر لەسەر کۆنە ناوەکەی کاکە عەلیم ناونووسکراوم. خواو خۆشم دەزانین لەو ڕۆژەدا هەردووکمـــان لەدایک نەبووین. کاتێک هۆشــم کردەوە لەکراســێکی خامی چڵکنی پینەپیناویداو بەبێ شەڕواڵ و لەژوورێکی تاریکی پڕ لەکوڵەکەی گێڕوگەواڵ و لەسەر ڕاخەرێکی حەسیری دەستکردی خۆماڵی و لەئاگردانێکی بچووکی حەوجۆش لەســەردا خۆم ناسیوەتەوە. هێشــتا نەبووم بەهەشت ســاڵ هەر وەکو بەرخۆلەی لەشــیر دابڕاو چۆن لەشیر دەیبڕنەوەو بەخۆیدا دەشــکێتەوە، منیش ئا ئەوها بەکۆچی دوایی دایکی خۆشەویســتم بەخۆمدا شکامەوە. لەکاتێکدا لەسەرەمەرگدابوو تاکە وەسێتی بۆ زەهۆی براژنم ئەوە بوو پارێزگاری لەمن بکات.

بەمردنی دایکم شــێرازەی ڕێکوپێکی ماڵمان پســاو تەنانەت شــۆربای ساوەریشــمان بەباشــی بۆ لێنەدەنــرا، جلوبەرگمان بۆ نەدەشــۆرا، چونکە ئەوسا تایت و سابوون نەهاتبووە بازاڕی لادێکانەوەو منیش توانام نەبوو، کاکیشم ماڵیان جیابوو خوشکێکی دەست گۆج و فێداریشم هەبوو، ئەویش

کارەکانی پێ هەڵنەدەسوڕاو هەموو ئەرکەکە دەکەوتە سەر باوکم، ئەویش لەبەر کۆششی بەدەستهێنانی ژیان بۆی نەدەکرا هەر بەدەوری ئێمەدابێت، بۆیە ژیانێکی نوێی زۆر ئاڵۆز ڕووی تێکردبووین.

نانکــردن یەکێک بوو لەکارە گرنگەکانی ئێمە، چونکە لەلادێدا نانی کڕین نەبوو، ئەگەر یەکێک نەبووایە نانی بۆ بکردبایە ژیانت ئاسان بەڕێوەنەدەچوو، هــەر بۆیە هەر ڕۆژە ڕوومان لەماڵێک دەنا نانی چەند ڕۆژێکمان بۆ بکات، ئــەوەش هەمــوو جارێــک لەڕوومــان نەدەهــات و زۆرجاریــش بەبێ نان دەماینەوە.

ماوەیــەک بەهێلکــەی مریشــکەکانی خۆمــان ڕۆژمــان دەبردە ســەر، نەماندەزانی چۆن بۆشایی دایکم پڕ بکەینەوە.

پارەو پوولێکی وەهامان نەبوو تا ڕۆن و شــەکرو چای پێبکڕین، بەڵکو جارجار بە ئەلیدەرم و ئیزرەم ڕۆژمان پێیبەڕێوە دەبرد.

ســەرچاوەی دەرامەتمان بازووی باوکــم و کوڵی دوو گوێدرێژەکەمان بــوو، کــە مانگانــە بارێــک، دووان خەڵوزیــان پێدەبــرا بۆ شــارو لەوێ دەیانفرۆشــت، بۆ تەواوکردنی ژیانێکی مەمرەومەژی.

لەســاڵی ١٩٥٣ جارێکیتر پرۆژەی کارکردنی من نوێکرایەوە، هەمیشــە دەوڵەمەندەکانــی گوند پێویســتییان بەوەرزێرێک هەبوو بــۆ بەخێوکردنی بەرخ و کارو گاوگۆتاڵیان، جگەلەوەی ماڵە مەڕدارەکان دووجۆر شــوانیان دەویست، یەکیان بۆ شوانی مەڕ کە زۆربەی کات بەشاخەوەیەو لەڕۆژێکدا یەکجــار دەبێــت ڕانەمەڕەکەی بهێنێتەوە بــۆ دەوری گوند، یان ناو ماڵان بۆ دۆشــین و بــەرخ و کار مژانــدن، هــەر بۆیە زۆرجار دەهاتنــە لای باوکم و براکانــم بــۆ ئــەوەی بەنرخێکی زۆر کەم مــن وەربگرن بــۆ لای مەڕەکان یــان بەرخۆڵەکانیان، ئێمەش خێزانێکی زۆر بێدەرامەت بووین، کارکردنیش بەرزتریــن پلــەی شــەرەفمەندییە لەچــاو تەمبەڵــی و کاریتــری خراپەوە. بۆیــە ڕازی دەبــوون و ســاڵ بەســاڵ بەرخەوانــی یان شــوانییەکەیان بۆ نوێدەکردمــەوە. وەهای لێهاتبوو ناوبانگم دەرکردبوو، لەباش پارێزگاری و لەوەڕاندنی مەڕەکان یان بەرخەکان، ســاڵ بەساڵ چەند ئابووری دەگۆڕاو بەرزدەبووەوە، ئەوەندەش مانگانەی من زیادیدەکرد، تەنیا بۆ حەفتەیەکیش نەدەکەوتمە ماڵەوە.

ســاڵی ١٩٥٤ لەگوندی مایلەوە کە نیو کاتژمێرێک لەگوندەکەی خۆمانە دوورە، هاتــن داوایانکــردم و بەڵێنــی ئەوەیــان دا (١٥) قەزناخ گەنم و جۆ

بدەن لەکرێکاری سێ مانگدا، واتە سێ (٣) مانگ بەرخەوانیان بۆ بکەم، (١٥) قەزناخ گەنم و جۆ بدەن بەباوکم. لەسەری ڕێککەوتن، سێ مانگ بەو منداڵییە زووخاوی ئاوارەییم چێژت، بەوەی باش بوو دایکم نەمابوو ئەگینا لەو تەمەنەدا بێ نازی دایک منداڵ ناتوانێت بەئاسانی بەڕێی بکات. لەگەڵئەوەشدا کە لووتکەی شاخێکی گوندەکەی خۆمانم لێدەردەکەوت لەکاتی بەرخ لەوەڕاندندا، شتێکی بێ وێنە دڵی دەگوشیم و هەستمدەکرد لەخۆشییەکی بێ وێنە دابڕاوم، کە ئەویش خۆشی ئەو شاخ و دەشت و گردۆڵکانەیە کە یەکەمجار لەکاتی ساوایەتیمدا چاوم پێیان ئاشنابووبوو.

سێ مانگەکە تەواو بوو، داوای گەڕانەوەم کرد، بەڵام خاوەن بەرخەلەکە زۆر شیرینی پێمداچووبوو، هەستیدەکرد بەرخەلەکەی چاک بەخێوکراوە، دەیویست دڵم ڕاکێشێت بۆئەوەی سێ مانگیتر لەوێ بم و مەڕی بۆ بلەوەڕێنم، بەڵام سۆزی دووری گوندەکەمان بەهێزتر بوو، ڕازی نەبووم و گەڕامەوە گوندەکەی خۆمان.

لەپێنجەمی پەنجاکاندا لەگوندی خۆمان بووم بەشوان و لەو لوتکانە مەڕەکانم دەلەوەڕاند، کە سۆزی دووری ڕایانکێشامەوە بۆلایان، لەشوانییەکەمدا شەونخونییەکی زۆرم دەبینی، لەبەهاراندا شەوان مەڕ لەدەرەوەی گوند دەمێنێتەوە، منیش بەتەنیا بەگۆچانێک و کەپەنکێکەوە، بەدوو سەگی کەللە زلی خاوەن مەڕەکانەوە هەتا بەیانی دەمامەوە، ئەو شەوانەی باران دەباری لەگیاڕەشی بەهاردا، بەهۆی چەخماخەی هەورو گرمەگرمەکەی لەپاڵ بارانی بەباوەو دەنگی وزەوزی دارەوە، مەڕەکان جێگایان بەخۆیان نەدەگرت. سەگەکان دەوەڕین بەجۆرێک دز یان گورگمان لەسەربێت، دڵیان دەهەژاندم، خۆم لێهەڵدەکرد هەتا پشتی ئەژنۆم، بەهەر چوار دەوری مێگەلە مەڕەکەدا بەوپەڕی دڵسۆزییەوە دەسوڕامەوە، بەگورگە لۆقە تا شەوم ڕۆژدەکردەوە نەمدەتوانی چاوەکانم بۆ تاکە چرکەیەکیش لێکبنێم. لەنێوانی گرمەگرمی هەورو حەپەحەپی سەگ و ڕەوینەوەی مەڕەکان و ساردی بارانی بەباوەو تەڕی لەشم، ددانەکانم قرچەقرچیان لێدەهات و بەهەموویان دەیانخافڵاندم، ئاگام لەوە نەدەما منداڵێکی وەکو من دەبێت چی لێ بەسەربێت؟ تەنیا هۆشم لای ئەوە بوو گەلەگورگێکم لێپەیدا نەبێت و خۆیان بکەن بەناو مەڕەکەداو هەندێکی لێ کەلە پارچە بکەن و ئابڕووم بچێت. لەوڵاتانی ئازادو میللەتانی خواپێداودا منداڵی ئەو تەمەنە بەڕۆژ قوتابخانەو بەشەویش پاش تەواوکردنی وانەکانی بەدیار هۆیەکانی خۆشگوزەرانیدا خەویان لێدەکەوێت، منیش سەرماو ترس نەیاندەهێشت خەم لەژیان و مەرگی خۆم بخۆم.

ماوەی دوو سێ ساڵ ژیانم بە بەرخەوانی و شوانی بردەسەر، لەهاوینانددا لەدەوری گوندەکە مەڕەکەم ڕادەگرت، کاتێک دەمویست بخەوم دەستبینم لەبەرانە گەورەکە یان لەبزنێکی قسر دەگرت بۆئەوەی ئەگەر مەڕەکە ڕای دا واتە ڕۆیشت لەگەڵ خۆی ڕامبکێشێت و خەبەرم بێتەوە. دەستبین لەپەتێکی درێژی ئەستوور دروستدەکرێت، سەرێکی لەقاچی حەیوانەکە توند دەبەستیت و سەرەکەیتریشی لەدەستی خۆت دەبەستیت، کاتێک مێگەلە مەڕەکە گورگ ڕاوی دەنێت یان خۆی لەبرسان ڕادەدات، ئەو بەرانە یان حەیوانەی دەستبینی لێدەکرێت ڕاتدەکێشێت و خەبەردەبیتەوەو فریا دەکەویت تا مەڕەکان لێت دانەبڕێن.

لەحەوتەم و هەشتەمی پەنجاکاندا وازم لەشوانی و بەرخەوانی هێناو هاتمەوە ناو ئاوەدانی.

لەزستاندا بەپشتی گوێدرێژ دارم دەهێنا بۆ فرۆشتن، باری دار بە (٢٥٠) فلس بوو ئەویش ئەگەر بارە دارەکە زۆر چاک بوایە، کڕیاری دار زۆر کەم هەبوو تەنیا چەند ماڵێک دەیانکڕی، باقی گوندەکە خۆیان داریان دەهێنا، بۆیە دارەکەشم کڕیاری زۆر لەسەر نەبوو، بەڵام هەر چارنەبوو ڕۆژانە دەڕۆیشتم بۆ خۆشمانم دەهێنا.

لەهەشتەمی پەنجاکاندا ڕژێمی پاشایەتی ڕووخاو عەبدولکەریم قاسم عێراقی بەجمهوری ناوبرد، ئەمە ڕاچڵەکینێکی گەورەبوو، خەڵکی ڕاپەڕین و قسەوباسی ئازادی و دیموکراتی هاتە ئاراوە، جوتیار وەکو مێشهەنگ پورەی داو کەوتنە ویزەویز، خەڵکی گوندەکان توندڕەوانە دژی خاوەن زەوییەکان کەوتنە کارو لەزۆر گونددا شەڕە تفەنگ دروستبوو لەنێوانی جوتیارو خاوەن زەوییەکاندا. لەو ساڵانەدابوو کە پرۆژەی (سەد)ی ئاوی دوکان دەستیپێکرد، خەڵکێکی زۆری لادێکان لەوێ دامەزرابوون، پارە پەیدا ببوو، خەڵکی بەرچاویان ڕوونتر ببوو. هەردوو براکەی منیش لەگەڵ کۆمەڵێک لەخەڵکی گوندەکەمان لەو پرۆژەیەدا کاریاندەکردو بەتەواوەتی بارودۆخی ئابووری گوندەکەمان گۆڕا. منیش ڕزگارم بوو لەشوانی و بەرخەوانی و لەهاوینی ئەو ساڵە بووم بەسەپان و بۆ یەکەمجار گەنم و جۆیەکی چاکم وەرگرت و پارەکەیم دایە دوو سێ سەر حەیوان و خستمە ناو مێگەلی ماڵێکەوە.

زۆرم حەز لەخوێندن دەکرد، دەمویست بەرنامەی بۆ دابنێم، ڕێکەوت لەگەڵ ئەوەدابوو کە مامۆستای گوندەکەمان پیاوێکی نیشتمانپەروەرو کوردێکی دڵسۆزو نەترس بوو. ناوی ئیبراهیم ساڵح ئەفەندی بوو، خەڵکی شاری کۆیە بوو، شاری حاجی قادری نەمر، ناوەناوە خەڵکی کۆدەکردەوەو

لەســـەر تەختایی قەڵاکەی داوێنی گوندەکەمان، هەر جارە لەســـەر شـــتێک قسەی بۆ دەکردین.

هەر لەو ساڵانەدابوو قوتابخانەی شەوی بۆ کردینەوە، دە پانزە ڕۆژێک قوتابخانەکە درێژەی کێشـــا، توانیم کەڵکی باشـــی لێوەربگرم، بۆ ناساندنی وشـــە ســـەرەتاییەکان و لێکدانیان بەحنجە، لەپاڵ ئەوەدا کاکی بەڕێزم کاکە عەبدولڕەحمان هاوکاری چاکی کردم بۆ ئەوەی فێری خوێندن و نووســـین ببـــم، زۆری هاندەدام، شـــەو و ڕۆژ بەدوای وشـــەدا دەگـــەڕام، خێرا خێرا نیشانی کاکەم دەداو ئەویش بۆی ڕاست دەکردمەوە.

لەنۆهەمی پەنجاکاندا ســـەپانی و توتنەوانیم بەیەکـــەوە ئەنجام دەدا، ئەو ساڵەش شان بەشانی کارکردن، دەستمکرد بەخوێندنەوەی کتێبە کوردییەکانی (ئەمیـــر ئەرســـەلان)ی ڕۆمی و (شـــیرین و فەرهاد)و (خورشـــیدو خاوەر)و (میعراجنامە)و (قەڵای خەیبەرو قەڵای دمدم)و ئەو بابەتەی کە شەوانە لەپاڵ شەوچەرەی زستانی لادێدا دەخوێندرانەوەو کۆڕی ماڵە لادێی بۆ دەگێڕدرا. کۆلکە خوێندەوارو فەقێی مزگەوتەکان بۆیاندەخوێندنەوەو ژن و پیاو و منداڵ ســـەریان بەسەردا دەژاندو هەندێکجار فرمێسکی بەکوورپیشیان بۆ دەڕشت، بەڕاســـتی ئەوەش خۆی لەخۆیـــدا هۆیەکی چاک بوو بۆئـــەوەی خوێندنەوە فێرببم و گەشەش بدەم بەنووسین لەڕێی نامەناردن بۆ ئەو کوڕە گەنجانەی لادێکەمان کە لەســـەربازی بوون لەخوارو و ناوەڕاستی عێراق. هەرچەندە زۆرجار داوایان لێدەکردم لای خەتخۆشـــێک بۆیان بنووســـم، گوایە نازانن من چییان بۆ دەنووسم، بەڵام من گوێم پێ نەبوو، جار لەجار باشتر نامەم دەنوســـی و هەندێکجار پاش نووسین دەم دا بەکاکە عەبدولڕەحمانی برام، بۆی تەماشا دەکردم و هەڵەکانی ڕاستدەکردەوە.

ســـاڵی نۆهەمـــی پەنجـــاکان بـــوو، وردەوردە ناکۆکییەکانـــی نێوانـــی جوتیـــاران و خـــاوەن زەوییەکان ڕوو لەتەقینەوە بوو، جارجارە شـــەڕیش دەســـتی پێدەکرد. خاوەن زەوییەکان جارجار ســـەریان بـــەرز دەکردەوەو دەیانویســـت تۆڵـــەی ڕاپەڕینی ســـاڵی پێشـــوو لەجوتیاران بکەنـــەوە. کاکە عەبدولڕەحمانـــم بەتەواوەتی تێکیدابـــوو لەگەڵ نۆکەرانی خاوەن زەویەکانی گوندەکەمـــان. وای لێهاتبـــوو مەترســـی لەناوچوونی کەوتبووە ســـەر، بۆیە تفەنگێکی قەســـەلی کۆنی کڕی و پارێزگاری خـــۆی پێدەکرد، منیش چوومە ماڵـــی خزمێکمان لەگوندی گوزە بۆرە تفەنگێکی ســـێ تیری کۆنەی هەبوو، بەئەمانـــەت هێنام بۆ ماوەی ســـاڵێک لەپاڵ کاکەمـــدا بۆ پارێزگاریکردن لەو دوور نەدەکەوتمەوە.

هــەر ئــەو ســاڵانەبوو یەکێتی جوتیاران دروســتبوو، لەهــەر گوندێکدا کۆمەڵێک جوتیــار هەڵدەبژێردران بۆ پارێــزگاری لەبەرژەوەندی جوتیاران، کاکە عەبدولرەحمانم کرابوو بەســکرتێری جوتیاران لەگوندەکەی خۆمان و ئــەوەش ئەوەندەیتــر ناکۆکییەکەی نێوان خــاوەن زەوی و کاکەمی توندتر کردبوو.

ساڵی یەکەمی شەستەکان بوو، پارتی دیموکراتی کوردستان زیاتر لەماڵە دەوڵەمەندو خاوەن زەوییەکانی لادێکان نزیکدەکەوتەوەو ڕێکخســتنەکانی خۆی باشتر دەجووڵاند لەناو جوتیاراندا، دیاربوو وردەوردە ناو نووسینی چــەک و تەقەمەنی دەکرد بۆ کاتی دەســتپێکردنی شــۆڕش، بەم بۆنەیەوە خــاوەن زەوییەکان جارێکیتر گڤ ببوونــەوە، وردەوردە یەکێتی جوتیاران باو و برەوی نەما.

لــەو لایشــەوە پارتی کۆمۆنیســتی عێراقی لەناو جوتیارانــدا کەوتبووە هەلاو هەلاوی تەلەفونی درۆ لەلادێوە بۆ بەغدا، کادرێکی پارتی کۆمۆنیست لەلادێوە قســەی لەگەڵ سەرۆک کۆمار عەبدولکەریم قاسم دەکردو دەیوت چەند دەراســەو چەند تراکتۆرو چەند ســەفقە پارە بنێرن دابەشــی بکەین بەســەر جوتیاراندا. ئەمە بۆئەوەی جوتیارەکان بەلای خۆیاندا بەرن و ببن بەهاوڕێــی ڕێکخســتنی خۆیان و لەبۆربۆڕێنیشــدا لەلادێکاندا ســەرکەون بەسەر پارتیدا.

لەئەیلولی یەکەمی شەســتەکاندا پارتی و خاوەن زەوییەکان کەوتنە ناو جوتیاران و داوایانکرد هەر ماڵێک نەفەرێک ئامادە بکات بۆ شەڕی دەوڵەتی قاسم، ئەو ماڵانەی چەکیان هەیە نەفەرێک و چەکەکەی ئامادە بکەن، ئەگەر چەکیان نییە چەکی دەدەنێ‌و نۆبە بکات لەگەڵ خەڵکی بۆ چوونە سەنگەری دژی ڕژێمی قاسم.

ئێمەش ئەوسا سێ برا بووین و بەناو دوو تفەنگمان هەبوو، هەرچەندە بەهەردوو تفەنگەکە بیســت فیشــەکی چاکمان هەبوو ئەوەیتری لامان بوو خۆمان دامانگرتبۆوە، کە زۆریان هی ئەوە نەبوون بتەقێن.

سەرەتا کاکە عەبدولرەحمانم خۆی دەستنیشان کرد بۆ چوونە سەنگەر، مەسەلەکە وەهای لێهاتبوو دەبوو ماڵی نەفەرێک بۆ نۆبەتداری ئامادە بکات، لەماڵی ئێمە کاکەم عەبدولرەحمان خۆی سازداو لەهەشت و نۆی ئەیلوولدا بەڕێکــەوت، لەگەڵ خەڵکــی گوندەکەمان بۆ دەربەندی بازیــان. هەرچەندە ئەوســا ناحیەی ئاغجەلەر مدیری ناحیەو پۆلیســی ڕژێمــی تێدابوو، ئەوان

بەپشتی ئاغجەلەردا ڕۆیشتبوون و لەو ڕۆژانەوە ڕێگای سلێمانی- کەرکوک بەحیساب گیراو ڕاگەیەندرا کە یاداشتێک دراوە بەڕژێم، ئەگەر وەڵامەکەی زۆر بـاش نەبێت لەکاتێکدا هێـزی ڕژێم لەو ڕێیەوە هات لێی بدرێت و لەو ڕۆژانەشدا هاتوچۆی ڕژێم ڕاگیرابوو.

یەک دوو ڕۆژ کاکەم لەناوماندا نەبوو، ماڵ و منداڵەکەی بۆی بێتاقەت ببـوون، منیـش هـەراش ببـووم، حەزمدەکرد مـن برۆمە شـوێنی و ئەو بنێرمـەوە بۆ ناو منداڵەکانی، لەڕۆژی (١٠)ی ئەیلوولی ١٩٦١ ڕۆیشـتم بۆ دەربەندی بازیان، کاتێک گەیشـتمە ئەوێ عەسـرێکی درەنگ بوو، بەسـەر دابەشـکردنی نـان و کاڵەک و شـووتیدا ڕۆیشـتم. چوومە سـەر لوتکەی شـاخەکە بەڕێی کارگـەی چیمەنتۆکە، لەوێ چەکدارەکان زۆریان ناسـیار بـوون، کاکـەم لەناویاندا دیار بوو. پاش پشـوودان ئـاگاداری کاکەم کرد بڕواتەوەو خۆم لەوێ مامەوە، من لەهەموویان منداڵتر بووم، بۆیە ناردیانم بەشی ئەو گروپە ئازوقە وەربگرم و بۆیان بهێنمە سەر شاخ، دابەشکردنەکە لەبەرامبەر بەردەقارەمان لەناو دارەکاندا تاکە هودەیەک هەبوو هی باخەکە، لەوێدا بارەگای ئیدارە داندرابوو، بەڵام بەلۆری نان لەشـارەکانەوە هاتبوو، خەڵکی وەکو ئێمە لادێیی نانی سـپی شـاری و ئەو هەموو میوەیەی دەدی بەخۆڕایی و بەبرایانە دابەشـدەکرا بەتەواوەتی ورەی پێبەرز دەبۆوەو پێی وەهابوو تازە دوژمن نەماوە.

سـەنگەرەکەمان جۆرەها دەموچاوی تێکەوتبوو، هەمووشی خۆی بەوە دەزانی دوژمن تێکدەشـکێنێت، چونکە شوێنەکەی چڕو بەرزو خواردنیشی بـێ خـەرج و بەتەبایی پێدەدراو بەتەواوەتی میزانـی هێزی لێتێکچوو بوو، خۆی بەمەلیکی باخ دەزانی.

منـی منداڵی دنیانەدیدە هـەر ئەوەندەم پێدەکرا چا تێبکـەم، ئاو بگێڕم، ئازوقە سەربخەم، تەماشایان بکەم و وزەیان لێوەربگرم.

دیمەنێکی زۆر نامۆبوو، پێشـووتر شـتی وەهـام نەبینی بوو، ئەوەش بوونـی جۆرەها دەموچـاو بەجۆرەها چەکی بچووکـەوە، بەهاربوو، لای هەندێکمان وەهابوو دەستنوێژی خۆیان و گونی ئەسپەکانیان لەئاوی بەغدادا دەشـۆرن و دوژمـن لەکونفەیەکونێکدا لەکوردسـتان ڕادەماڵن. منی منداڵی دەمـڕووت تەنیا ئاوم بۆ دەبردن و ئاگرم پێشـدەکردو چام بۆ تێدەکردن و فریای فشـوهوڕیان نەدەکەوتـم. تاوەتاوە هۆرەی جافـی، حەیران، لاوک، بەسـتەیان دەوت و بەقوولە بۆ یەکتریان دەسـەندەوە لەمبەر بۆ ئەوبەری دەربەنـدی بازیـان. هەرچۆنێک بوو دیمەنەکە هێنـدە دڵڕفێن بوو، نەمزانی

چۆن شــەو ڕۆیشــت، هەرچەندە گەلاوێژ کەوتبوو دنیا بەشەوان زۆر سارد ببوو، خۆمان گەرم داپۆشیبوو، سەرو پاڵتۆمان لەبەردابوو، ئاگرێکی نێڵەنێڵمان کردبۆوە، هیچ حیسابمان بۆ کاری سەربازی نەکردبوو کە شوێنەکانمان بۆ کاتی شــەڕ دەســت نیشــاندەکرێت، ئەوەی لای ئێمە حیســابی بۆ نەدەکرا دوژمن و هێزەکەی بوو.

بەیانــی ڕۆژی ٩/١١ بوو هێشــتا خــۆر دەرنەکەوتبوو، پیــاوە ئازاکانی لەســەردەمی کۆنــدا ناویــان دەرکردبوو بــەدزی گاوگوتاڵــی خەڵکی، ئەو سەردەمە شاهیدی ئازاییان بۆ دەدرا، وەکو کەو لەمبەروبەری دەربەندەکەوە لەسەر بەرزی شاخەکەوە دەیانخوێندو هەر یەکەیان لەئاوازێکیان دەوت و بەکۆمەڵ ورەیان بڵاودەکردەوە، سام خۆی دەتواندەوە لەئازایەتی ئەواندا.

لەملاولاوە لەسەر بەردە پانەکان ڕوویانکردە قیبلەو نوێژەکانیان خوێند، پاش لێبوونەوە، بزەی نادروســتیان دەکرد، پیاوی شارەزاو ترسنۆکت تێدا دەدۆزییەوە.

هەر ئەو ڕۆژەبوو، خۆر گزنگی خســتە ســەر بەرزایی لوتکەی دەربەند لەهــەردوو بەرەوە، لــەو کاتەدا دابەشــبووین لەســەنگەرەکانماندا، دەنگی فرۆکەی مێکی (٢١) دەهات بەسەرماندا، دوو مێک تیژ تێپەڕین ڕوو لەشاری ســلێمانی و خێرا لەولاوە گەڕانەوە ســەرمان و دەســتیانکرد بەبۆردومان. لەپێشــەوە لەو لۆریە زلە پڕ لەتەماتەیەیدا کە لەســەر چەقی شــەقامەکە بە نیــازی ئــەوەی ڕێگە بگرێــت لەتێپەڕبوونــی دەبابەو ناقیلەو ســەیارەکانی ســوپای دوژمن ئەگەر لەکەرکوکەوە بۆ سلێمانی بڕوات، داندرا بوون. هەر ئەوەندە ویزەو شڵپە پەیدابوو تەماتەبوو بەدۆشاو و خەنەو لەدەست و پێی شەقامەکە گیراو لۆری شەهیدبوو.

ئەو هاتوهاوارو دەنگەدەنگە نەما، ســەلاوات لێدان نەماو پیاوە ئازاکان جووڵەیان لەخۆبڕی، مەترســی ئەوە هەبوو شــەهید ببن، بەلام واش نەبوو بەڵکو ئەو ئازایانە جووت جووت بەرەو دوا هەڵهاتن و مەیدانی جەنگەکەیان چۆڵکرد.

هەندێــک خەڵــک کــە مەرکەزی عەشــایەری بوون و پێیان شــوورەیی بــوو هەڵبێن مابوونەوە، ئەوانەی دەمناســین حاجی قادری ســۆتکەو براو دەوروبەری و شــێخ ڕەوفی شــێخ عبدالله عەســکەری خۆی و پیاوەکانی، هەندێــک لەعەشــایەرەکانی دۆڵی ســورداش و لەبەری هەمەوەندیشــەوە هەندێک مابوونەوە کە من ناسیاویم نەبوو لەگەڵیاندا، کۆی هەموو ئەوانەی

مابوونەوە نەدەگەیشــتنە یەک لەچواری ئەو هێزەی ئێوارە لەوێ بوون بۆ گەیشــتن بە بەغدا. حاجی ســاڵح پیاوێکی بەساڵاچووی گوندێکی دوو سێ ماڵیــی شــۆریجە، لەپێش منــەوە لەکەڵەکە بەردێکدا بوو بەخــۆی و تفەنگە بڕنــەوە درێژەکەیەوە، ورەی دەدایە بەرم و هاواریدەکرد عەلی مەترســیت نەبێت، شــەڕت لەســەر دەکەم هەتا دەربازمان دەبێت شەو، ئەوەشمان لە یاددنەچێت سەرپەرشتی ئەم خەڵکە هەندێک کادری پارتی دەیانکردو لەکاتی هەڵهاتنی خەڵکەکە ئەوان هەر مابوونەوەو کەموکورت دەوری سەرپەرشتی خۆیان دەبینی.

هەمــوو ئەوانــەی مابووینەوە هەتــا تاریکی ئێوارە تاکــە تاکە تفەنگمان دەتەقانــد لەوەڵامــی ئــەو تۆپانــەی لەمەعەســکەری تەکیــەوە بۆمــان دەهاتــن، کــە زوربەیان تۆپی دووکەڵ بوون، ئێمە ئەوســا شــتی وەهامان نەبینیبوو، بەیانی کاتێک دابەشیانکردین، شوێنێکیان دابوو بەمن و کوڕێکی خزمــم ڕووبەڕووی مەعەســکەرەکە بــوو، نەمدەزانی کــە ڕۆژ بۆوە هەر بجووڵێمــەوە دەردەکەوین، ســەرەڕای ئــەوەش هەموو تــۆپ و گوللەکان ئەوێیــان دەگرتەوە. تەقتەقە شــاخێک کــە دەڕوانێتە ســەر ماڵەکانی تەکیە بەلای قشــڵاخدا، شــەڕی دوور دەســتیپێکرد، ئەو هێزانــەی داندرابوون و کەمیــن بوون کــە لەهەندێــک عەشــایەری دنیادیــدە پێکهاتبوون شــکان، پــاش شــەڕێکی پاڵەوانانــە، چەند کەســێکیان لــێ بەدیلگیــراو هەندێکیان شــەهیدبوون کە هــەرە ناودارو ئازاکەیان شــێخ عەبدوڵای ســەیدە، برای حاجــی شــێخ قــادرو دووەم کاکــە حەمەی تەلانــی برای کوێخا ســمایلی تــەلان و مەحمــودی حاجی شــەریفی ســردی و هەندێکیتر شــەهید بوون ناوەکانیانم لەیاد نییە.

کاتێک پاشەکشــەمان کرد حاجی ســاڵح بانگی کردو دوو ســێ گوللەی گــرداری بەتفەنگــە بڕنەوەکەی ســرەواندە ناقیلــەکان و هاواریکرد "عەلی وەرە، مەترسە" منیش تەنیا مابوومەوە، ئەو کوڕەکەی لەگەڵمدابوو، بەیانی زوو هەڵهــات، منیــش دوو تفەنگم پێ بــوو یەکێکیان هــی پیاوێکی خەڵکی گوندەکەمان بوو، ئێوارە چووبوو بۆ ســەردانی ماڵی برای لەچەمچەماڵ و تفەنگەکەی لای من دانابوو. قەمســەڵەیەکی سەربازی گەورەم پێبوو لەگەڵ نانێکی زۆرو کترییەکی گەورەو مەتارەیەکی ئاو، نەمدەویســت هیچ یەکێک لەمانــە بەجێبهێڵم، دەشترســام تا دەگەمە ســەر شــاخەکە بــەدی بکرێم و بمپێکن بەگوللە یان بە تۆپ. هەر چۆنێک بوو ورەی حاجی ســاڵح بەکێشی کردم و گەیشــتمە بن ڕازەکەی دیوی بەردەقارەمان و لەمەترســی دەرباز بووم، پاشــان دوو دوو ســێ سێ ســەنگەرمان بەجێهێشــت هەر کەسەو

بەلایەکدا، من و حاجی بەرەو ماڵی خۆمان. ئەو سەردەمە توتنمان کردبوو لەنێوانی گوندی هەیدەر بەگ و گۆپتەپە بەناوی نارنج کوژراو، بەپشتی ئاغجەلەردا ڕۆیشتین و بەیانی دنیاڕۆشن خۆمان کردە ناو ماڵانی داڵەوای سەروو. خەڵکی گوندەکە مەترسییان لێنیشتبوو ڕژێم هێرشیان بۆ بهێنێت، بۆیە هەموو چاڵیان هەڵکەندبوو بۆ شاردنەوەی گەنم و دانەوێڵەکانیان و کەلوپەلی زیادەیان، سڵاومان کرد، دەمانویست نانێک بخۆین ئەوسا بڕۆین. ڕۆژی دووەم بوو، فڕۆکە بۆ پشکنین دەسووڕایەوە، خەڵکی ناوچەکە ترس لێیان میوان بوو، هەر یەکە بەدوای چارەسەرێکی ماڵ و حاڵەکەیدا دەگەڕا ئەگەر دوژمن هێرشی بۆ هێنان، خەڵکەکە فەرموویان کردین، چووینە ماڵێک نان و چایەکمان خوارد، ئێمە چەند بەپەلە بووین ئەوانیش لەئێمە بەپەلەتر بوون بۆئەوەی ئێمە بەڕێ بکەن و بکەونە ماڵ شاردنەوە.

وردەوردەو بەوشیاری بەرەو نارنج کوژراو ڕۆیشتین، لەڕێ لەگەڵ حاجی لێکجیابووینەوە، من بۆ هەواری تووتنان و ئەویش بۆ شۆڕیجە.

کاتێک چوومە سەر زەرعاتەکە کەسێکی ئێمە لەوێ نەبوون، هەمووی بەبۆنەی شکانی ئێمەوە چووبوونەوە ناو گوندەکەمان، منیش بەرەو گوند بەو ماندوویەتییە هەنگاوەکانم خێراتر کرد، کاتێک گەیشتمە بەرماڵان، تووشی دوو سێ پیاوی لای خۆمان بووم زۆریان لا سەیر بوو کە منیان بینی وتیان: "دوێنێ ئەوانەی خۆمان هاتنەوە وتیان بە بەرچاومانەوە عەلی تۆپ لێیداو کوژرا، ئێستا براکانت هەر لەهەواڵ پرسیندان" هەر چۆنێک بوو چوومەوە ماڵەوەو بەیەکتری شاد بووینەوە، ئەو جارەیان نەکوژرا بووین.

دوابەدوای ئەوەی خەڵکی لەدەربەند سەرکەوتوو نەبوون، بەوە ڕژێمی قاسم زیاتر هاربوو، دەوری دیکتاتۆریەتی خۆی دەستپێکردو مەسەلەی داواو یاداشتی کوردی خستە پشتگوێ و دەستیکرد بەڕاونانی کەسانی کوردپەروەرو بیانووگرتن بەخەڵکی کورد.

لەملاشەوە پارتی و سەرکردایەتی سیاسی کورد کەوتنە مقۆمقۆی ئەوەی بەرگری بکەن یان پاشەکشە بکەن، دیکتاتۆریەتی قاسم زیاتر بواری ئەوەی دەخوڵقاند بڕیاری بەرگری بدرێت، ئەوەبوو یەکەم کۆبوونەوەی ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتی لەعەودەڵان ئەنجامدراو بڕیاری دروستکردنی دەستەی چەکداری درا. من ئەو کاتە هۆشی سیاسیم کزو نزم بوو، لەمەسەلەکان نەدەگەیشتم، هەر بۆیەش نەمدەزانی شۆڕش یانی چی و دەبێت کەی دەستپێبکات و مەرجەکانی دەستپێکردنی چیین و مەرجەکانی سەرکەوتنی

کامانەن و ئەو شۆڕشەی ئێمە لەکام جۆرە شۆڕشەیە، چەکدارییە؟ یان بێ چەکە؟ لە کام ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتیدایەو دژی کێیەو کێ دۆست و پشـتیوانیەتی و هێزی بنچینەی کامەیەو بەرنامەی بەڕێوەبردنی و دوورو نزیکـی شۆڕشـەکە کامانەن و هێـزی ئێمە لەگەڵ ئەو هێـزەی دەجەنگێت هاوسەنگی چۆنەو چەند دەتوانرێت ڕووبەڕووی بووەستین؟ هەرچەند ئەمانەم نەدەزانی، بەڵام پاک و دڵسۆزو خوێنگەرم بووم، ئارەزووی تێگەیشتنی بارە ئاڵۆزەکەم دەکرد، پاش گەڕانەوەم لەو شەڕە دۆڕاوە نابەرامبەرەی دەربەند، جارێکیتر دەستمکردەوە بەکارو کاسبی جوتیارانە. باوکیشم لەکار کەوتبوو، کابانێکی واشـمان نەبوو تۆزێک چێژی لێوەربگرین، ئەو کارەی دەشمانکرد بریتیبوو لەدارهێنان و سـەپانی و توتنەوانی، چونکە خۆمان پارەمان نەبوو، خـاوەن زەوی زەویەکەی بۆ دەکێڵاین و تـۆوی دەداینیو هەندێک خەرجی تێدا دەکرد، لەهاویناو لەسەرەوەختی کۆکردنەوەی بەروبوومدا لەدوو سێ بەش بەشێکیمان پێدەبڕا، ئێمەش بەو بەشە ژیانێکی مەمرەومەژیمان دەبردە سەر.

## بووم بەپێشمەرگە

لـەو جارانــەی دەچــووم بـۆ دارهێنــان لەنــاو چەمــی ڕەزان لەکاتی هاموشــۆمدا دانەدانە چەکدارم دەبینی، ئەوسا ناویان (کۆمەڵە) بوو، هێشتا ناوی پێشــمەرگە دانەبڕابوو بەسەریاندا. مەترســی زۆریان هەبوو لەوەی دوژمــن پێیان بزانێت لەو ناوەن و بدات بەســەریانداو تووشــی زیان ببن، لەبەر ئەوەی زۆربەیان بێ چەک بوون.

زۆرجار خۆیان لادەداو دەیانویست نەیانناسم و شوێن و ڕێیان نەزانم، جارێکیــان وەهــا ڕێکەوت دوانیان هاتنە لام و داوایانکرد کە هەندێک ئاردو هەندێک شەکرو چایان بۆ بکڕم لەگەڵ دوو جووت پێڵاو، بەڵام ئاگاداریانکردم بەهیچ شــێوەیەک ناویان نەبەم. پارەشــیان دامێ بۆ کڕینی پێویســتییەکان، وتیــان: "بەرگوێمــان بکەویتەوە لەناو خەڵکدا باســتکردووین بۆ خۆت چاک نییە" ئەم قســەیەم زۆر لاسەیربوو، بۆچی دەبێت من ناویان نەبەم؟! پاشان ئــەوان بۆ هەڕەشــەم لێدەکەن؟ زۆر لەدڵمدا گرێ بــوو، بەڵام لەبەرئەوەی دۆســتایەتییەکەمان نوێبوو، هەروەها بەهــۆی ئەو ئارەزووە دێرینەی هەم بــوو بــۆ تێکەڵاوبوونم بەکۆڕو کۆمەڵی سیاســی، پشــتگوێم خســت و بۆ ســبەی شــتەکانم کڕی. بەیانی لەڕۆژان زووتر، پێشئەوەی خەڵکیتر بەڕێ بکەون، من گوندم بەجێهێشت و ڕوو لەچەم ڕۆیشتم تا شوێنی دیاریکراو، لــەوێ کەلوپەلەکانــم داناو دەســتمکرد بەداربڕین، هێشــتا بــارە دارەکەم تــەواو نەکردبوو، یەکێکیان هاتە لام و پاش چاکوچۆنی وتی: "ئەشــیاکانت هێناوە؟" وتم: "بەڵێ" و شــتەکانم دایەو ڕۆیشــت، بەڵام ئاگام لێبوو خۆی دەشــاردەوە بۆئــەوەی من نەزانم بۆ کوێ دەچێــت، تۆزێک دوورکەوتەوە برادەرەکەیتریشی گەیشتە لای و بەیەکەوە ئەشیاکانیان بردو ڕۆیشتن.

چەند جاریتر ناو بەناو دەهاتنە سەر ڕێگام و فەرمانیان دەدامێ، منیش ئەوەندەی دەکرا بۆم هەڵدەســوڕاندن، تا دەهات خۆشــم زیاتر ئارەزووی ئــەو جۆرە ژیانەم دەکرد، بەڕاســتی لام شــتێکی جــوان و خۆش بوو لەو شــاخ و چۆڵانــەدا بەچەکەوەو ئازایانــە دەهاتن و دەچــوون، من خولیای ئەوەیــان بــووم زیاتر پێموابوو ئەگەر مرۆڤ ئــازاد نەبێت ناتوانێت کەڵکی هەبێت بۆ خۆشی چجای کۆمەڵگا.

وردەوردە خولیــای شــاخ و نــاو (کۆمەڵــە) کەوتــە ســەرم، زووزوو دەچووم بۆ چەم و خۆم لەگەڕانەوە دوادەخست بۆئەوەی هاوڕێکانم ببینم، تــا جارێکیــان پێم بەجەرگمدا ناو لێمپرســین: "ئەگەر منیــش بێم بۆ لاتان چەک هەڵگرم دەڵێن چی؟ چەکم دەدەنێو دەمکەن بە (کۆمەڵە)؟" لەوەلامدا

هانیان دەدام نەبم بەچەکدار، بەڵکو پەیوەندی سیاسیان لەگەڵ بکەم و کاری نهێنییــان بۆ ئەنجامبــدەم، وەڵامەکانیانم بەدڵ نەبوو، تا ڕۆژی ١٩٦٢/٣/٣ پەتی ئارەزووم پساندو چوومەوە ئەشکەوتە دوو کون، ئەوساکە وردەوردە دەرکەوتبوون، دەزاندرا لەو ئەشکەوتە دەژین و لەگوندەکاندا شەوان خەڵکیان کۆدەکردەوەو خۆیان ئاشــنادەکرد بەخەڵکی و لەســەر دیکتاتۆریەتی قاسم قسەیان دەکرد.

ژمــارەی ئەو پێشــمەرگانەی لەوێبوون بەچەکدارو بــێ چەکەوە خۆی دەدا لەبیست کەس و باشترین چەکیان تفەنگێکی پانزەتیری دەستی شەهید حەســەن کەوەڵــەو تفەنگێکی ئوردونی دەســتی ئەحمەد عەبــدوڵا کەڵوڕی بوو.

پــاش ســڵاو و ماندوونەبوونی، کەمێک پشــووم دا، لەکوپێکی چینکۆی زەرددا چایەکیان دامێ، هەموو دەمی سوتاندم، وتیان: "خێرە وا هاتوویت؟"، وتم: "دەمەوێت ببم بەکۆمەڵە لەگەڵتان" بەزەردەخەنەوە وتیان: "ئەمەی تۆ دەیڵێی بۆ تۆ جارێ ماویەتی، چونکە ئەم کارەی ئێمە پێیهەڵدەستین ئەرکێکی زۆر قورســەو بەتــۆ جێبەجێ ناکرێــت، چونکە کارێکــی دژوارەو لەوانەیە چەندین ســاڵ لەســەر یەک بخایەنێت و مرۆڤ دووچاری گیران، کوژران، زامــداری، برســێتی دەبێت. باشــتروایە بڕۆیتەوە ماڵەوەو لــەکاری نهێنیدا لەگەڵمان کاربکەیت، ئەویش بەشێکە لەخزمەتی شۆڕش و شۆڕشگێڕێتی.

قســەکانیانم زۆر بەدڵ نەبوو، هەرچی ئەوان دەیانوت من نەمدەبیست و هەر بەزۆری زۆرداری پێمداگرت و وتم: "هەرچی پێم بکرێت دەیکەم، بەڵام ڕۆیشــتنەوە مومکین نییە". کە زانیان ســوورم لەسەر ڕاو بۆچوونی خۆم، وتیان: "باشە بەڵام دەبێت هەرچی پێمان وتی ئەنجامی بدەیت" وتم: "بەڵێ"، لێم گەڕان و وەکو بەردەستێک لایان مامەوە.

ماوەیەکــی زۆر لــەو چەم و چۆڵ و چڕەی چەمــی ڕەزاندا بەبێ چەک مامــەوە، چــام لێدەنا، نانم دەبرژاند، چیلکــەو دارم دەهێنا، بەڕۆژ بێ چەک ئێشــکیان پێدەگرتــم. ئەوســا تەمەنــم خۆی دەدا لــە ١٤-١٦ ســاڵ، لەناو ئەشــکەوتی دوو کوندا هەندێک زەل و حەســیرو پووشــوپەڵاش و گەڵای وەریــوی دار، لەجیاتــی ڕاخەر ڕاخرابوو، شــەوان لەســەری دەخەوتین و دەرگای ئەشــکەوتەکە بەکەڵەکە بەرد هەڵچنرابوو بۆ ئەوەی سەرما کەمتر خۆی پێدا بکات.

ئەو سەردەمە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر ماست و دۆو نان و پێویستی چاکیان بۆ دەهێنایین، وردەوردە خۆشەویست دەبووین، چونکە کادرەکانی ئەو سەردەمە وتووریاو قسەزانبوون، لەمزگەوتەکاندا دوو سێ سەعات باسی مەغدوری کوردیان دەگێڕایەوەو فرمێسکیان لەچاوی جوتیاران دەهێنا، بەڕاستی بۆ ڕاپەڕاندنی خەڵکی توانایەکی هونەری سیاسی چاکیان هەبوو، ئەوسا هەرچەندە شۆڕش ساوا بوو، لاواز بوو، بەڵام شۆڕشگێڕان بەبڕوابوون، دڵخۆشبوون، براو تەبا بوون، خاوەنی دیسپلینی بەهێزبوون، هەر بڕیارێکی سەرەوە دەدەرچوو، گورج جێبەجێ دەکراو کەس سەرپێچی لێ نەدەکرد.

وردەوردە دەچووینە ناو گوندەکان و خۆمان نیشانی خەڵکی دەدا، چەکەکانمان هەرە باشەکانیان ئەوانە بوون تۆزێک گوللەی دەهێشتەوە، وەکو وتم: دوو تفەنگی ناوداری تێدابوو کە دوو سەربازی ڕاکردوو هێنابوویانن، ئەو دوو تفەنگە ببوون بە بووکی ناو چەکەکان و هەموو هاوڕێکانیان هەناسەیان بۆ سەرو چەکی ئاوا نوێ هەڵدەکێشا، شتێکی سەیرو دڵخۆشکەر بوون، پێشمەرگەکان دڵسۆزو ڕاست و پاکبوون.

ڕۆژ لەڕۆژ زیاتر خەڵکی بەشۆڕش ئاشناتر دەبوون و لەدەوری کۆدەبونەوەو شالاوی دڕندانەی ڕژێمی قاسم هاوکاری گەشەکردنی دەدا، گرتن و ڕاونانی خەڵکی شارەکان ببوو بەهۆی ئەوەی کورە شارییەکی زۆر ڕوو بکەنە بنکەی چەمی ڕەزان.

شۆڕش ڕوو لەگەشەکردن بوو، سەرەتا لەدۆڵی خەربەندەلوو لەیەک ئۆتۆمبێلی پۆلیس درا، ئەوەش سام و هەیبەتی بۆ کۆمەڵەکان پەیداکرد، لەپڕێکداو بەنەخشە هەندێک پۆلیس بەچەکەکانیانەوە ڕوویانکردە ناو شۆڕش، هەر لەو کاتەداو لەیەک نەخشەدا هێزێکی ڕێکخراو نێردرایە دەوروبەری مەرکەزی ناوچەی ئاغجەلەر کە مەرکەزی پۆلیس لەهەندێک لەو گوندانەی لەناوچە شاخاوییەکە بوون، ئابڵۆقە دران و داوای خۆبەدەستەوەدانیان لێکرا، لەهەندێکیاندا بەرگرییان کردو هەندێکیشیان بێ ماندووبوون خۆیان و چەکەکانیان هاتنە پاڵ شۆڕش و بوون بەکۆمەڵە.

تا دەهات پۆلیس ژمارەی لەناو شۆڕشدا زۆر دەبوو، هەندێک لەو پۆلیسانە پلەی سوپایان هەبوو، هەر کە دەهاتنە ناو شۆڕش دەکران بەلێپرسراوی ئەو پۆلیسانەو وردەوردە دەبوون بەلێپرسراوی گەورە لەلق و بەتالیۆنەکاندا، وردەوردە ئەفسەری سوپاش لێیان هاتنە دەرێ و ئەوانیش دەوری مەکتەبی عەسکەری و لێپرسراوی هێزە کۆماندۆکانیان دەبینی.

بەبەشداری و گێرانی پۆلیس و هاتنی ئەفسەرو سەرباز بۆ ناو شۆڕش، چەندین جۆر چەکی سووک پەیدا بوو، هێزەکان ڕێکخران و کۆمەڵە ناوی گۆڕاو بوو بە"پێشمەرگە"و (پ.م). دەستەو پەل و لق و بەتالیۆن و هێز پەیدابوون و ناوچەکانی بەفراوانی گرتەوەو هێزەکان لەم سەرەوە بۆ هاوکاری ئەو سەر دەڕۆیشتن.

ساڵانەو لەسەری بەروبووم کۆکردنەوەدا شۆڕش لەگوندەکان خەرمان لۆغەی دەسەند، لەهەموو دانەویڵەدارێک و لەئاژەڵدارەکانیش خێری ساڵانەی وەردەگرت بۆئەوەی بەسەر بنکەی پێشمەرگەدا دابەش بکرێت، پێشمەرگە ناوێکی نوێ بوو، لای خەڵکی زۆر خۆشەویست و پیرۆز بوو، لەلای دوژمنیش زۆر سامدار بوو.

لەڕێگای تەنزیمی شارو لادێکانەوە هەواڵی جموجوڵی دوژمن بەڕێکوپێکی دەگەیی پێش ئەوەی کارەکەی ئەنجام دابێت.

دەستەو پەل و لقەکان کەوتنە جەولەی ناوچەو گوندو ماڵ بەماڵ دەچوون و یاسای دابەشکردنی پێشمەرگە بۆ نانخواردن لەماڵاندا داهات. لەڕێی دانانی جوتیارێک یان چەند جوتیارێکی خەڵکی گوندەکە بۆئەوەی هەر کۆمەڵە پێشمەرگەیەک چووە هەر گوندێک داوا لەو بکەن دایان بمەزرێنن و نەهێڵن پێشمەرگە لەپاڵ مزگەوتەکاندا بێ شێو سەربنێتەوە.

کادری ڕێکخراوی سیاسی ناوچە بەناوچە دابەشکران و هەر کادرێک بەرپرسیار بوو لەکاری ڕێکخستن و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر جموجۆڵی دوژمن و سیخوڕەکانی، هەروەها دەوری وشیاری و ڕێکخستنی جوتیارانیان دەبینی و دەنگوباسی چالاکی هێزی پێشمەرگەیان دەگەیاند بەجەماوەری ناوچەکەیان.

لەگەرمەی ئەم ڕووداوانەدا، من پێشمەرگەیەکی بێ چەک بووم لەچەمی ڕێزان و لەو بوارەدا خەریکی خۆ باشتر خوێندەوارکردن و فێری لەبەرکردنی ڕستەی ڕامیاری و چۆنێتی قسەکردنی سیاسی دەبووم.

لەو کاتانەدا کادرو سەرکردەکان لەبابەت درێژەدانی شۆڕش و ئابڵوقەی ئابوورییەوە دەدوان، لای هەندێک خەڵک وەها بوو لەماوەی دوو سێ ساڵدا شۆڕش دەگاتە بەرهەم و مافی خەڵکی کورد وەردەگیرێت، لای هەندێکیتر وەهابوو دوورنییە شۆڕشەکە درێژە بخایەنێت و لەپێنج ساڵ زیاتریش و لەهیچ دەروازەیەکەوە ئازووقە نەگات، نموونەیان بۆ شۆڕشگێڕانی گەلی جەزائیر دەهێنایەوە کە ڕیخۆڵەی وشکەوەبووی ئاژەڵیان خواردووە،

هەندێـک کـە گوێی لەم گفتوگۆیە بوایە هەرەسـی دەهێناو دەیوت: "ئێمە تا پێنج ساڵیتر ئاوا بەشاخەوە دەژین؟"

ئـەو سـەردەمە پێشـمەرگە یارمەتـی پێـدەدرا، هەرکـەس دەبـوو بەپێشـمەرگە، دەبوو ئـەوە بزانێت یارمەتی مادی نییە، هەندێکجار لەسـێ چـوار مانگدا (٥) دینار دەدرا بەهەندێـک لەخێزاندارەکانی باری ئابووریان زۆر نـزم بـوو، من ئەوسـا جـار هەبووە بەشـەش مانگیش پەنجا فلسـم سـەرف نەکردووەو نەشم بوو، بۆیە ڕاهاتبووم دەست نەکەم بەگیرفانمدا. پێـڵاو و بەرگـە بۆرەکە لەبنکە دەیاندامیو خواردنیـش لەبنکە یان لەماڵان دەمانخوارد.

ئەوسـا کـە هەر لەبنکـە بـووم زۆرم حەزدەکـرد ڕێگەم بـدەن بچمە دەسـتەیەک و جەولـە بکەم لەنـاو گوندەکان و ناوچـەکان، چونکە ئەوەی لەجەولە بوایە لەژیانێکی دەروونی خۆشـدا دەژیاو بەڕاستی هەر ئەوانیش بەپێشمەرگە دەژمێردران.

هێشتا (٣٠) هەزار دینارەکەی ڕێگای هەولێر- کۆیە نەکەوتبووە دەست شـۆڕش، بنکەکانیش و سـەرکردایەتیش خاوەنی دەرامەتێکی مادی ئەوتۆ نەبوون، بەڵام کاتێک ئەو پارەیە گیرا جگە لەوەی بوو بەهۆی بەرزکردنەوەی ورەی خەڵکی و دەرامەتێکی کاتیی چاکیش بوو بۆ شۆڕش، هەندێک پینەو پەڕۆی باری ئابووری شۆڕشی پێکرا.

شۆڕش ڕوو لەگەشە دەڕۆیشت، هێزێکی پەنجا شەست چەکداری کە بۆ ئەوسا زۆر بوو لەناوچەی بێتواتەوە هاتبوون بۆ چەمی ڕەزان، هاتنی هێزەکە جێگای سـەرنج بوو، هەموو ئەوانەی لەچەم بووین هەسـتماندەکرد شتێک بەدەستەوەیە، بەڵام ڕێک نەماندەزانی چییە، زۆرم گوێ هەڵخست نەمزانی، پاشان برادەرێکی نزیک لەلێپرسراوان پێیوتم: "ئەمشەو بەڕێدەکەوین بەرەو دۆڵـی ئاغجەلـەر بەنیازی دەورگرتنی شـاری ئاغجەلـەرو گرتنی"، لەگەڵ غەریب سەعید کە هاوڕێو هاوتەمەن و هاوگوندی بووین کەوتینە کۆششی ئەوەی بمانبەن لەگەڵ خۆیان، کاتێک هێزەکە عەسـرێکی درەنگ کەوتەڕێ هەرچی ئێمە کردمان بەرپرسـیاری چەم و هی هێزەکەش ڕێگەیان نەداین، وتیان: "ئێوە منداڵن و تەمەنتان ناگونجێت، دەبێت لێرە لەبنکە خزمەت بکەن، لەکاتێکـدا شـەهیدو بریندارمان هێنایەوە ئێوە بەردەسـتییان بکەن" هەوڵی زۆرمانـدا پێمانوتـن: "نان، ئاو، کۆڵە پشـت، گوللەی (ئار بـی جی) قازیفە، فیشـەکی زیـادە هەڵدەگرین بەس بمـان بەن"، هەرچی ئێمـە وتمان ئەوان گوێیان لێ نەگرتین و دەسـتمانکرد بەگریان کاتێـک دڵنیا بووین نامانبەن،

ئەوان ڕۆیشتن من و غەریب بەجووت بەدوایاندا ڕۆیشتین بۆ بەشداری و لەشەڕەکەشدا دەوری خۆمان بینی.

وردەوردە خەڵکی دەگەیشتە ئەو بڕوایەی ئەمەی ئێستا بەرپابووە شۆڕشە نەک کۆمەڵە چەکدارێکی بێ بەرنامە دەست بکات بەڕێگرتن و شەڕو کوشتوکوشتار.

ورەو پەروەردەی شۆڕشگێڕێتی و دڵسۆزی و پورەدانی هەنگئاسای جەماوەری وەهای کردبوو کە هەموو تێکۆشەرێکی چەکداری پێشمەرگە ئارەزووی لەشەهیدبوون بکردایە، پێشمەرگە ئەوەندە بەدڵسۆزی کاریدەکردو ئەوەی سڵی لێنەدەکردایەتەوە شەهیدبوون بوو، بەڵکو ئاواتیان دەخواست شەهیدبن و بنکەیەکیان بەناوەوە ناو بنرێت، تازە پێشمەرگەیەکی مۆرد خوادەی سەروو شەهید ببوو، ناوی صدیق بوو، بنکەی خاڵخاڵان لەکارێزە بەوە ناوی نرا بنکەی شەهید صدیق، پێشمەرگە زۆریان لا پیرۆز بوو شەهیدبن.

خەڵکی گوندەکانیش وەها هاتبوونە جۆشوخرۆش، کێ دەیوێرا لەگوندێکەوە بۆ گوندێکیتر بێ پسوولەی هاموشۆ بڕوات، خێرا لەلایەن لێپرسراوی گوندەوە دەگیراو بەدوو سێ جوتیاردا دەنێردرا بۆ نزیکترین بنکەی پێشمەرگە.

ئەوسا تەمەن و شکڵی من هی ئەوە نەبوو بڕوام پێبکەن کە بۆ بەشداری شەڕ دەشێم، چونکە لەپێشووتر وەها هاتبوو شەڕ بەسمێڵی گەورەو قەدو باڵای بەرزو زمانی درێژو زەبەلاح دەبێت، نەک بە بڕواو مێشک.

زۆر هەوڵم دا لەو حەوزەی چەمی ڕەزان دەرباز ببم و بڕۆم، ڕێگایان نەدام و نەشدەکرا سەربەخۆ بڕۆم، چونکە ئەو سەردەمە لێپرسینەوە هەبوو، زەبت و ڕەبت ئەوەندە توند بوو یەکێک هەڵەیەکی بکردایە وەهایان لێدەکرد جارێکیتر نەچێتەوە سەر هەڵەکردن.

ڕۆژگار بەو جۆرە گوزەرا تا هەلێکم بۆ هاتە پێش، لەو کاتانەدا هێزەکانی لۆلان و دەوروبەری دژی بنەماڵەی بارزانییەکان بوون و ناکۆکیەکانیان زۆر توند ببوو، کاک عومەر دەبابەی ڕەحمەتی لێپرسراوی ناوچەی بێتواتە بوو دانرابوو هێز بەرێت و بڕوات بۆ ئەو ناوچەیەی گرتک و حەسارۆست بۆ هاوکاری بارزانییەکان، من خرامە ناو ئەو (٤٠) پێشمەرگەیەی بەڕێکران بۆ ئەو ناوچەیەو تفەنگێکی نهایەت جاندارو هەندێک فیشەکی ئینگلیزییان دامێ، کە دەبوو بە بڕیەند دواکەی بڕنم بۆ

ئەوەی لەجیاتی فیشەکی خۆی بەکاربیهێنم، بەڕاستی هەرچیم کرد بۆم خۆش نەدەکرا.

لەکاتێکدا کە ئێمە لەچەم بەڕێکەوتین مانگی چوار بوو، هەوا بەرەو گەرمی دەڕۆیشت، بۆیە هیچ حیسابی ئەوەمان نەکردبوو کە ناوچەی باڵەکایەتی و دەوروبەری حەسارۆست سارده، بەکراسێکەوە ڕۆیشتین، گەیشتینە بێتواتە، پاشان لەوێوە بەرەو ناوچەی باڵەکایەتی بەڕێکەوتین، چووینە گوندی گوڵان، پاشان بۆ گرتک و ڕۆستی. پێشمەرگەکان بەلاشانی پشتی گوڵان و حەسارۆستدا دابەشبوون. شەوان زۆر سارد بوو، باش لەیادم ماوە مانگی حەوت بوو لەڕۆژی (١٩٦٢/٧/١٤) لەگەڵ ئەوەی شەڕێکی گەرم بوو بەڵام هەموو سەرما کەسیرەی کردبووین. زۆرمان دووچاری نەخۆشی سکچوون ببووین. لەو کاتەدا نەخۆشخانەیەکی گەڕۆکی شۆڕش لەگوندی گوڵان دانرابوو بۆ سارێژکردنی برینی زامدارانی جەنگەکە، وردەوردە نەخۆشەکان دەبرانە ئەوێ. ئەو تاعونە منیشی گرتەوەو بردمیان بۆ ئەوێو چەند ڕۆژێک لەوێ بووم. ئێوارەیەک فەرماندەی کەرتەکەم لەگەڵ سەردەستەکەم و هەندێک پێشمەرگەیتر هاتن و وتیان: بابڕۆین، لێمپرسین: "بۆ کوێ؟" وتیان: "بڕیارمان وەرگرتووە دەگەڕێینەوە، ئێستا شۆڕش لەوێ چاک گەشەیکردووەو پێویستییان پێمانە"، من ئاگام لەوە نەبوو بێپرس شوێنەکەیان بەجێهێشتووەو هاتوونەوە. کەوتینەڕێ، بەچەند ڕۆژێک گەیشتینە گوندی گرێتەپەی مامەی عەبدوڵڵا لەسەر زێیەکەو لەڕەندی خاندا سەوزەواتێکی زۆر کرابوو، پێشمەرگەیەکی زۆر بەبازنەیی دانیشتبوون و مام جەلال قسەی بۆ دەکردن. دیمەنێکی زۆر دڵخۆشکەرانەی هەبوو، خۆمانکرد بەناو کۆبوونەوەکەدا، مام جەلال بەهاری هێنابووە ئەژنۆ، لەپاش تەواوبوونی کۆبوونەوەکە کوێخا شەریفی سەیدان و مەلا صدیقی تلیان و حاجی محەمەد داڵەوا چوونە لای مام جەلال و بۆیان گێڕایەوە کە هاتوونەتەوە، ئیجازەی دابوونێو هەرچی فیشەکی کەم ببوو بۆی بژاردبوو، من و مەجیدی مرە شەکرخۆری کانی بی ڕوتەڵە بووین، ئەو چووەوە کانی بی و منیش بۆ عەسکەر، لەوێ نەمامەوە، چووم بۆ شێخانی سوورقاوشان، ڕۆژی دوایی پێشمەرگەیەک هات و وتی: مام جەلال دەڵێت بەپەلە بگەڕێتەوە چەم، منیش مام جەلالم چاک نەدەناسی، شارەزای جۆری تووڕەبوونی نەبووم کە لەکاتێکدا لەگەڵ یەکێک تووڕە دەبێت و بیلبیلەی چاوی دەسووڕێو ڕوو دەکاتە یەکێکیتر پێدەکەنێ. بە تەتەرەکەم وت: تۆ بڕۆ سبەی خۆم دێم، هەر ئەو ڕۆژە شەو دوو سێ پێشمەرگەیتر هاتن و وتیان: یان ئێستا پێشمان دەکەویت یان چەکەکەت دەبەین، تووڕە بووم و چەکەکەم دانێ.

سبەی زوو پێشمەرگەیەکیتر هات و وتی: لەچەم داواتدەکەن، نەمدەتوانی نەچـم ناچـار پێش پێشـمەرگەکە کەوتم و چووم بۆ چـەم، کاتێک چوومە بافڵەکە هەوایەکی خۆش لەتاقگەی ئاوی جۆگای پشت بافڵەکەوە بەردەبووەو بارودۆخێکی دروسـتکردبوو لەهەوای ئێرکۆندێشن خۆشتر بوو، مەنجەڵی زلەزلە لەگۆشـتی گا لەسەر ئاگر بوو، مام جەلال بەخێرایی دەهاتودەچوو، لەنێوانی ڕیزە پێشمەرگە دانیشتووەکانی ئەم بەروبەری سەکۆکانی بافڵەکە قسەی دەکرد، سڵاومان کرد، پێشمەرگەکە وتی: "شێخان "بۆ نەهاتووی بۆ ئێرە یەکسەر؟" وتم: "مەسئولەکانمان لەگۆپتەپە لەگەڵ بەڕێزت قسەیانکردووە و من ئیجازەم لەوان وەرگرتووە بۆ یەک هەفتە" وتی: "ئەی بۆچی لەناوچەی بادینـان گەڕایتـەوە؟" نەمدەزانی زمان لووسـانەو بەفێـڵ جوابی بدەمەوە پێموابوو مەسئولەکان نەیانوێراوە باسی ڕاستی ڕووداوەکە بکەن بۆیە وتم: "زۆرمان سەرما بوو" تووڕەتر بوو، منیش وامدەزانی بەزەیی پێمان دێتەوە وتم: "کاتێک ئێمە ڕۆیشتین سەرو کراسمان لەبەر بوو لەوێش کەس هیچی بـۆ نەکردین، پێڵاومان نەبـوو، جلوبەرگمان نەبوو، سـەربەرگمان نەبوو" نەیهێشـت قسـەکەم تەواو بکەم چاوەکانی کەوتنە فڕین و نەڕاندی: "بڕۆن زیندانـی بکەن و هەتا من لێرەم هەر کەسـێک بـەری بدات ئەویش زیندانی دەکەم"، خێرا وەکو تاوانبار ڕەفتار کرام، خرامە ئەشـکەوتێکەوە پڕی بوو لەسیخوڕو جاش و خەڵکی خراپ، ئێوارە بوو لێپرسراوەکەیان تەنەکەیەکی دایەدەسـتم لەڕووبارەکە ئاو بهێنـم، زۆرم پێ ناخۆش بوو، تووڕەبووم و وتم: "مومکین نییە ئاو بهێنم" باش بوو پێشمەرگەیەکی هاوڕێی کۆنم لەوێ بوو لەسەری کردمەوەو ئاویان پێ نەهێنام.

ئەسپێ تینی بۆ هێنام، داوامکرد لەگۆشەکانم دانێن کە کەمێک دوور بم لەزیندانییەکانیتر، ئەویش برادەرێکم هاوکاریکردم و لەپەنایەکی زیندانەکەوە جێگیربووم، زۆر دڵم سەغڵەت بوو، کەسێک نەبوو لەسەرم هەڵبداتێ.

لـەو ڕۆژانەدا پۆلیسـەکانی دوکان هەموویان بەچەکەوە هاتن و خۆیان دابەدەسـت شۆڕشەوەو چەکی زۆریان هێنابوو، خۆشـی و سەرکەوتنێکی چاکبوو، ئەو ڕۆژە ٥٩ ڕۆژ بوو من لەو ئەشـکەوتەدا ئەسـپێم دەکوشـت، شەو چەم بوو بە چەپڵەڕێزان و تەقەی خۆشی، منیش بە کوێرە خەتەکەی خۆم نامەیەکم نوسـی بۆ مام جەلال و داوامکرد بەو بۆنەیەوە لێمببورن و لـەم زیندانە ئازادم بکەن، بـاش بوو نامەکەم گرتی و ئازادیان کردم. بەڵام غەزەبی مام جەلال هەر لەسەرم بوو، کە زانی لەئەشکەوتێکی بچکۆلەدا شتم دەنووسـی، وتی: "هەتا من لەم هێزەبم نابێت تۆ چەک بگری بەدەسـتەوە" منیش لەدڵی خۆمدا بەڵێنمدا هەر دەبێت ئەو بڕیارەت پێ بشکێنم.

ماوەیەکی چاک لەچەم لەئیدارە دانرام بۆ بەردەستی، هەموو کارێکیان پێدەکـردم، ماوەیەک دەیان ناردم نامە ببەم بـۆ هێزی بێتواتە، بەبێ چەک بەڕۆژێک دەچوومە بێتواتەو لەوێشەوە بەڕۆژێک دەهاتمەوە.

ماوەیەک باراشـیان پێدادەناردم بۆ ئاش لەسورقاوشان هەتا جارێکیان لەگونـدی عەسـکەر بەندییەکیان دامێ لەگـەڵ برادەرێکی تـردا بیگەیەنینە چەم، شـەو بردمانە ئاشـەکەی شـێخان لەوێ تا بەیانی ئێشـکمان لێگرت، ئاخری لەدەسـتمان ڕایکرد، چونکە ئێمە بێ چەک بووین و لەکاتی ئێشـکی هاوڕێکەمـدا فێڵی لێکردبـوو، وتبووی دەچمە سـەرئاو، کاتێک نەهاتبووەوە منی لەخەو هەڵسـاند، ڕامانکرد، نەیگەیشتینێ و خۆی کرد بەمەخفەرەکەی قەشـقۆڵیدا، لەسـەر ئەوەش هەندێک لۆمە کراین، بـەڵام من بەڵگەم هەبوو چونکە لەسەرەی ئێشکی مندا نەڕۆیشتبوو.

ئەوسـا پەلێکـی ئیـدارە لەعەسـکەر هەبوو، ئـەو ئەرکـی کۆکردنەوەو پارێزگاری ئەو دەغڵودانەبوو لەسـەر فەرمانی جوتیاران کۆدەکرایەوە. هەر کاتێـک ئارد بۆ چەم پێویسـت بوایە چەند بارێک گەنم دەنێـردراو دەبرا بۆ چەم. ماوەیەک دایان نام لەو بەشە کارمدەکرد، سەرەتا باراشهاڕین پاشان کـرام بەسەردەسـتە، دوایی کـرام بـەکادری کۆکردنـەوەی گەنم و جۆو ڕەوانەکردنـی بەسـەیارە بۆ عەسـکەر. هەر بەتەنیا دەگـەڕام، چونکە هەر دێیەک چەند کەسێک بەرپرسیاری کۆکردنەوەی بوو لەو گوندە چاڵ دەکرا هەتا من دەچووم بەلیست وەرمدەگرت و دەمنارد بۆ سەرووی خۆم.

بەهـۆی ئەم کارەمەوە دۆسـت و ناسـیاوێکی زۆرم لەنـاو جوتیاراندا پەیداکرد لەناوچەکانی شوان، شێخ بزینی و قەڵاسێووکە.

لەکاتێکـدا دەگـەڕام ئەسـپێکیان دابووپێـم بۆئەوەی فریـای کارەکەم بکـەوم، یەکەمجـار بـوو شـەڕێکی زۆر گـەورەی ڕووبـەڕوو لەنێوانی سـوپای عێراق و هێزی پێشـمەرگە بەو بەربڵاوییە ڕوویدات و منیش تێیدا بەشدار بم، کە پانتاییەکەی لەدەربەندی بازیانەوە بەرەو ئاغجەلەربو، چەند شەو و چەند ڕۆژی خایاند، سەربازێکی زۆر بەشداربوون، دەبابەو فڕۆکەش هاوکاریدەکـردن، شـوێنێک هەبـوو لەدەوروبـەری گونـدی خەبەندەلـوو پێیدەوتـرا گردە قارەمان. ئەنجامی ئەوە ئەو ناوەی لێنرا، مام جەلال داوای لەهەندێـک پێشـمەرگە کردو وتی: "دەمانەوێت ئەو گـردە بگرین بۆئەوەی دوژمـن بشـکێت، بـەڵام ئەوانەی دەچن سـبەینێ ئەم دەمـە فاتیحایان بۆ دەخوێنین و شـەرەفی شـەهیدو قارەمانیان پێدەدەین، چونکە سەرکەوتنی ئەم شـەڕە سـەرکەوتنی شـۆڕش و گەلە" (١٨) پێشمەگە شـێرانە خۆیان

فیداکـردو چوون گردەکەیان گرتەوەو شـەهیدیش نەبوون، بەڵام هەر لەو شـەڕە کۆمەڵێـک کوڕی چاک لـەو چەنـد ڕۆژەدا شـەهیدبوون، زیانێکی زۆریـش لەدوژمـن کەوت و دەبابەیـەک بەهەڵگەڕاوی و چـەک و تەرمی سەرنشـینەکانیەوە کەوتە دەسـت شۆڕش. ئەو شەڕە ورەی دا بەخەڵک و پاڵی نا بەشۆڕشـەوە بـەرەو پێش لەو ناوچەیە، ئـەو چەند ڕۆژە ئێمەش دەوری خۆمان بینی لەبەڕێکردنی نان و خۆراکی پێویسـت لەگوندەکانەوە بـۆمەیدانـیجەنگەکـە.

پاش تەواوبوونی کۆکردنەوەی زەکات و دەغڵودان گەڕامەوە عەسکەر، پـاش ماوەیەک دووچاری گرفتێکی بچکۆلە هاتم لەسـەر ئەوە چوومەوە چەم و لەئیدارە مامەوە، هەتا ژمارەم گۆڕییەوە لەگەڵ عەبدوڵڵای ئەحلان شوانی کۆنە پۆلیس و ئەو هاتە ئیدارەو من چووم بۆ شوێنەکەی ئەو لەلقی (٣)ی شـەهید عەزیز عەودەلانی، کاتێک بە خۆشـحاڵییەوە ڕۆیشـتم لەناو ئەشـکەوت سـەحرادا کە بۆ لقەکە بەکارهاتبوو، چاوم کەوت بەلێپرسراوی عەسـکەریی لـق کە ناوی ڕەسـوڵ ئاغابـوو خەڵکی گونـدی گڵناغاج بوو. پێمڕاگەیاند کە من لەجێگای عەبدوڵڵا دێمە لقی (٣)و ئەویش دەچێتە ئیدارە لەچـەم. زۆر بەڕەقی وتی: "ئێمە پێشـمەرگەی ئازاو شـەڕکەرمان دەوێت، تۆمان ناوێت"، وەکو ئەوە وابوو گوللەیەکم لێبدەیت، چونکە منی لەشـەڕدا نەبینیوە، یەکێکم لەلقەکەیان دەناسـی ناوی مەلا تالیب بوو خەڵکی ساڵەیی پردێ بوو، پیاوانە هاتە پێشەوەو وتی: "کاک ڕەسوڵ من لەپەلەکەی خۆمدا قبوڵمە بابێتە لای من، گەنجە کێ دەڵێت ترسـنۆکە، جارێ ئێمە نەمانبینیوە لەهیـچ حاڵەتێکدا، ئازا یان ترسـنۆک". زۆرم پێخۆشـبوو، مـەلا تالیب بەو هەڵوێسـتەی قەرزاری کـردم، چوومە ناو پەلی (٢) لـە دڵەخورپە ڕزگارم بـوو، خواخوام بوو زوو بکەونە جەولەو چـەم بەجێبهێڵم، وەهام لێهاتبوو ڕقـم لەچەم دەبـۆوە، حەزمدەکرد ئەوەندە دوور بکەومەوە بەسـەردانیش ڕووی تێنەکەم.

لقەکەمان ڕۆیشـتە دەوروبەری قشـلاخ و شێخ وەیسـی بۆ چاودێری جموجوڵی حکومەت لەو سەردەمەدا.

بەهاری ساڵی ١٩٦٣ بوو، لقەکەمانیان نارد بۆ گوندی کوچک نەخشینە لـەوێ چاودێـری کەنەکـەوەی دەوروبـەری چەمچەمـاڵ بکەیـن، چونکە هەواڵـەکان وەها بوون هێرشـێکی بێ شـومار دێت بۆ سـەر ناوچە ئازاد کراوەکان.

چەنـد ڕۆژێک بوو لەو ناوە بووین، ژیانێکی زۆر نوێ و خۆشـبوو لام، ناوەناوە حەرەسـیاتمان بەردەکەوت، هیچ لەشـانم ناخـۆش نەبوو، چونکە دووربینەکـەم دەنایـە چاومەوە هەر لەبانـی مەقانەوە هەتـا دەوروبەری سەنگاو و دەوروبەری دەربەند دەمڕوانی بۆ جموجوولی سوپای دوژمن.

بەیانییەکیـان لەڕێکخسـتنی شـاری کەرکوکـەوە هەواڵێکیـان هێنا کە گوایـە ڕژێـم نیـازی هەیە بەیانی هێرشـێکی بەربـڵاو بکاتە سـەر ناوچە ڕزگارکراوەکان، بەتایبەت هێزی ڕزگاری کە دەکاتە شوانەکان، شێخ بزێنی خـوارو و سـەروو، قەڵاسـێوکە، هەر ئەو ڕۆژە بروسـکەی هێـز هات کە دەبوت چاودێری شـەقامی کەرکوک- سلێمانی بکەن و لەئاستی خۆتانەوە ڕێگەی لێبگرن و لێی بدەن.

ئێـوارەی ئـەو ڕۆژە کۆکراینـەوە لەمزگەوتەکەی کوچک نەخشـینەدا، پێیانڕاگەیاندین دەبێت دە کەس خۆی ئامادە بکات پاشان خۆمان دەستنیشانی دەکەیـن، بەیانی لەگەڵ تاریک و ڕووندا بڕۆنە سـەنگەرەوە لەنزیکی جادە لەکەندەکەوە، لەکاتێکدا دوژمن هات هەر یەکێک تەنیا (٥) فیشەک بتەقێنێت لەپێشەنگی هێرشەکەو پاشەکشە بکەنەوە سەنگەرەکانی دواتر، نیاز لەمەش وەشاندنی دەستێکی ناخافڵانەو سام خستنە بەر دوژمنە.

شـەو لەمزگەوتەکەدا چرایەکی کزمان داگیرساندبوو، بۆ دروستکردنی خواردنیـش ئاگرمـان هـەر لـەژوورەوە دەکـردەوە، چونکـە گوندەکـە لەجادەکەوە نزیکەو مەترسی ئەوە هەبوو دوژمن تۆپی لێبدات. بەیانی پێش ڕوناکی بەیان لەخەو هەڵسـاین و هەموو چوینە دەرەوە ڕوو لەسـەنگەری دیاریکـراو، ئێمە (٣٠) مەترێک لەتاشـەبەردەکانی سـەر شـەقامەکە لەناو تەختـی زەوییەکەدا سـەنگەرمان بۆ لێدرابوو، بە قـەد باڵای زەلام چووینە نـاوی نمنم بـاران دەباری. سـەنگەرەکان لەئەرزدا بوون، لایەکی سـەری گیرابوو، بـاران نەیدەگرتەوە، تفەنگەکانمان بەدەسـتەوەبوو لەپاڵ نواکەدا یەکێـک ملی لەکونەکەوە دەردەهێنا، کزەبای داهات باران بە باوە بوو، دنیا ڕوون بێوە، لەولاوە وەکو ڕەوە ڕیشۆڵە کە لەترسی واشە خۆی بەزەویدا دەدا ئاوا حەرەس قەومی سـەر سـپی و ڕەش کەوای درێژی کراسی لێوار بەدەمەوە گرتوو تفەنگ بەدەستەوە هەر خۆیان هەڵدەداو خۆیان بەزەوییەوە دەنووسـاندو دەهاتنە پێشـەوە. زۆر نزیکبوونەوە بەتـەواوی خەریک بوو بێنە سـەرمان لەسـەنگەرەکەدا، سەردەسـتەکەمان وتی: دەست بەکاربن، دەسـتمان پێکرد، پێنج فیشەک تەواو، دەش تەواو تۆزێک کشانەوە، مەیتی زۆریـان لێکەوت، بەشـێوەی بارانەکـە گوللە دەباری، هێشـتا لێڵی مابوو گوللەکان سوور دەچوونەوە، هاوەنە (٦٠) ملیمەکان لەنزیکمان لەسەر یەک

دەکەوتنەوە، ڕێگامان نەبوو هەڵسین، مەترسی ئەوەمان هەبوو بگیرێین یان سەنگەرەکەمان بەسەردا بڕوخێت، هەرچۆنێک بوو فەرمانی کشانەوە درا تا هەمووماں دەرچووین لەسەنگەرەکانمان گوللەی دەوروبەرمان وڕی کردین. هەرچۆنێک بوو گەیشتینەوە سنووری برادەرەکان و سەنگەرەکانی پشتەوەی خۆمان، هێرشی حەرەس قەومی مەوجی دا لەهەموو لایەکەوە، دالاش ئاسا دابارین، تەقەی ئێمەش ڕووبەڕوویان بووەوە، خۆیان بەزەوییەوە نووساند، تۆپباران کراین، دەبابەو دۆشکەو ناوەناوەش فڕۆکەی مێک بۆردوومانیان دەکردین، وەها ڕێکەوت من کەوتمە ئەو شوێنەوە کە ڕەسوڵ ئاغای لێبوو لەگەڵ چوار پێنج پێشمەرگەدا، منیش چوومە لایان و زۆر دڵم خۆشبوو کاتێک لای ئەوان خۆم گرتەوە. بەردێکی خڕ لەسەر گردۆڵکەکەبوو ڕەنگە لەشوووتییەکی گەورە خڕەکان گەورەتر بوو بێت، لە لاشانی گردۆڵکە سەر ڕووتەکەش ڕەوەزێکی بچکۆلە هەبوو، دەتواندرا لەکاتی باراندا سێ چوار کەس خۆی لەباران بپارێزێت. ڕەسوڵ بەمنی وت: "ئێمە دەمێکە لێرەین، مەجال نادەن سەر هەڵبڕین، حەزم لەجگەرەیە دەچینە ئەوێ جگەرەیەک دەخۆین، تۆ وردەوردە تەقەیان لێ بکە، مەهێڵە بێنە سەر گردەکە پاشان ئێمەش دێینەوە لات" جگەرەخۆرێک شەڕێکی چڕم کرد، بەردەکەی خۆم لەپاڵیدا درێژ کردبوو، بە فیشەک کون کونیان کردبوو، منیش لەترسی قسەی یەکەم ڕۆژی ڕەسوڵ ترسم لانەبوو، ناوەناوە بەتفەنگە پێنج تیرە ئینگلیزییەکەم کە زۆر کۆن و خراپ بوو تەقەیەکم دەکردو بەبەرد میلەکەیم دەهێنایەوەو پەڕۆ چەورەکەم لەمیلەکەی دەدا، چونکە زوو زوو دەنووسا، هەر لەم تەقە تەقەدا بووم کوڕێکی هاوڕێم ناوی جەبار مەحمود بوو، خەڵکی گوندی سەربیر بوو گەیشتە لام و زۆر گەرم بوو لەتەقەکردن، زۆر ملی هەڵدەبڕی، هێورمکردەوە، وتم شەڕ لەوانەیە زۆر بخایەنێت ئێمەش تەقەمەنیمان کەمە هەوڵبدە کەوکوژی لەسەدا یەک بکوژیت. ئەوە چاکترە لەوەی بەهەزاران فیشەک بتەقێنیت، چونکە کوژران ورە دادەبەزێنێت، ورەم زۆر بەرز بێوە، جەبار هاتبوو، ڕەسوڵ و ئەوان لەلاشانمانەوە پێیان وابوو دوژمن لەقوڵی ئێمەوە ناتوانێت سەر بکەوێت، جگەرەخۆر بوو بە دووجگەرەخۆر، نیو سەعاتی خایاند، بە جەبارم وت: "وشیار بە با بزانم بۆ سەرناکەون" جەبار وتی: "ئەها تەماشاکە لەولاوە خەریکە پشتمان دەگرن، بەڵکو دوانیان بڕۆنە سەرووترو لەوێوە دایان پەڕێننەوە خوارەوە" کاتێک چووم هەوارەکە خاڵی بوو تومەز هەڵهاتبوون بەرەو پاشەڵی سەنگەرەکان، زۆر بانگمکردن دەنگیان نەبوو، لەوبەرمانەوە ڕیزێک سەنگەری خۆمان هەبوو، بانگیانکردم کە ڕەسوڵ لەگەڵ برادەرەکان چوون بۆ لای سەرلقەکەمان کە ئەوسا شێخ عوسمان عەولانی بوو، تومەز لەوێ شێخ عوسمان کاتێک دەزانێت ڕەسوڵ شوێنی

خۆی چۆلکردووه پێشــمەرگەکانی لێدادەبڕێت و خۆی محاســەبە دەکات و دەریدەکات لەشەرگەکەو دەینێرێتەوە بۆ چەم.

شــەڕ درێژەی کێشــا، ئێوارە، کات خۆی دابوو لەچوار لەگەڵ جەباردا جامانییەکانمــان هەڵتەکانــد بــۆ ســەنگەرەکانی خۆمــان و هەڵســاینە پێو بەجووتە هێرشــمانکرد بۆ گردۆلکەیەکیتر کە لەســەر سەری دوژمن بوو، لەوێ چەند فیشــەکێکمان بەیەکــەوە گرتە ناو قەڵەباڵغیەکەو پاشــەو پاش ڕوو لەشــەقامی ســەرەکی چەمچەماڵ هەڵهاتن، لەخواریشەوە هێزەکانیان هەندێک کشانە دواوەو مەعەسکەرێکیان هەڵداو هەموویان تەقەیان ڕاگرت. ئێمەش کە کات خۆی دا لەشەشی ئێوارە پاشەکشەمان کرد بۆ مزگەوتەکەی کوچک نەخشــینە، بەسەر تەقتەقە شــاخێکدا گەڕاینەوە کاتێکم زانی جەبار خــۆی دا بەزەویداو فیشــەکی بردە پێش و وتی: "کێــی تۆ؟!" چەند جارێک دووبارەی کردەوە کاتێک ســەرنجم دا ســەربازەو خودەکەی لەسەردایەو کــوژراوە بەیەکەوە چووینە ســەری، کۆمەڵێک فیشــەکی پێبــوو، دیار بوو یاریــدەدەری دووەمــی ڕەشاشــی برێن بووە، لە پاڵیــدا تفەنگێکی ئینگلیزی کەوتبوو، زۆرمان پێخۆش بوو، وتم: "خوا دای ئەوە تفەنگەکەم مسۆگەر بۆ دەگۆڕن" فیشــەکەکان زۆربوون، بەجووتە بەســەری بەرزەوە چووینەوە لای هاوڕێکانمان تەنیا ئێمە دەســتکەوتمان ببــوو، هەموو دەوریان لێداین، ڕێزیان لێدەگرتین، دەستیان بەسەر شانماندا دەدا.

تفەنگ و فیشــەکەکانمان دایە سەرلقەکە، پێشنیارمانکرد تفەنگەکەی من بگۆڕن، زۆر بەداخەوە بۆیان نەگۆڕین، بەڵام هەر یەکە چەند فیشــەکێکیان داینێ، ئەو ڕۆژە سەرکەوتوو بووین.

بــرادەران هاتنە لام، وتیان: مریشــک دەکڕین، هــەر یەکە دەبێت (١٠٠) فلس بدات، من وتم: "زۆر سوپاس من ناخۆم چونکە پارەم نییە" برادەرێک لێمتووڕە بوو، وتی: "من پارەکەت دەدەم و هەر دەبێت هەڵسیت" خەفەرەکان مریشــکەکانیان ئاوەڕووت کردو خســتیانە مەنجەڵەوە، هەر چەند کەسێک بەیەکــەوە مریشــکێک دوانیــان کڕیبوو، کات خۆی دابوو لە (١٢)ی شــەو، هەڵیان ســاندین زۆر هەوڵمدا هەڵنەســتم، بەڵام وازیان لێنەهێنام، هەڵســام ژوورەکــە زۆر تاریــک بوو چراکە باش ڕۆشــنی نەکردبۆوە. لەتەشــتێکی بچکۆلەدا پڕ کرابوو لە ئاوی مریشکەکەو گۆشتەکەی و هێنایانە پێش، زۆرم حەز لێبوو، زۆر دەمێک بوو گۆشتی مریشکم نەخواردبوو، یەکەم کەوچک فرۆجاوم خستە سەر لێوم، فڕێکم لێدا هەر هەموو دەمارەکانی لەشم وەکو بەچکە چۆلەکە دەمیان کردەوە، ئای لەو تەزووانەی بەلەشــمدا دەهاتن، لە ژیانمدا جارێکیتر ئەو تەزووە خۆشییەم نەدیوەتەوە، شەو بەتێری خەوتین،

لەو سـەرەوە زوو هەڵسایین لەسەنگەرەکانمان دامەزراینەوە، شەڕ دەستی پێکـردەوە، هێزی دوژمن خۆی لەئێمـە نەدا، جادەو جادە ڕوو لەدەربەندی بازیـان ڕۆیشـت، زۆربەی هێزی بـەرەو ژوور بەڕێکـرد، ڕۆژی دووەمی شەڕمان بوو نێوانی ئێمەو دوژمن (٥٠٠) مەتر نەدەبوو، بەتەواوەتی لێکنزیک بووین، فڕۆکە نەیدەتوانی لەبەر هێزەکانی خۆی بۆردومانمان بکات.

ئـەو ڕۆژە واتـە ڕۆژی دووەمـی شـەڕ نیـوەڕۆ ببـوو، بروسـکەی سـەرکردایەتی هـات کـە بەپەلـە هێزەکەمـان بـەرەو چـەم بەڕێکوپێکی بکشـێتەوە، ئـەم هەواڵەمـان زۆر پێناخۆش بـوو، چونکـە لای خۆمانەوە سـەرکەوتوو بووین و نەماندەهێشـت دوژمن بێتە پێشـەوە، بەڵام بڕیاری سـەرکردایەتی چی بوایە ئەوە جێبەجێدەکراو هێزەکەمان کەوتەڕێ بەرەو ئاغجەلـەر، لەکاتێکدا هێزی زۆری دوژمن ڕوو لەسـلێمانی دەجووڵا. وەکو شـارە مێروولە ئێمەش بە داوێنی ئاغجەلەردا بەرەو چەمی ڕەزان بەڕیزو یەک لەدوای یەک مەسـافە وەرگیرا، بۆ ژەمەکان لە گوندەکانی سـەر ڕێگا لامان دەداو نانمان دەخواردو دەکەوتینەوە ڕێگا هەتا گەیشتینە پشتی پلەی بـەردە عەلـی ڕووبەڕووی قەڵای جوڵندی. لەوێ شـوێنی سـەنگەریان بۆ دیاریکردین، هێزێکی یەکجار زۆر بەدەوری چەمی ڕەزاندا سـەنگەر بەندی کردبـوو، بەڵام هێزی حەرەس قەومی و هێرشـەکەی لـەوە بەتواناتر بوو، بۆیە هێز بەتەواوەتی کەوتبوونە جموجوڵ.

ئێمـە لەسـەنگەردا دەمانڕوانیە هێـزە لەژمـارە نەهاتووەکەی حەرەس قەومی، سـەراپای گوندەکانی ناوچەی قەڵاسـێوکەی گرتبـۆوە، گوندەکان زۆربەیان دەسوتێندراو بەبلدۆزەر تەختدەکران، دەرگاو پەنجەرە بەسەیارەو تراکتـۆرو بەکـۆڵ دەگوێزرانەوەو لەلایەن حـەرەس قەومییەکانەوە تالانی مەڕو بزن و گاوگوتاڵ دەسـتی پێکردو ماڵاتی کەس نەپارێزرا. پێشـەنگی هێرشەکە گەیشتە زیخەڵان و خورماحاجی و لاقەدی ئەشکەوتی گامێشان، گوللـەو تۆپـی دوژمـن هەمـووی دەکەوتـە چەمـی قـەڵاو دەوروبـەری سـەنگەرەکانی ئێمە، هەندێک گاگەل و مێگەلەمەڕ لەو ناوە بوو هاتن تالانی بکەن، دەسـتمانکرد بەلێدانیان و تالانەکەمان لێسـەندنەوە، شەڕ گەرم بوو، ئـەوان زۆر بوون، لێمان هاتنە پێش تا خۆرئاوا، پاشـان کشـانەوە گوندی عەسکەرو لەوێ سەربازگەیان دانا بۆئەوەی سبەی بۆمانبێنەوە.

ڕۆژی دوایـی بەدروشـمی "احنە البدو، وین العـدو" بۆمانهاتنەوە، ئەو ڕۆژەش نەمانهێشـت لـەوە زیاتر بێنە پێشـەوە، هەرچی هاوارو هۆسـەی (خفافیش اللیل) یان کرد ئەو ڕۆژەش گەڕانەوە گوندی عەسـکەر، ئێوارەی دووەم بـوو، ڕەشـید سـندی نوێنەری هێـز بوو ئاگاداری لـق و پەلەکانی

پێشــپێردرا بوو، لقی ئێمە حاجیتانی ســەرووی پێشــپێردرا بوو، تازە دوو ڕۆژ بوو گەیشــتبووینە حاجیتان هێرشی حەرەس قەومی دای بەسەرماندا، ئێمــە چووینــە ئــەم بەرەوبەری شــاخەکە، دالّــە کەرخــۆرەکان هاتنە ناو گوندەکەو دەســتیانکرد بەشڕەخۆری، تەقەمان لێکردن، تۆپبارانێکی چڕمان لەســەر بوو، بە بەرچاومانەوە دەرگاو پەنجەرەکانیشــیان دەخســتە سەر شــانیان و دەیانگەیاندە مەعەســکەرەکەی حاجیتانی خواروو. ماڵ بەماڵیان تالانکــرد، تەقەی ئێمە هەندێک پەریشــانی کردبوون، بــەڵام نەببوو بەهۆی ئەوەی شــڕەو شــاتاڵ نەگوێزنەوە، خەڵکیان لێکــوژرا، زامداریان زۆر بوو، بەڵام خۆیان ئەوەندە زۆر بوون دەت زامدار دەکرد بیستی تر دەهاتە شوێنی، تا ئێوارە شــەڕ بــوو، ئێوارە گەڕانــەوەو گوندەکەیان ســەراپا تالان کردو سوتاندیان، خانووی تێدا نەمابوو نەسووتێندرێت.

هێزەکانی ئێمە چونکە لەشــوێنەکانی خۆمان هەڵکەندرابووین، لەڕووی ئیدارییەوە باش بەڕێوەنەدەچوو ئەو گوندانەی ئێمە لەسەری دابەش ببووین دەرەقەتــی نانــی خۆراپی نەدەهاتن، شۆڕشــیش ئازوقەی وەهای لەویَ بۆ نەخســتبووین، ناچــار بۆ خۆمان پارەمــان کۆدەکردەوە بــۆ کڕینی نان و مێوژە ڕەشکەو هەنجیرە وشکە، دەبوو ئیدارە بکەین. ڕۆژی شەڕەکە هەتا نەماندەتوانــی ئاویش پەیدا بکەین، چونکە ئاوی گوندەکەش لەژێر دەســتی حەرەس قەومیەکاندا بوو، شــەو چووینــە ناو گوند ماڵ بەماڵ گەڕاین هیچ لەکــەلاوە ســووتاوەکاندا نەدەبینرایەوە، من زۆر گەڕام دوو شــتی باشــم دەســتکەوت ١. قوتویوکــی بەتاڵ بــۆ ئاو بردن. -٢- گۆزەیەکی ســووری بچکۆلە ڕەنگە سێ کیلۆ گەنمی کوتراوی تێدا بووبێت، هەردووکیانم لەگەڵ خۆم برد. شەو دەستم کرد بەکولاندنی گەنمەکەو کردم بە (دانولە) بەخوێوە دەســتمانکرد بەدابەشــکردن و خواردنی لەناو دەستەکەی خۆمانداو وەکو مێوژ دەمانکردە گیرفانمانەوە بۆ کاتی برسێتی.

## ئینقلابی ناوخۆی بەعسییەکان

زوڵم و ناڕێکی ناو بەعسییەکان وەهای کرد خۆیان لەناو خۆیاندا ئینقیلاب بکەن و گۆڕ بۆ حەرەس قەومی هەڵکەنن و ناوی حەرەس لا قەومیان لێبنێن، ئەم کودەتایە ڕووداوێکی زۆر چاک بوو بۆ ئێمە، چونکە هێزەکانی دوژمن ناکۆکی تێکەوت و پەلاماردانەکەی سەر کوردستان پاشەوپاش کشایەوەو جوتیارە دیلەکانی ئاغجەلەر بەردران و خەڵکی گەڕانەوە سەر کەلاوە سووتاوەکان و هەرماڵە هەوڵیان دەدا سەری هۆدەیەک بگرنەوەو ئیدارەی تێدا بکەن و وردەوردە خانو و ماڵ دابمەزرێننەوە.

کودەتاکەی (١٩٦٣) هەلێکی چاک بوو بۆ پشوودان و لاچوونی ئەو حەشاماتە لەسەر کوردستان و جارێکیتر خۆڕێکخستنەوە.

کاتێک بانگەوازی دژی حەرەس قەومییەکان لەڕادیۆی بەغداوە بڵاوبۆوە، هێزەکانی شۆڕش بۆ ناوچەی هێزی ڕزگاری گەڕانەوە سنوورەکانی خۆیانولقیئێمەشگەڕایەوەعەودەڵان.

بەهەلمزانی داوامکرد ئیجازەم بدەن بەرەو عەسکەر بڕۆم و سۆراغێکی کەسوکارم بکەم، ئێوارە بوو ڕۆژ زۆری نەمابوو ئاوابێت ڕێگای عەودەڵان بەچەمی ڕەزان و پلەی بەردە عەلی بۆ عەسکەر تا لەچەم ڕزگار دەبیت کارێکی زۆر دژوارە، جگە لەبوونی ئاژەڵی کێوی وەکو بەرازو دڕندەکانیتر لەبێشەی چەمدا، دارو دەوەنی چڕو تاریکونوتەکی، مرۆڤ بەهیلاکەت دەگەیەنێت. هەر چۆنێک بوو لەدار بەڕووەکانی سەر گۆڕستانەکەی شێخ ئیسماعیلی عەودەڵان کە لەبەرئەوەی شەخسێکی بەڕێزو ناودارە لای خەڵکی کەس دەستی بۆ دارەکان نەدەبرد، بۆیە بەڕووی زۆری هەبوو، ئێمەش نانمان نەبوو ناچار کۆڵەپشتەکەم پڕ کردو خۆشم هەمیشە شقارتەو چەقۆو قاپێک و کەوچکێکم لەکۆڵەپشتەکەمدا هەڵدەگرت. وردەوردە هەنگاوم ناو تفەنگەکەم گرتە دەستەوەو هێشتا ڕۆژ ڕۆشنایی دەدا بەچەم لەبێشەکە ڕزگارم بوو، بە هەورازەکەی پلەی بەردە عەلیدا هەڵگەڕام، لەسەرخۆ دەڕۆیشتم، گەیشتمە پلەی یەکەم هەڵوێستەم کرد پشوویەکی چاکم داو خۆم دانەواند، بە دووربینەکەم سەرنجێکی وردی ئاسوگەکەم دا تارماییەکی ڕەش لەسەر تەقتەقە شاخەکەی پلەی دووەم بوو، لەو ڕێیەشدا هەر ئەوەی جێگای مەترسی بوو تەنیا ڕیزە شاخ و بەردێک بوو، دەبوو هەر لەوێوە بڕۆین و تەنیا چەکدارێکیش بەس بوو تا هەرچی بەرەو ئەوێ بڕوات بیکوژێت، تارماییەکە زۆر سەرنج ڕاکێشبوو نەمدەزانی مرۆڤە یان ئاژەڵە، بێ چرپە فیشەکێکم خستە بەرو وردەوردە چوومە نزیکی. سەرەتا وامدەزانی سام

وەهــای کردووە ئەو تارماییە بێتــە بەرچاوم، بەڵام کە نزیک بوومەوە بوو بەڕاســتی و ڕەشاییەک لەسەر لوتکە شــاخەکەیەو نزیکی دە مەترێک لێک نزیک بووین، هاوارمکرد کورە کێی کوژرایت، هەستمکرد جووڵایەوە، بەڵام دەنگــی نەبوو، جارێکیترو جارێکیتر خۆم شــپرزە کرد، دەنگ نەبوو، چاوم نوقاندو خۆم تەکاندا بۆ پێشــتر لەبن تارمایی ئەشــکەوتەکەی بەر پلەکەدا کۆمەڵێکی گەورە ڕەشایی هەبوو، بۆنی نەوت و شتی هەڵکڕوزاو دەهات خۆم خســتە پاڵ بەردێکی گەورەو جارێکیتر دووربینەکەم خســتە چاوم، ڕوانیم شــتی سووتەمەرۆیە، ڕوانیم بۆ سەر لوتکەکە، قەلێکەو لەوێ هەڵنیشتووە، ترســم شکا، چوومە پێش بن ئەشــکەوتەکەم تاقیکردەوە، تێگەیشتم کاتێک حــەرەس قەومییــەکان لەو ناوەبوون ئازوقەی خەڵک کە لەو ئەشــکەوتەدا بووە هەموویان بەســەر یەکدا کــردووەو نەوتیان پێدا کــردووەو ئاگریان تێبەرداوە. زۆرم بەزەیی بەخۆماندا هاتەوە لەو شاخوداخەشدا وەکو ئاژەڵ دەژین هەر لێمان ناگەڕێن بژین، ئێمە نەچووینەتە ســەر خاک و نیشــتمانی ئەوان، ئەوان وڵاتی ئێمەیان داگیرکردووەو ئەوانیش دەمانکوژن.

زۆر دانیشــتم نەمدەتوانــی بگریم بۆ حاڵی خەڵکەکەمــان، بەڵام موچرکە بەلەشمدا دەهات، دەتوت هێزێکی موگناتیسی لەوێ ڕایگرتووم، لەپڕێکدا گوێم لەدەنگی پێی گوێدرێژێک بوو، سەرکەوتمە ناو کەلەکە، خۆم دانەواندو ڕوانیم سێ چوار پیاوو ژنێک لەگەڵ گوێدرێژێک ڕوو لەوێ دەهاتن و لەبەرخۆیانەوە قسەیان دەکردو دیار بوو ترسیان نەمابوو ماڵیان سووتابوو، هیچ شتیان بۆ دەرنەچوو بوو ڕوو لەو چەمە دەڕۆیشتن، نەمدەزانی بۆ؟

نەمویســت ڕایانچڵەکێنم لەســەرخۆ وتم: براینە بۆ کوێ دەچن؟ زۆریان پێخۆشبوو گوێیان لەدەنگی براینە بوو تێگەیشتن دوژمن نییە، هاتنە لام لەسەر ڕێگاکە دانیشــتن، پرســیارم لێکردن خەڵکی ناوچەکە چییان لێهات پاش ئەو شاڵاوە دڕندانەیەی بەعس، وتیان: هەموویان ڕووتکردینەوەو ماڵ و سامان هەرچی لەگیرفان و بەرودەست و گوێو مل دابوو بردیان، پاشان بردمانیانە تەلبەندێک لەئاغجەلەر، هەر لەبرسان و لەتینوان دوامانبڕا، ئاوی ئاو ئاساییان نەدەداینێ، باش بوو ئەم ئینقیلابە ڕوویدا، هەموومانیان ئازاد کردو هەر یەکە بەلایەکدا بڵاوەمان لێکرد، چونکە کەس خانو و ماڵی نەماوە.

هەواڵی ماڵی خۆمانم پرســی وتیان: چوونەتــە گوندی موتلیجە هەندێک ناســیاوتان لەوێ هەبوو، ئەویش باشــە چونکە لەنزیکی ئاغجەلەرە دەستی لێنــەدراوە، ئێســتا ماڵی ئێوەش لای ناســیاوەکانتانن لــەوێ، بەڵام دڵت هیچ نەکات هەموو سەلامەتن.

هەندێک بەیەکەوە دانیشتین، پاشان ئەوان بەرەو چەم ڕۆیشتن و منیش نەخشــەکەم گۆڕی، لام دایە ئەشکەوت و کانیەکەی (کانی دزان) وتم: ئاگر دەکەمــەوەو هەتــا بەیانی لەوێدا بــۆ خۆم هەڵداژێم بەیانیــش هەتا گوندی عەسکەر دەڕۆم و پاشان دەگەڕێمەوە ناو هێزەکەی خۆم لەعەودەڵان.

سەرڕازەو سەرڕاز ڕۆیشــتم هەوای شەوان فێنکترە، هەستم بەسەرما دەکرد، هەنگاوەکانم خێراتر کرد. گەیشتمە کانیاوەکە لەبەر زالوش نەمدەوێرا باش ئاو بخۆمەوە، هەرچۆنێک بوو کوپی چا خواردنەکەم دەرهێناو پڕمکرد لەئاو، دەستەسڕەکەم پێداداو هەندێک ئاوم خواردەوەو بەرەو ئەشکەوتەکە ڕۆیشتم. هێشتا مابووم بگەمە ئەوێ تروسکایی ئاگرم بەدیکرد، هەوڵمدا بێ چرپە لێی نزیک ببمەوە، وەها نزیک بوومەوە بۆم دەرکەوت گەنجێکی لای خۆمانــە لەوێ هەڵاژاوە لەبەر ئاگرەکە بــەڵام بەخەبەرە، چونکە ئەو لەبەر ئاگرەکە بوو شەوقی ئاگرەکە نەیدەهێشت من بەدی بکات. تۆزێکیتر چوومە پێش و بانگمکرد هۆ (مەلا حەمید) خێرا هەڵســایە سەر پێ‌و دارەکەی گرتە دەستەوە وتی: تۆ کێی؟

وتم منم عەلە، کاتێک زانی منم زۆر خۆشــحاڵ بوو، دیار بوو دابڕابوو بەتەنیــا بێتاقەت ببوو، هەڵســا لەبەرم و شــوێنەکەی خۆی بــۆ چۆڵکردم. لێمپرســی نانــی لانییە، وتی: دوو ڕۆژە هیچ شــتێکم نەخــواردووە، چونکە ئاوەدانــی نەماوەو منیش هەر بەم چۆڵەوە ژیاوم و کاتێک کۆڵە پشــتەکەم کــردەوە هەندێک بەڕووی گــەورە گەورەم دەرهێنا زۆرتــر دڵخۆش بوو، چنگێکم ســەرو قنگ بڕی و خســتمە ناو پشــکۆ ئاگرەکەوە، دەســتیکرد بە تەقەتەق و هەڵبەزینەوە. زۆری برســی بوو پەلەی کردو یەک لەســەر یەک بــەڕووی پاکدەکردو دەیخوارد منیش هاوبەشــیم کردو هەندێک بەڕوومان خوارد، پاشــان کەوتینە پرســیار لە یەکتری، وتی: ڕووداوەکان چۆن چۆن بــووە، هەر بەدەم قســەوە چاوەکانمان لێــک دەناو خەبــەر دەبووینەوە، بەیانی زوو هەڵســاین و ژەمێکیتر بەڕوومان برژاندەوە، پاشــان من ڕام گــۆڕی و گەڕامــەوە بۆ عــەودەڵان و ئەویــش بەرەو هــەواری ڕووخاو لەگوندی عەســکەر.

پــاش چەند ڕۆژێک ســەرەتای گفتوگــۆ لەنێوان شــۆڕش و حکومەتی عەبدولســەلام عــارف دەرکــەوت، هەرچەندە پێشــتریش لەگــەڵ حەرەس قەومییەکان و لەگەڵ ڕژێمی قاسمیش گفتوگۆی نەزۆک کرابوو.

جێــگای داخــە هەمــوو ئەو یاداشــتانەی ڕۆژانە دەمنووســین لەســەر ڕووداوەکانــی ڕۆژ بەچەنــد جارێک کەوتنە بەردەمــی ئاگرو تاڵانی بەعس

و کۆتایی بەڵگەی یاداشتەکانم بەر شەپۆل و شاڵاوی دڕندانەی ئەنفالی سێ کەوتن و ئیستاش بێ بەڵگەی تۆماری ڕۆژ قسە دەکەم و نامەوێت هاناش بۆ هیچ بەڵگەیەکیتر بەرم، چونکە نیازی من یادکردنەوەی یادە کۆنەکانە کە بۆ من پڕن لەسەروەریی.

بەکوردی لە (١٩٦٣)دا بوو جاری دووەم گفتوگۆ دەستی پێکردبوو، سەرۆک وەزیران (تاهیر یەحیا) سەردانی لای بەڕێز بارزانی مستەفای کرد، لەگەڵیاندا نەخشەی لامەرکەزییان بۆ کورد باس کردبوو کە ئەمەش بەڕەشترین ڕۆژ وەرگەڕا بۆ کورد، بوو بەهۆی دروستکردنی ناکۆکی و لەتوپەرتکردنی بزووتنەوەی یەکگرتووی کورد لەکوردستانی خواروو.

## ژیانی ڕۆژانی گفتوگۆ

لقەکەمــان لەعەودەڵانــەوە گوێزرایــەوە بۆ گوندی قۆجەلــەر، گوندەکە لەنێوانــی هەندێک گردۆڵکــەی داراوی دایەو لەخوار ماڵەکانیشــەوە ڕەزو باخــی هەنــارو هەنجیــرو داری بێبــەری تێدایــە، ئــاوی بەشــی زەراعەت کەموکــورت هەیــەو پاشــەڕۆی ئاوەکەشــیان دەچێتەوە چەمــی گەورەی ئاغجەلەر، ڕێک ئەم گوندە لەخۆرهەڵاتی شــارۆچکەی ئاغجەلەرە. ئەو کاتە بــارەگای بەتالیۆنــی (٢) برایەوە ئاغجەلــەرو ژیانی پێشــمەرگە گۆڕانێکی نوێی بەســەردا هاتبوو، برنج، ڕۆن، گۆشــت، ئاردی ســپی بۆ نان، بەتانی ســەربازی بەســەیارە ڕێکردن، چوونە ناو خەڵک و گەڕان بێئەوەی لەهات هاتی کۆپتەرو فڕۆکەیتری جەنگی مەترسیان هەبێت. ژیانی لقەکەی ئێمەش بەتەواوەتی گۆڕابوو، ناوە ناوەش ئیجازەی دوو ســێ ڕۆژ دەدراین، ماڵی ئێمەش هاتبوونە موتلیجە هەفتەی شــەو و ڕۆژێک دەچوومەوە، هەرچەند گفتوگۆکە پشــت پێبەســتراو نەبــوو، چونکە ئەزموونــی گفتوگۆی یەکەم پۆلی بەعسییان ئەوەی پێبەخشیبووین کە بڕوای تەواو نەکەین و هەمیشە بەوشیارییەوە لەهێزەکەمان دوور دەکەوتینەوە.

وردەوردە هێزەکان مەشــق پێدەکران گوایە ئەگەر ڕێک کەوتین دەبێت لەهێزی ســەربازیدا بەشــداری بکەین و ناشکرێت ئەوســا مەشق نەزانین، بەیانیان ماوەیەکی باش ڕاست چەپیان پێدەکردین.

پەیوەندیکردن لەگەڵ ڕژێمی عەبدولسەلام عارف و هاتنی تاهیر یەحیا بۆ ڕانیەو دانی بەتانی و برنج و شــەکرو ڕۆن و ئاردو ئیجازە بە پێشــمەرگە و کوێی بویستایە بۆ ئەوێ نەقڵ بکرێت و پارەدان بەپێشمەرگەو خەڵاتی چاک بەئەفسەرەکان و لێپرسراوانی پێشمەرگە، هەلێکی چاکی ڕەخساند بۆئەوەی مەکتەبی سیاســی و ڕێکخســتنی پارتی بەتەواوەتی بنکەند بکرێت و خەڵکی فێری بەرەڵایی و بێ ئیلتیزامی بکرێت و خەڵکی فێری ئەوە بکرێت گاڵتەی بە پارتایەتی و بیروباوەڕ بێت و فێری ئەوە بوو بڵێ بەســەری بارزانی و گوو بەگۆڕی باوکی پارتی.

مەکتەبی سیاســی هاواریکرد لەڕێگای ئەندامەکانیەوەو ئاشکرایکرد کە ســەرکردایەتی بارزانــی بەتەنیا لەگەڵ دەوڵەتی عــارف و یەحیا بە بەلاش ڕێکەوتووەو ئەنجام کورد شــتێکی پێنادرێت، بەڵام ئەوانە ســوودی نەبوو هــەر ڕۆژێــک هەڵدەســتایت لەلقێکدا پەلێک ڕۆیشــتبوو بــەرەو لای هێزی بارزانــی، ڕاکــەڕاک و بێبڕوایی تــا دەهات زیاد دەبــوو، ئەوەبوو مەکتەبی سیاسی پارتی لەماوەت کۆنفرانسێکی گەورەی گرت بۆ ئەندامانی پارتی و

بەرپرسـانی پێشمەرگە. لەفەرماندەی پەل هەتا سەروو، چەند ڕۆژێک قسە لەسەر وەزعەکە کرا، ئەوەی بەشدار ببوون هیچ کەسێک لەو کۆنفرانسەدا هەڵوێسـتێکی جیای دژی مەکتەب سیاسـی دەرنەبڕی. هەمووی پاڵپشـتی لەسیاسـەت و خەتی مەکتەب سیاسـی دەکردو دژی تاکڕەوی سـەرۆکی حیـزب بوون. بەڵام هەر لەکۆبوونەوەکە هاتنە دەرێ هەر ئەو شـەوە لەو نوێنەرانە بەخۆیان و چەکەکانیانەوە بۆ لای هێزی بارزانی ڕۆیشتن.

ماوەیەکی چاک هەوڵدرا بۆ یەکخستنەوەی مەکتەب سیاسی و سەرۆکی حیزب، بەڵام ئەنجامێکی باشی نەبوو.

پاش چەند ڕۆژێک مام جەلال بەچەند سـەیارەیەکی پڕ لە پێشمەرگەوە دەستیکرد بەجەولە لەماوەتەوە بەرەو چەمچەماڵ هات، لقی ئێمە کە لەقۆجەلەر بووین بانگکراین و ئێمەش چەند سـەیارەیەکمان پڕکرد، چووینە هەمەوەند لەوێوە بۆ جەباری، لەهەر یەکێک لەم شوێنانە مام جەلال قسەی بۆ خەڵکی دەکرد، هێزی پێشـمەرگەی کۆدەکردەوەو باسـی هەڵوێسـت و بۆچوونی مەکتەب سیاسی و هەڵوێست و چۆنێتی گفتوگۆی نێوانی سەرۆکی حیزب و حکومەتی دەکرد. لەگەرمەی کۆبوونەوەدا کەس هەڵوێستێکی دژی نەدەنواند، کاتێـک مـام جـەلال و هێزەکـەی ئـەو شـوێنەی بەجێدەهێشـت، ئەوانیش باروبارگەیـان لێکدەناو دەچوونە لای هێزی سـەرۆکی حیزب، تا وایلێهات جەولەکە گەیشـتە دەربەندی بێلوولەو لەڕێوە سـەرکەوت بۆ سەر شاتەو گوندی پشتە، لەو دیوی بناری بەمۆ.

لەوێ هەڵگەڕانەوە دروستبوو، هەندێک وردەتەقەش دروستبوو لەنێوان ئـەو هێزەی مـام جەلال لەگەڵ خۆی بردبووی، هـەر لەوێش لقەکەی ئێمە هەڵوێسـتی خۆی نیشـانداو بوونە لایەنگری سـەرۆکی پارتی، من و یەک دووانێـک کە خۆمان بەئەندامی دڵسـۆزی پارتی دەزانی دژی هەڵوێسـتی لقەکەمان بووین، بەڵام لەدڵی خۆماندا.

مام جەلال خۆی و دەستەکەی گەڕانەوە بۆ ڕانیە، لەسەر داوای بارزانی مستەفاو بڕیاری مەکتەب سیاسی. هێزەکە بڵاوەیلێکرد، هەر یەکە(٥) دینارو ئیجازەیـەک و وەرەقەیەک کوێی دەوێت بڕوات. لەوێ هەندێک پێشـمەرگە خەڵاتکراو مەسـئولیاتی بۆدانرا، لەو پلەیەی هەیبوو زیاترو دڵخۆشـکەرتر. پێشـمەرگە بەپلەی سەدا سـەد بەلای سـەرۆکی حیزبدا گەڕانەوە، چونکە لەسەردەمی پارتیدا پێشمەرگە دەبوو ئیلتیزام بکات، لە کوێ پێشمەرگە بوو بەئەرزی خۆی بزانێت، پارەپێدان نەبوو! مەسئولیات بە لێوەشاوەیی بوو.

بڕیار بڕیاری پارتی بوو تاکه نەفەر بۆی نەبوو بڕیار لەسـەر شـتێک بدات کە دواڕۆژی شۆڕشی پێوە دیارە.

کاتێک هێزەکەمان چووە گوندی قەرەچەتان، لە مزگەوتەکە پێشوازیکراین ژەمێک دووان برنجی چەورو زۆر، بەنانی سپی ئاردی بەمبەوەو خەوی ناو بەتانی و سـەیارەی سەربازی، ئیتر بەتەواوەتی بوونە سەربازی گومناوی بارزانی و سـەد تفیان لەچارەی مەکتەب سیاسـی دەکرد، لەوێدا زۆر ڕقم لەبێبـاری و پوولەکێتی پێشـمەرگەکانی هاوڕێم بـۆوەو بڕیارمدا زوو یان درەنگ پەیوەندی بە مەکتەب سیاسیەوە بکەمەوە.

منیـش (٥) دینارو ئیجازەی یەک مانگم وەرگرت، چوومەوە عەسـکەر، لەگەڵ عەبدوڵا مەجیدی شـەهید ڕێکەوتین تا بـوار هەڵدەکەوێت بگەینەوە ماوەت خۆمان لەگەڵ بەتالیۆنی حاجی شـێخ قادر بگونجێنین، ناوی خەڵکی دەنووسـرا بـۆ حەرەس حـدود، ئێمەش خۆمـان ناو نووسـکرد بۆئەوەی سـەریان لێتێـک بدەیـن و ئەگـەر لەڕێی چوون بـۆ مـاوەت گیراین بڵێین ئیشـوکارمان هەیـە، بەڵام ئێمە ناومـان بۆ حەرەس حدوودی نووسـیوە، نەخشـەکەمان سەریگرت، دوای یەک هەفتە دوو قۆڵی بەرەو ماوەت بەناو هێـزی بارزانیدا بەڕێکەوتین بێئەوەی بگیرێین چووینە ماوەت و لەوێوە بۆ ژاژەڵەو ئاوکورتێو عیساوێ. ئەوسا بارەگای مەکتەب سیاسی لەئاوکورتێ بـوو، چەند هەفتەیەک لەوێ بووین هێزەکانـی بارزانی پەلاماری بنکەکانی مەکتەب سیاسیان دا، خەڵکێکی زۆری هاندا، سەری ئەوانەی لەگەڵ مەکتەب سیاسین بۆ پارتی و ماڵ و سەروەتیان بۆ هێرشبەران.

هێـز ناوچەکانی مەکتەب سیاسـی تەنگکردەوەو شـەڕ هاتە سـەریان، ئێوارەیەک هێزێکی یەکجار زۆریان هێنایە سـەرمان و لە یەک دوو ڕۆژدا بەگوللە کردیانین بە ئێراندا.

مایسـی ١٩٦٤ بـوو کـە مەکتـەب سیاسـی و (١٥٠٠) پێشـمەرگە دەرپەڕێندرایـن بۆ ناو خاکی کوردسـتانی ئێران بۆ گوندی بەردان و هەتا لەوێش وازیان لێنەهێناین و گولله بارانیان دەکردین.

## تێکشکانی بیروباوەڕ

ئەوسا پێشمەرگە پێش ئەم ناکۆکییە سوێندی بەسەری یەکتری و شۆڕش دەخوارد، بەڵام کاتێک ناکۆکی دروستبوو، خەڵکانی هەڵمەتەکاسە سوودیان لێوەرگرت و شۆڕشیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاردەهێنا کە وتیان: لایەنی هێزی سەرۆکی حیزب بەلۆری شەکرو ئاردو برنج و ڕۆن و گۆشتی لەلایەن حکومەتەوە بۆ دێت و بەسەیارەی سەربازی دەگوێزرێنەوەو لەجیاتی لێفەی داڕزاوی مالان و لەمزگەوت خەوتن، لەمقەڕی دەوڵەمەندو بە بەتانی سەربازی دەخەون و گیرفانی پێشمەرگە کە جاران عانەی تێدا نەبوو، ئێستا پارەی خەلات و پارەی مانگانەی تێدایە، ئەوەی پێشمەرگە بوایە پارەی مانگانەو ئەوەی فەرماندەی دەستەو پەل و لق و بەرەو ژوور خەلاتی بەپێی پلەی پێدەدراو دەمی چەور دەکرا. هەرچی پێی بڵێیت بیروباوەڕ لەگۆڕێدا نەمابوو، ئەم دەمچەورکردن و خەلاتە بێجێوڕێیە، خۆشەویستی و تەبایی و دڵسۆزی و برایەتی لەناو هێزی پێشمەرگەو خەڵکدا نەهێشت و لەجێگایدا درۆزنی، دەملووسی، ئاژاوەنانەوە، خەڵک تووشکردن، قسە لەسەر خەڵکی کردن بۆ خۆگەورەکردن هاتە جێگای و کەس بۆ کورد خۆی نەدەسووتاند. هەرچی فرمێسکی دەڕشت بۆ هەریسەکەبوو نەک بۆ حسێن، هەر کە ئاشکراش بوو مەکتەب سیاسی و سەرۆکی پارتی لێکدابڕان، هەوڵدەدرا گەشە بەکوشتن بدرێت، بۆ خۆ چاککردن یەکێکی سەر بەمەکتەب سیاسی بکوژێت تاکو پلەی بەرز بکرێتەوەو دەریبخات دڵسۆزی سەرۆکی پارتییە. بەم شێوەیە ئەنجامی ئەو ناکۆکییە لەوپەڕی پەرۆشی و دڵسۆزی و خۆشەویستی و خاوەنی بیروباوەڕەوە گەیشتە ئەوەی دەستیان سوور بکەن بەخوێنی یەکتری و هەرچی پێیبڵێیت بیروباوەڕو دڵسۆزییە نەمایەوە!

## بەرەو ئێران

ئـەو هێـزە (١٥٠٠) مرۆییەی پەڕینەوە بەری بـەردان و بێتووش، هەر ئەو شـــەوە زیاتر لە (٧٠٠) کەس لەڕێ خۆی دزییەوەو گەڕایەوە ناو هێزە زۆرو زەبەندە عەشـایەرییەکەی سـەرۆکی پارتی کۆیکردبوونەوە بۆ سەر مەکتەب سیاسیەکەی خۆی.

وای لێهات لەتەنیشتەوە لای دەدا بۆ میزکردن، کاتێکت دەزانی نەماوەو هەڵهاتووە. ئەو شـەوەی هێزەکەی مەکتەب سیاسی پەڕییەوە کوردستانی ئێران، مامۆسـتا ئیبراهیم ئەحمـەدو یەکێکیتر بەڕێکران بۆ ئێران، بۆئەوەی قسـە لەسـەر ئەوە بکەن ئێران ڕێگا بدات مەکتەبی سیاسی تاماوەیەک لەو دەم سنوورانە بمێنێتەوە تا تۆزێک باری کوردستانی خواروو ئارامدەبێتەوە، ئەوسـا بگەڕێتـەوە. مـاوەی (٢٤) سـەعات دانـرا یـان چـەک دانێـن یان بگەڕێنـەوە بۆ کوردسـتان. ئێمەش دەبوو لەو دوو ڕێگایـەی بۆماندانراوە یەکێکیان هەڵبژێرین:

١. گەڕانەوە بۆ کوردستانی خواروو.

٢. چەک دانە دەست ڕژێمی شاهەنشایی.

هەردووکیان بۆ ئێمە ئاسان نەبوو، بۆیە ناچار کۆبوونەوەیەکی گەورە بەهێزەکە کرا کە دەوری (٩٠٠) پێشمەرگە بوون کە زۆربەیان کادر بوون، مشـتومڕ لەسـەر ئـەو دوو خاڵە کرا. هەرچـی مام جەلال بـوو ڕای وابوو بگەڕێینەوەو لەبناری سـوورکێو شـوێنێک داگیربکەین و داوا لەسـەرۆکی پارتـی بکەین شـەڕی یەکتری ناکەین تا ئەنجامی گفتوگـۆی نێوان پارتی و میری بەلایەکدا دەکەوێت. ڕاکەیتریش ئەوەبوو هەر یەکسەر داوای پەنابەری بکرێت بۆ ماوەی زیاتر لەسـاڵێک، تا ئەوسـاش هەڵویستی بارزانی و میری دەردەکەوێـت لەگفتوگۆکـەدا. ئەنجـام ڕای یەکەم سـەرکەوت بـەوەی داوا لەدەوڵەتـی حەمەڕەزا شـا بکرێت (١٥) شـەو مۆڵەتمان بدات لەبێتووشـدا بمێنینەوەو هەندێک ئازووقەو پێویستیمان بۆ دابین بکات.

ڕۆژی دووەممان بوو، فڕۆکەی کۆپتەری جەنگی ئێرانی پراوپڕ بەدۆڵی بێتوش دەسووڕانەوە، مەترسی ئەوەمان هەبوو چەکمان بکەن، چونکە سوپای ئێرانیش ئابڵوقەیان دابووین، لەلای مەرگەشەوە هێزەکانی بارزانی لێمان نزیک ببوونەوە، بە بەردەوامی تەقەیان لێدەکردین. ڕۆژگارێکی تاریک و ئاڵۆز بوو، هەموو تەنگەتاو ببووین تەنانەت ئەندامانی سەرکردایەتیش، هەندێک ژاندار میری و سـەرباز لەلێپرسـراوێکی ئیداری ئێمەیان هەڵپێچابوو لەسنووری

لقەکـەی ڕاویان نابوو. مام جـەلال بەخۆی و دەسـتەکەیەوە چووە گیانی ئەفسـەری بەرپرسـیاری ئەویٚو هەزار قسـەی توندی پێوت. وتی: ئەگەر ئێـوە میوانداری نازانن بۆچی میوان ڕادەگرن. بەهەرحاڵ، ژیانی ئەو چەند ڕۆژەی بێتـووش نوێبـوو، ناخۆش و خۆش تێکەڵاو بوو، ئاشـنابوونمان بـوو بەگوندێکی دابڕاوی کوردی لەکـوردو بەتەواوەتی چێژمان لەیەکتری وەردەگرت، هەر چەندە ئەوانە ئەوەندە ژێردەستی ژاندارمەکان بوون ئێمە تەریق دەبووینەوە کاتێک ئەفسەرێکی ژاندارمە دەچووە ماڵێک، خێرا خاوەن ماڵەکە لەبەردەسـتیدا وەکو نۆکەرو بەردەستی هەڵدەسوڕا. هەستماندەکرد کەسـایەتی لەخاوەن ماڵەکە سەندراوەتەوە لەئاستی زۆرداری ئەو دڕندانە. بـەڵام کاتێـک ئێمەی کورد هاتوچۆمـان دەکردن زۆریان ڕێـز لێدەگرتین، لەگەڵمان دەکەوتنە پرسیارو وەڵام.

(١٥)شـەو تـەواو بـوو، ئێوارانێـک پاش دنیـا تاریکبـوون هێزەکەمان ڕێچکـەی بەسـت و بەنـاو خاکـی کوردسـتانی ئێرانـدا ڕوو لەئـاوی ئاڵووتان و بناری سـورکێو کەوتینەڕێ، ئەو شـەوە بۆ مەلابانگدانی بەیانی لەئـاوی ئاڵووتـان پەڕینەوە بـەری سـورکێو، چەند ڕۆژێک لـەوەو پێش هێزێکیترمـان بەسەرپەرشـتی شـەهید عەلی عەسـکەری و ڕەئیس کەمال موفتی پەڕیبوونەوە باسنێو لەوێوە پەلاماری گمۆیان دابوو، بەنیازی دابڕینی بەشـێک خاک و پاشـان بروسـکەکردن بۆ سـەرکردایەتی بارزانی کە هەر هێزەمان لەشـوێنی خۆی تا ئەنجامی گفتوگۆ. کاتێک ئێمە گەیشـتینە یەکەم لوتکەی سـورکێو شـەڕو پێکدادان لەگوندی باسنێو پشـتی باسنێ گەرم بـوو، منیان بەکارێک نارد. لەوێ شـەهید عەلیم بینـی بەپێوە لە دەوەنێکدا وەسـتابوو، گوللە زۆربەی سـەرچڵی دارەکانی بردبوو، هاوارم لێکرد کاک عەلی دانیشە، پێکەنینی پێمهات و وتی: هیچ نییە ڕۆڵە دانیشە بۆچی هاتوویت؟ نامەیەکم پێبوو دامێو سەعاتێک لای بووم. ئەم مرۆڤە چاونەترسە هەر لەو دەوەنەدابوو تاوتاوە دادەنیشت و دوو سێ پێشمەرگەی تری لەتەنیشتەوە بوو، نامەی نووسـییەوەو منیش گەڕامەوە سـەر سـورکێو. چەند ڕۆژێک لەوێ بووین، شەو سەرماو ڕۆژ گەرما، بەرازی زۆریش بەڕۆژ هاتوچۆی دەکـرد، ئاژەڵیتری هەبوو نەماندەوێرا تەقە بکەین بۆ ئەوەی شـوێنەکەمان ئاشکرا نەبێت.

سەرماو گەرما، ئەسپێ، نانی وشک، خەریکبوو هەموومان لەناو بەرێت، ئەگـەر بهاتایە ماوەیەکیتر لەو سـەر چیایە بماینایەوە تەنیا ئەسـپێ بەس بوو بۆ ئەوەی بمانخوات.

شەڕ تا دەهات گەرمتر دەبوو، هێزەکانی لای شەهید عەلی و ئەوان پاش هەندێک سەرکەوتن، شکان و هاتنەوە سورکێو. هێزەکانی ئێمە بەسەرکردایەتی مام جەلال چووین بۆلای نۆرک و بارێ و سەریشمان لەشێخ لەتیفی نەمر دا لەسیاگوێز، پاشان هێزمان هێندە لەسەر کۆبووبۆوە کە خۆمان لەبەریدا پێرانەگیرا.

بەپێی قسەی سەرکردەکانمان هەندێک لەسەرلق و کەسە لێپرسراوەکانی لای پارتی لەناوچەی شارباژێرو سیوەیل نامەیان بۆ ناردوون ئەگەر ئێوە نەیەنەوە ئێمە دێینەوە لاتان و بۆماندەرکەوتووە گفتوگۆکە داوێکە بۆ لەناوچوونی بزوتنەوەی کورد. بەڵام لەڕاستیدا کاتێک چووینەوە ئەوانە لەپێش هەموویانەوە بەقەستی کوشت تفەنگیان پێوە دەنایین بۆئەوەی سەرمان بەدیاری بەرنەوەو چەکەکانیشمان لەگەڵ خەڵاتی دوایی بۆ خۆیان، شەهیدێکمان لەبەرامبەری سیاگوێز دا بەناوی ئەحمەد حاجی عەبدوڵا خەڵکی سلیمانی، ڕۆژێک لاشەکەی لەلامان لەسەنگەرەکەدا مایەوە، گیانمان بەوە باش بوو شوێنەکەمان فێنک بوو بۆنی نەکرد، شەوی سێیەمی شەڕ بەبڕیاری مام جەلال سەنگەرەکەمان چۆڵکرد. پێشمەرگەکانی بارزانی نیشتنەسەرمان و بەڕەزالەتێکی زۆر لاشەی ئەو پێشمەرگە شەهیدەمان ڕزگار کرد، ئەگەر بڵێم لەو هەورازەی پشتی نورکەوە دەجار لەسەر ماینەکە بەربۆتەوە هەڵەنیم، بەڵام هەر جێمان نەهێشت، بەیانی ڕۆژ بۆوە هێشتا سورکێومان جێنەهێشتبوو، هێزەکەی بارزانی دایانینە بەر شلنیکی برنەو. هێزی شکاوی ئێمەش هەڵدەهات و خۆی پێنەدەگیرا، ئەوسا من لەدەستەی مام جەلال بووم لەگەڵ هەندێک برادەریتر لەمشووری ئەوەدا بووین مام جەلال ڕزگار بکەین و نەکەوێتە داو. مام جەلال ناوی خۆی نا (پیرۆت)و بە دوو سێ پێشمەرگەدا لەپێش خۆمانەوە بەرەو گوندەکانی ئێران بەڕێمانکرد بۆ لای شەهید مەلا ئاوارەو سلێمان و فایەقی مهین کە کادری دیموکرات بوون، لەو ناوە مشووری خۆراکیان بۆ دەخواردین لەناو پێشمەرگەکانی ئەودیودا، هێزەکەشمان هەموو چووینە گوندەکانی ئێران تا چەند گوندێک دوورکەوتینەوە گوللەی گرداری بارزانیەکان لەسەر سەرمان گیزەی دەهات، زۆربەمان شەو ببووین بە ئێشکچی لەسەر کۆڵان و سەربانەکانی یەکێک لە گوندەکان کە بەداخەوە ناوەکەیم لەیاد نەماوە، ئەوەندە دەزانم لە نزیکی سورکێو بوو بۆ لای بلەکێ و بانە.

هێشتا خەو باشی بەرنەدابووین شاوری کۆبوونەوە لێدراو کەوتینە ڕێ بۆ نزیکی بلەکێ، لەوێ مام جەلال زۆر پەژارە دایگرتبوو، تەنیا دەهاتودەچوو دەستی بەکاکۆڵیدا دەهێناو دەیکرد بەدوو بەشەوەو تۆپەڵێکی

لەسەر نێوچاوانی کۆدەکردەوە، لەپڕێکدا تێکیدەدایەوە، تازە هەندێک چەکی نوێمـان بۆ هاتبوو کە هەمـووی بڕنەوی ڕەش بوو لەئێرانمان وەرگرتبوو، تـازەش درابـوو بەپێشـمەرگە، ئـەو بڕنەوانـە زۆر خۆشەویسـت بوون، فرمێسـکی بـۆ دەڕژا بدرێتەوە بەئێـران، چەککردن ناخۆشـترین کارە کە لەگەڵ پێشمەرگە بکرێت، لەوەش ناخۆشتر ئەوەبوو هیوا نەبوو بگەڕێتەوە کوردسـتان، لەویش ناخۆشـتر ئەوە بوو لەدەست کورد دەردێن و کوردو هاوسەنگەرەکەی خۆمان هەڵمان دەبڕێت.

دێتـەوە یادم ئـەو ڕۆژە نیاز وەهابوو هەرکەسـێک بتوانێت بگەڕێتەوە خـۆی لەناو پارتیدا بپارێزێت با چەکەکەی نەفەوتێت و نەدرێتەوە بەئێران، بـا بڕواتـەوە، هەندێکیش وەکو دەسـتە بەیەکەوە دانران بەسەرپەرشـتی عەریف مەجید شـوانی بگەڕێنەوە لەنێوان سـنووری ئێران و کوردستاندا بەچەتەیـی بژین تا بەتەواوەتی ئەندامانی پارتـی دابڕاو کۆدەکەنەوەو ببنە بنکەیەکی شاراوە تا پارتی زیندوو دەبێتەوەو حیزب دروستدەکاتەوە، چونکە دڵنیابوون گفتوگۆکە سەرناگرێت و شۆڕش هەر دەست پێدەکاتەوە.

هەرچۆنێـک بـوو چاکترین چەک درا بـەوەی بگەڕێتـەوە لای بارزانی و ئـەوەی لـەو نـاوەش دەمێنێتـەوەو باقـی چەکەکانیتـر ژمارە کـراو کۆڵ کـۆڵ بەسـتراو تەسـلیم بەڕژێمی شـا کرا، هەندێـک دەمانچە کـە هەبوو هەرکەسـە لەبن پشتێنەکەی شاردییەوەو بردمان لەگەڵ خۆمان، بەسەیارە گواسـترابنەوە سـەربازگەکەی بەر ئەربەباو چەند ڕۆژێک لەوێ ماینەوە، پاشـان براین بۆ سـەقزو لەوێ لەهەندێک ژوور کە هی وڵاخە بەرزەکانی سـوپابوو ویسـتیان لەوێ دامان بنێن، بەڵام مام جـەلال تووڕەبوو، وتی: هەر ئێستا دەگەڕێینەوە ئەفسەرەکان دەوریان لێداو دڵیاندایەوەو بڕیارياندا هەر دوو نەفەر خێمەیەکی بچکۆلەی بدەنێ، نامەوێت بیشارمەوە کە لەبانە بەبازاڕەکـەدا بەڕێ کراین منداڵ و خەڵکێکـی زۆر بەردەبارانیان دەکردین و بـژی بارزانیان دەوت، لەسـەقز پاش ئـەوەی خێمەکانمان دانا هەر دوو کـەس بۆ خۆی جێـگای چاکدەکرد، مام جەلالیش خـۆی جێگای خیمەکەی چاککردو قوڕی بۆ گرتەوەو جوان جوان ناوەکەی سواغ دا.

زۆر چڵکن بووین، ئەسـپێی زۆر تێدابووین، ڕێگایان داین بڕۆینە سەر چەمەکەی سەقز لەو ئاوە خۆمان بەئاوی سارد بشۆین، بەڵام لەبەرئەوەی ئاوی گەرم نەبوو چەندە ئەسپێمان دەدایە ئاودا شەو ئەوەندەیتر دروستدەبۆوە، پارەشمان نەبوو، دیارە هەموومان نا، بەڵام من یەک تمەن چییە پێمنەبوو، هەر دوو کەس شووشـەیەک دەرمانی ئەسـپێی دەکڕی و دەیگرتەوەو سەراپای جلەکانی تێدەنا. هەندێک لەسـەری دەدا هەتـا ڕێکەوت یەکێک هێندە داخی

لەئەسپێ خواردبوو هەموو لەشی پێ چەور کردبوو، دووچاری پێست سووتاندن و حەساسیەت بوو لەئەنجامی خراپ بەکارهێنانی دەرمانەکە.

من هاورێیەکم لەگەڵدا بوو خەڵکی گوندی گەڵنێری کە گوندەکەیان بەر دەریاچەی دوکان کەوت، ماڵی چووبووە بەکرەجۆ، ناوی سەید حەسەن بوو ئەویش لەدەستەی ئێمەبوو، شووشەیەکی کڕی تا بەتەواوەتی جلەکانی خۆی تێنەداو لێنەبۆوە نەیدایێ، ماڵی ئاوابێت بەدەرمانکردنی جلوبەرگ و جێگاوبانەکەمان ئۆخەی ڕزگارمان بوو لەسیخورمەی ئەسپێو لەشخوران.

دە پانزە ڕۆژێک دەبوو لەسەقز بووین، هەرچەندە لەسەر سنوور بەهەمووان وترابوو، کەچی هەر ڕۆژە چەند پێشمەرگەیەک دەڕووخان و دەڕۆیشتنەوە بۆ کوردستان. خەڵکی سەقز دەورێکی خراپیان دەبینی لەڕووخانی برادەرەکانمان و چاوساغیان دەکردن بۆ گەڕانەوەیان، بۆیە سەرکردایەتی مەکتەب سیاسی ڕێکەوت لەگەڵ ئێران کە بمانبەن بۆ هەمەدان، لەوێ خەریکی خۆپەروەردەکردن بین.

چەند ڕۆژ بەڕێوەبووین، شەوێک گەیشتینە هەمەدان و خراینە بینایەکی گەورە کە کۆن کارخانەی شقارتە بووەو ئاگری تێبەربوو، سەرلەنوێ چاکیان کردبۆوە. حەوشێکی گەورەی هەبوو یەک هۆدەی زۆر گەورەی هەبوو کە دوو سەد کەسێکی تێدا جێدەبۆوە، بەدەوریشیدا چەندان هۆدەی بچووک بچووک هەبوون، سەرەتا دەرگا گەورەکەی نێوانی بیناکەو دەرەوەیان دادەخست و دەستەیەکی ژاندارمە پاسەوان بوون، لەکاتێکدا شتێکمان پێویست بوایە یەک دووانێک لەگەڵ یەک دوو ژاندارمە دەچوونە بازاڕو پێویستیەکانیان دەکڕی و دەهاتنەوە. سەرەتا ئەوان خواردنیان دەدایێ، پاشان چەند پێشمەرگەیەک کران بەچێشتلێنەرو لەهەر دەستەیەک ڕۆژی نەفەرێک دووان دەبوون بەخەفەر لەگەڵیان، بەمە جۆری خواردنەکەمان چاکتر بوو.

مانگانە نەفەری بیست تمەنیان دەدایێ بۆ حەمام و سابوون و شتی پێویستی، بەڵام خواردنمان بۆ دەکراو لەسەر مەسرەفی دەوڵەت بوو.

## خولی زمانی ئینگلیزی و مەرگی کاکەڕەش

ڕۆژێکیان لەسەربانی چێشتخانەکە وانەی زمانی ئینگلیزیمان دەخوێند، هاوارێک لەخوارەوە هەڵسا، کاتێک چووین کاکەڕەش هەرزانی کەوتە مەنجەڵە چێشتەکەوەو پاش شەو و ڕۆژێک شەهید بوو. هەر ئەوساش (خالید دلێر)ی شاعیرو نوسەر ئەم چوار دێڕە شیعرەی بۆ نوسی:

فەرزە لەسەر پێشمەرگە بۆ بەرزی کوردستانی

درێغی نەکا بەسەر، بەماڵ یا بەژیانی

ڕەفتاری وابوو شەهید کاکە ڕەشی هەرزانی

تا گیانی پاکی بەخشی نەمریی بەدەستهانی.

دواتر وایلێهات وردەوردە ڕۆژی دە پێشمەرگە دەنێردران بازاڕ بگەڕێن، بەڵام چەند کەسێکی ئێمەو چەند ژاندارمەیەک بەیەکەوە چاودێری هەڵسوکەوتی دەکردن، لەبەرئەوەی نەک لەگەڵ خەڵکدا نەگونجێین و شەڕ بکەن. پاش ماوەیەک ئاسایی بۆوەو کێ ئارەزووی بازاڕ یان گەڕانی هەبوایە بۆ هاوینەهەواری ئەباسئابادو دەوروبەری، دەڕۆیشتن. ئێمە چەند کەسێک بووین نەمان دەویست بڕۆینە بازاڕ، چونکە ئەو سەردەمە هەموو کۆلانێک چەند ماڵێکی ڕەسمی لەشفرۆشی تێدابوو، ئێمەیش هەندێکمان بێ ژن و ماڵ بووین، هەندێک هەبوو هەر کە دەچووە دەرێ تا ئەوێ نەدەوەستایەوە، ئەمە وایکردبوو ئێمەش لەچوونە بازاڕ سڵ بکەینەوە، بۆ سینەما یان گەرماو نەبوایە نەدەچووین بۆ بازاڕ. لەجیاتی ئەوە دەڕۆیشتین بۆ دەرەوەی شارو لەدەوروبەری هەمەدان گوندی کورد هەبوون هێشتا شوێنەواریان مابوو، دەماندۆزینەوەو قسەمان لەگەڵ دەکردن و ڕۆژمان لەناو باخەکان و لای جوتیارە کوردەکانی دەوری چیای ئەڵوەند بەسەر دەبرد. هەندێک ڕۆژ بەهاوبەشی هەندێک گۆشتمان دەکڕی و هەر لەو دەشتە سوورمان دەکردەوەو لەوێ نانی نیوەڕۆمان دەخوارد.

لەو ئۆردوگایەدا خولی خوێندنی کوردی، کاری کادری و ڕامیاری، جیهاز فێربوون، فێربوونی زمانی فارسی، کرابوونەوە، جگە لەوەی هەموو بەیانییەک ڕەئیس کەمال موفتی مەشقی پێدەکردین بۆ نەمردنی وزەی لەش، بەوە هەموو سەرقاڵبووین، شەوانیش ڕێگاکرایەوە بۆ خوێندن لەقوتابخانەی ئێرانی بۆ خوێندنی زمانی فارسی، زۆر کەس چوون و کەڵکیان لێوەرگرت، لەلای خۆشمان حاکم تەها بابان خولی فێرکردنی

زمانی ئینگلیزی کردەوەو من یەکێک بووم لەو پێشمەرگانەی ئەی بی سی (A.B.C)لەلای ئەو فێربووم و ئەنجام توانیم سوودێکی چاک چاک وەربگرم، کاتێک دەچووم بۆ سینەما ئەوەندەی لەفارسی تێدەگەیشتم، ئەوەندە زیاتر تەرجومە ئینگلیزیەکەیم دەخوێندەوەو تێدەگەیشــتم، ناوبەناویش ئەندامێکی ســەرکردایەتی هەموومانــی لەهۆڵــە گەورەکــەدا کۆدەکــردەوەو ڕووداوی ڕابردووی دنیاو کوردســتانی بۆ باســدەکردین، جیهازێکــی ڕاکاڵیش لەوێ خرابووە کار، یەک دوو کەســێکی خۆمان سەرپەرشــتیان دەکردو ڕۆژانە ڕووداوی نێوانــی پارتــی و حکومەتی عێراقی وەردەگرت. مەحمودی مەلا ئیسماعیل و عوسمان سەرمۆردی دوو عەدەد جیهازی زۆر کارامەبوون، کلیلــی جفرەکانیــان هەمــوو دەکــردەوە بــەو کارەشــیان ڕۆژانــە لەگەڵ ڕووداوەکانــی کوردســتان دەیانگەیاندینەوە یەکتــری و لێک دانەدەبڕاین. یەکەم جاریش بوو ئاوارە ببووین زۆر هەناســەی ســاردمان هەڵدەکێشــا وامانـدەزانی هەرگیز ڕۆژێک نایەت بڕۆینەوە کوردستانی خۆشەویستمان.

هــەر لەبواری خوێندن و خولەکانــدا ڕۆژێکیان چوومەوە ژوورەکەی دەســتەکەی خۆمان، لەســەر تەختە ڕەشــەکە باســێکی گرنگی سیاســی و ســتراتیژی خۆمــان نووســرابوو، بڕیاریــش بــوو جێگــری شــا یــان لێپرســراوێکی زۆر گــەورە لەتارانــەوە ئەو ڕۆژە بێتە لامان، هەســتم بەوە کــرد ئەوە بزانن ڕەنگە هەندێک لەپەیوەندیمان تێکبچێت، بۆیە کوژاندمەوەو لەســەر لاپەڕەی کتێبێکی فارســی شیعرێک نووســرابوو ئەوەم نووسی و بەجێمهێشت و چووم بۆ هۆڵە گەورەکە بۆ لای هاوڕێیەکەم، زۆر دانەنیشتم وتیــان: میوانەکان هاتن و چوونــە ژوورەکەی ئێوەوە، هەر لەخۆمەوە پێم ناخۆش بوو، کاتێکمزانی پێشمەرگەیەک بانگیکردم، منیش بەدوایدا ڕۆیشتم، مام جەلال و مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو مامۆستا عومەر دەبابەو هەندێکیتر لەگەڵ میوانەکان بەدیار تەختەڕەشــەکەوە وەستابوون، بەکابرای میوانیان وت: ئەم کوڕە ئەو خەتەی نوســیوە، ئەویش دەســتی خســتە سەرشانم و وتی: لێرە خوێندنی فارســی فێربوویت؟ وتم: بەڵێ. وتی: پێشووتر فارسیت نەدەزانی؟ وتم: نەخێر. سێ چوار جار وتی: بارەکەڵاو بەجانتا هەڵگرەکەی وت: (٥٠)تمەنی بدەنێ، هەرچەندە خۆی لەخۆیدا نرخێکی نییە، بەڵام بۆ ئەو ڕۆژە بۆ پێشمەرگەیەکی دوورە وڵات و بێدەرامەت و بەخەڵات پێی بدرێت کەم نەبــوو، پارەکەیان دامێ، هێشــتا میوانــەکان ڕەتنەبــوون هاوڕێکانم لێــم نزیک بوونەوەو دابەشــیانکرد لە نێوان خۆیانــدا، (٥) تمەنیان دا بەمن مەبەســتم ئەو هاوڕێیانەی ڕۆژانە بەیەکەوە هەڵســوکەوتمان دەکرد، بڕوا بکــەن ئــەو ڕۆژە نەچوومە بازاڕ بەیانــی هاوڕێیەکی چڵێــس هەبوو هات ئەوەشی لێسـاندم و ڕۆیشت خۆی خەرجیکرد.

جلوبەرگمان تەنیا شەروالێک و کراسێکی خاکیبوو کە لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوە بۆمان دەکڕدرا. ئەویش سارد بوو، پێویستمان بەسەربەرگ و فانیلە هەبوو، پارەشمان نەبوو بیکڕین، ناچار لەو ٢٠ تمەنەی مانگانە ١٠ تمەنیمان لەگەڵ دوو سێ برادەریتر یەکدەخست و هەر مانگە شتێکمان پێدەکڕی بۆ یەکێک تا سەربەرگ و فانیلەی زستانەمان تەواودەکرد لەکۆنە.

لەهەمەدان بەگشتی باشمان بەڕێکردو کەمترین کێشەمان بۆ دروستبوو، تەنیا جارێک نەبێت کوڕێک بەناوی شێخ عەزیز خەڵکی سلێمانی لەگەڵ یەک دووانێکی هەمەدان لێیان ببوو بەشەڕو ئەویش بەر چەقۆی دابوون، لەوە بترازێت کێشەی ئەوتۆمان نەبوو جێگای سەرنجی دەوڵەت و خەڵک بێت، بەڕاستی خەڵکی هەمەدانیش خەڵکی چاک و بەئەدەب بوون، شارێکی جوان و بێ کێشەبوو بۆ ئێمەی ئاوارە. شتێکی زۆر خۆش و سەرنجڕاکێش هەبوو بۆ ئێمە، ئەویش ئەوەبوو هەمۆو ڕۆژانی هەینی لەسەعات سێ بەدواوە لەناو شاری هەمەدانەوە هەتا سەیرانگای عەباسئاباد ئەمبەرو ئەوبەر خەڵکی سەماوەریان دادەناو بەڕەیەک، ڕاخەرێکیان دادەخست و نانی نیوەڕۆو ئێوارەیان لەوێ دەخواردو خۆیان و ماڵ و منداڵیان شاریان لەبیردەکردو هەرچی پەژارەیان هەبوو لەگەڵ هەوای ئازادیدا دەڕۆیشت. دیمەنێکی زۆر جوان کە تەنیا لەئادارو نیساندا وێنەی جوانی لالەو گوڵی گاگرۆ و نیسان و مەشقان و قەسپەو جۆرەها وردیلە گوڵیتر کە ئەو دوو مانگەی بەهاری لای خۆیان هەبوون.

کەم یان زۆر نەخوێندەوارەکان خۆیان فێری خوێندەواری کرد، ئەوەشی یەک زمانی دەزانی لانیکەم بوو بەدوو ئەگەر نەبووبێت بەسێ زمان، سەرەڕای ئەوەش لەخولی کادراندا ئاستی زانستی سیاسی بەرز ببۆوە.

کۆمەڵە خەڵکێک کە ژمارەمان (٤٧٠) کەس دەبوو تەباو هاوباوەڕو برا بووین. ماوەی ساڵێکی ڕێک ئاوارەبووین، ئەگەر بمانبیستایە کە هێزێکی سەربازی دوژمن لەکەرکوکەوە بۆ ناوچەی هێزی پێشمەرگە هاتووە هەموو دڵمان دەگوشراو دەمانزانی دڕندەکان ئازاری خەڵکی کوردستان دەدەن.

ناوی هەندێک لەهەمەدانییەکان:

١. مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی
٢. شەهید عەلی عەسکەری
٣. ئیبراهیم ئەحمەد
٤. حلمی عەلی شەریف
٥. ڕەئیس کەمال موفتی
٦. عەبدوڵا عەسکەری
٧. ئیسماعیل سەرهەنگ
٨. جەعفەر عەبدولواحید
٩. موسا درێژ بادینی
١٠. حاجی عەزیز
١١. وەستا شێخ محەمەد
١٢. عومەر شەقڵاوەیی
١٣. هادی شێرە
١٤. محەمەد حەزیە
١٥. عابید محەمەد عەبدوڵا
١٦. نوری محەمەد عەبدوڵا
١٧. هێدی ئیسماعیل
١٨. حسێن عەبدولرەحیم
١٩. بارامە درێژ
٢٠. عومەر سۆفی
٢١. سەلمان ئاغا
٢٢. جەوهەر گەزنەیی

٧١. حەمەدەمین مام کەریم قەمچوغەیی
٧٢. حەمەدەمین مام نەجیم سەرمۆردی
٧٣. حەمەسەعید قەمچوغەیی
٧٤. نوری کاکە میر
٧٥. مامۆستا جەلال کەریم
٧٦. ڕەئیس حەمەدەمین
٧٧. هەرزانی ئەفەندی
٧٨. حەمید کاکەمەد(حەمید پۆلیس)
٧٩. شێخ عەزیز
٨٠. سەید حەسەن گەڵنێری
٨١. کەریم جەوهەر
٨٢. حەمەدەمین
٨٣. فازل چلێت
٨٤. شەهید کاکەڕەش هەرزانی
٨٥. ئیبراهیم جەلال
٨٦. حسێن ڕەزا
٨٧. شەهید تالیب ڕۆستەم
٨٨. زرار عەلی حسێن شەدەڵە
٨٩. شێخ سەردار شێخ سدیق
٩٠. ڕەشید سەرمۆردی
٩١. عەلە کەڕی سەرمۆردی
٩٢. حاجی حەمەدەمینی سەرمۆردی

٢٣. چەتۆ گەراویی
٢٤. غەریب خدر
٢٥شەهید جەمیل بەکر(جەمیلە کوێر)

٢٦. حەمید رەشاش
٢٧. ئەنوەر چوخین
٢٨. عەریف موحسین
٢٩. خاڵە سەید مەجید
٣٠. مامۆستا خالید دلێر
٣١. ئەسعەد شێخ بزێنی
٣٢. ئەحمەد شێخ بزێنی
٣٣. مامۆستا مەلا موسا
٣٤. حەمید سووری
٣٥. ئیبراهیم سووری
٣٦. سەعید مەسیفی
٣٧. خالید ئاژگەیی
٣٨. مستەفا ڕابەر
٣٩. ئەحمەد ڕەشید
٤٠. ئەحمەد عەبدوڵا(ئەحە کوێر)
٤١. عوسمان عەلی حەوێز
٤٢. ئەحمەد مستەفا
٤٣. خورشید حەمدی
٤٤. مامۆستا حەمەدەمین قەمچوغەیی

٩٣. عوسمان بێدەری
٩٤. شێخ حسێن سەرگەڵویی
٩٥. شێخ عەبدولڕەحمان سەرگەڵویی

٩٦. شێخ ڕەئوف عەسکەری
٩٧. مام ساڵح مالومەیی
٩٨. هادی ئەحمەد
٩٩. دکتۆر حەسەن
١٠٠. دکتۆر حسێن
١٠١. مەلا عەبدولڕەحمان ئاوبارەیی
١٠٢. وەستا سدیق
١٠٣. تالیب مامە سەلام
١٠٤. وریا شوانی
١٠٥. شەهید بێستون مەلا عومەر
١٠٦. دکتۆر ئەحمەد شاڵی
١٠٧. نەوزاد سدیق کەرکوکی
١٠٨. نەوزاد خەیات
١٠٩. بلەی سەعە کەڕ
١١٠. قادر خەراجیانی
١١١. عەلی مام ڕەزا قەڵادزێی
١١٢. کەریمی حەمەی حەلێ
١١٣. مەلا قادر ڕانیەیی
١١٤. مامۆستا جەلال عەزیز

٤٥. زیاد مەجید میسری

٤٦. سەلامی مەلا سابیر

٤٧. حەمەی سارۆ

٤٨. بەکری سارۆ

٤٩. عومەر سام سام

٥٠. قالە سوور

٥١. حەمەئەمین سمێڵ

٥٢. نەوزاد عەلی

٥٣. فەرەیدون عەلی

٥٤. ئەحمەدی حەمکۆڵ

٥٥. شەهید حەسەن خاوێ

٥٦. شەهید حەسەن کەوەڵەیی

٥٧. مەلا خدر سەرمۆردی

٥٨. مەلا حسێن مەحموود

٥٩. عەباس حسێن

٦٠. سەید ئەحمەد مفەوەز

٦١. مەلا ناسیحی سەرکردایەتی

٦٢. عەریف نامیق

٦٣. شەهید نوعمان کەرکوکی

٦٤. شەهید عەبدولخالق مەعروف

٦٥. فاتیح شوانی

٦٦. مەلا حەمەدەمین چەمچەماڵی

١١٥. مەحموود مەلا عیزەت

١١٦. عەزیز بەگ کۆیی

١١٧. مەحموود مەلا ئیسماعیل

١١٨. تەها بابان

١١٩. عەریف یاسین

١٢٠. عومەر دەبابە

١٢١. ڕەسوڵ قەمچوغەیی

١٢٢. کاکەڕەش ئەفەندی

١٢٣. ملازم سوبحی

١٢٤. پەروێز مەریوانی

١٢٥. دارای مەلا عەبدوڵا

١٢٦. محەمەد یاوەر

١٢٧. جوامێر مەلا عەبدوڵا

١٢٨. مەجید کەریم ئەحمەد (غاندی)

١٢٩. حەمید کەریم

١٣٠. عەزەی حەمەی خەندان (خەنان)

١٣١. نەسرەدین ڕۆژبەیانی

١٣٢. عەزەی حەوە

١٣٣. کاکەی میللەت

١٣٤. ئەورەحمان زەلکەیی

١٣٥. محەمەد کوێخا سەعید

١٣٦. شەهید غازی محەمەد حسێن

٦٧. غەریب سەعید

٦٨. عەلی بچکۆل

٦٩. عەریف ناسیح کەرکوکی

٧٠. شەهید مامۆستا جەلال کەریم

١٣٧. رەحمان سەلام

١٣٨. مامە عەزە میرزا کەریم

١٣٩. دارا مامە عەزە لیرزا کەریم

١٤٠. محەمەد سەنگەری

## گەڕانەوە لەهەمەدانەوە

ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم لە ١٧ مایس هەڵیان بڕین یان ١٧ نیسان بوو، هەروەها لە ١٨- ٢٠ نیسان یان مایسدا گەڕاینەوە، بەڵام کاتێک گەڕاینەوە بەدوو بەش. ماوەیەکی زۆر شێخ عەزیزی شەمزینی و کۆمەڵێکی زۆر خەڵکی نیشتمانپەروەر لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی قسەیانکرد کە ڕێگە بدەن مەکتەب سیاسی و پێشمەرگەکانی بگەڕێنەوەو بەشداری شۆڕش بکەنەوە، کاتی خۆی مەکتەب سیاسی دەیوت حکومەتی عارف و یەحیا هیچ بەکورد نادەن، سەرۆکی پارتی دەیوت نا هەموو شتێک وەرگیراوەو ئێوە لێناگەڕێن، وا ئێستا دەرکەوت ئێمەش ڕێگر نەبووین و ئەوانیش جارێکیتر پەلاماری کوردستانیان دایەوە، ئێمە وەکو کەسانی نیشتمانپەروەر هەڵوێستی خۆمان نیشان دەدەین و بێ مەرج دەگەڕێینەوەو دەمانەوێت بەشداری شەڕی سەنگەر بەسەنگەر لەگەڵ ئێوەو خەڵکی کوردستان بکەین، بەڵام سەرۆکی پارتی زۆر پێی دادەگرت و هەر ڕێگای نەدەدا بگەڕێینەوە، دەوڵەتی شاش زەختی کرد ڕێگامان بدەن، ئەوسا ڕێگەیاندایین بگەڕێینەوە، بەمەرجێک لەکوێ دامان بنێن نابێت ناڕازی بین، مەکتەب سیاسی بەوەش ڕازی بوون، سەرەتا شەهید عەلی عەسکەری و ڕەئیس کەمال موفتییان لەگەڵ هێزێکدا بەڕێکرد، هەر کە گەیشتنەوە بەشداری شەڕی زۆزگ و هەندرێنیان کردو لەپڕێکدا (٨) پێشمەرگە شەهید بوون بێئەوەی پاش ئاوارەیی بۆ تاکە چرکەیەکیش کەسوکارو ناوچەی خۆیان ببینن، لەجیاتی ئەوەی ڕێزیان لێبگرن و یەکی مانگێک ئیجازەیان بدەنێ و دڵنەواییان بکەن و دەریبخەن کە هیچ شتێک لەدڵیاندا نەماوە، هەر دوابەدوای شەڕی زۆزگ و هەندرێن بەش بەشیان کردن و تاک تاک و دەستە دەستەیان کردن و زەختیان لێدەکردن کە جوێن بەئەندامانی مەکتەب سیاسی بدەن و ئەوەی جوێنیشی نەدابایە، خۆی دووچاری محارەبەیەکی نەفسی گەورە دەکرد.

پاڵەپەستۆیەکی وەها خراپیان لەگەڵ ڕابەرەکانی ئێمە دەکرد گیانی ئەوەیان لا دروستکردبوون کە خێراو بێدواکەوتن بیر لەداڕشتنەوەی ڕێکخستنی سیاسی سەربەخۆی جیا لەپارتی بکەنەوە.

بەشی دووەمیش بەسەقزو بانەدا گەڕاینەوە لەوێ لەجیاتی بەرد، گوڵیان تێدەگرتین و هاواریان دەکرد هەر ئێوە ڕاستبوون هەر ئێوە بژین، چووینە بلەکێ و لەوێ هەموو چەکەکانی کە لێیان وەرگرتبووین بۆیانهێناینەوەو ئەوەی نەشمابوو چەکیتریان داینێ لەجیاتی و بەڕێکەوتین بەرەو خانەو لەوێوە بۆ دەوری چۆمان، پاشان بردیانین بۆ گوندی خوشکان، هەفتەیەک تەنیا مەکتەب سیاسی لەوێ بوو، باقی هێزەکەیان برد بۆ دەوروبەری

سەرکەپکان و سەروچاوەو لق لق بەجیا خستنیانە ژێر چاودێرییەوە. پاش هەفتەیەک چاودێری لەگوندی خوشکان بەبروسکەی سەرۆک بارزانی براین بۆ گوندی پڵنگان لەلای پیاوێک دایان نایـن چاودێریمان بکات ناوی مەلا حسێن بوو، پاش چەند هەفتەیەک لەپڵنگانەوە براینە دۆڵەڕەقەو لەوێ لەمبەروبەری چەمەکەوە مقەڕمان دامەزراند، ئەوسا کاک عەلی عەسکەری و مامۆستا حیلمی عەلی شەریف، کاک عومەر دەبابە، مام جەلال لەوێ بوون، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد نەهاتبۆوەو هەر لەئێران مابۆوە.

کاک نوری شاوەیسی ڕەحمەتی و کاک عەلی عەبدوڵا کە ئەوانیش ئەندامی سەرکردایەتی پارتی بوون و کاتی خۆی وەکو دەستبەسەر لای بارزانی مابوونەوەو نەهاتبوون بۆ ئێران، بەڵام پەیوەندی هەمیشەییان بەم چوار برادەرەوە هەبوو، ئەم برایانە بۆیە هێندرانە دۆڵەڕەقە لەژێر چاودێری ڕەحمەتی عەباسی مەمەند ئاغادا بن، بەڕاستی عەباس ئاغا هەرچەندە ڕەئیس عەشرەت بوو بەڕاستی پیاوێکی بەکەڵک بوو قەت وەهای نیشان نەدەدا کە ئەم برایانە بوونە بەئەرک بەسەریەوە.

من ئەوسا پێشمەرگەیەکی سادە بووم لەدەستەی مام جەلال، دەستەکەمان ١٥ کەس دەبوو، ئاگاداری ئەوە بووم کە لەلایەن بارزانی مستەفاوە بروسکە هات داوای هەر چوار ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی دەکرد، دووان بۆ لای بارزانی مستەفاو دوان بۆ لای ئیدریسی کوڕی، برادەران مەترسیان هەبوو لەچوونیان بۆ ئەو سەفەرە، پێموایە عەباس ئاغاش شتێکی ئیشارەت کردبوون، کەوتنە هاتوچۆی لای کاک نوری شاوەیس و کاک عەلی عەبدوڵا بۆ لای ماڵی عەباس ئاغاو پێدەچوو زنجیرەیەک کۆبوونەوەیان لەگەڵ کردبن و نەگەیشتبنە یەکتری، لەسەر ئەوەی پارتی مەکتەب سیاسی ڕێکخراوی خۆی نوێبکاتەوەو دەست بکەن بەکاری نهێنی و شاخ بەجێبهێڵن و بڕۆنەوە ناوشار.

ئێوارانێک هەور بوو، نمەنمە باران دەباری، مام جەلال و عەلی عەسکەری و حیلمی عەلی شەریف و عومەر دەبابە ڕۆیشتن بۆ ماڵی ئەنوەر بەگی بێتواتە، هەر لەو دۆڵەی سەرکەپکان، ناوی گوندەکەم لەیاد نەماوە ئێمەش کە دەستەی مام جەلال بووین ئاگادار کراینەوە درەنگێ بڕۆین بۆ ئەوێ، نەماندەزانی چییە، بەڵام دەمانزانی جووڵە جووڵێک هەیە. کاتێک چووینە ماڵی ئەنوەر بەگ هەموو پێشمەرگەی دەستەکانی برادەرەکانیتر هاتبوون، ئەو ڕۆژەش مام جەلال و هەڤالانی لەگەڵ عەلی عەبدوڵاو نوری شاوەیس لەبەرچاوی خەڵکی و لەماڵی عەباس ئاغا قڕەقڕیان کردبوو جا نازانم تاکتیک بوو بۆ دوارۆژی ئەو دووانە، یان بەڕاست لە یەکتر تووڕەبوون و قسەی بەرزونزمیان بەیەکتر وتبوو.

## بەجێهێشتنی دۆڵەڕەقە

بۆئــەوەی فەرامۆشــی نەکەین ماوەیــەک بوو دۆڵەڕەقــە خرابووە ژێر چاودێری و یەک پەل پێشمەرگەی بارزانی جامانە سوور هێندرابوونە پشت قوتەڵ، بۆئەوەی لەنزیکەوە چاودێری جموجووڵی ئەندامانی سەرکردایەتی مەکتەب سیاسی بکەن.

بارانەکە لەنمەنمەوە زیادیکرد، تاریکی دەستی پێکردبوو، کۆیانکردینەوەو پێشمەرگەکان ڕیزکران و ناوی نهێنی داندراو بەپشتی ئەو هێزە بارزانیەدا بەڕێکەوتین، ئێشــکچیەکەیان نەیدیبووین، بەڵام هەســتی بەچرپە کردبوو، هاواریکــرد کێــن، برادەرێکمان لەگەڵ بوو بەناوی خورشــید حەمە ئەویش شــەهید بوو، وەڵامیدایەوە کە خۆمانین، کابرا بێدەنگبو و ئێمەش تێپەڕین. باران ئەویش و ئێمەشی شپرزە کردبوو، بۆیە لەسەری نەڕۆیشت و ئێمەش بێدەردیســەری تێپەڕبووین. دنیا سارد بۆو لەمانگەکانی ئاخری ساڵ بوو. قوڕی بیتوێن بەناوبانگە، پێڵاوەکانمان تەڕ ببوو، قوڕە لینجەکە ڕایدەکێشاو پێڵاوەکانمان دادەکەندراو پێمان دەچووە ســەر زیخەڵانەکەی ڕێ، هەندێک وردەبــەرد بە قاچماندا دەچوو وەخت بــوو کوێراییمان دابێت، کاک حیلمی شەوکوێر بوو، شەهید عەلی دەیزانی هەر دەچووە بن دەستی و بەلای خۆیدا بەکێشــی دەکرد. من پێڵاوەکانم لێبەجێما، لەقــوڕا چەقی و بۆم دەرنەهات، دوو جــووت گــۆرەوی زیــادەم پێبوو، بەســەر یەکەوە لەپێمکــردن، بەڵام سوودی نەبوو، سەرەڕای ئەوەی لەسەرما ڕچی بوون، ئازاری زۆریشیان دەدام، بــاش بوو قۆناغی یەکەممان ماڵێــک بوو لەگوندی کفرەدۆڵ لەخوار گونــدی ســەرکەپکانەوە، ماڵێکی حەوشــە گەورەبوو لەدەرگاکــە چووینە ژووری، زانیمــان تراکتۆریان هەیە، هەموو چووینە هەیوانێک کە ژوورێکی لەبەردەمــدا بــوو، ئەو چوار بــرادەرە چوونە ژوورەوە باقــی لەهەیوانەکە ماینــەوە، بارانیش هەر دەباری، ماڵەکە نەیانوێرا ئاگر بکەنەوە هەتا چراش لەهەیوانەکە هەڵبکەن، هێشــتاش برســی نەبووین بۆیە نانیشمان نەخوارد. ئەوانی ژوورەکە هەڵاژان ئەوەی هەیوانەکەش دوو ئێشکچی دانراو ئەوەیتر پشــتمان کردە یەک، بەڵام لەشــمان تەڕبوو خراپتر بــوو نەماندەزانی چی بکەین. ســەعاتێک دووانی مابوو هەتاو بکەوێت، دوو تراکتۆر یەکێکیان بێ عەرەبانە هەر چوار ئەندامانی ســەرکردایەتی سواربوون، ئەوەیتریشان کە عارەبانەی هەبوو پێشــمەرگەکان سواری بوون ڕوو لەچوارقوڕنە کەوتینە ڕێ، پاشــان ڕوو لەبناری کۆسرەت ڕۆیشــتین و لەخدران ڕەتبووین ڕوو لەئالیقەکان، پاشــان گەیشــتینە گوندی چناران، ئەوسا ماڵی مەحمود ئاغای کاکە زیادی کۆیە لەو گوندەبوون، هەموومان بووین بەمیوانیان و مەحمود

ئاغاش لەبارەگای بارزانی بوو، هەتا سەعات چواری دوانیوەڕۆ پاشان، ڕوو لەلوتکەی شاخی کۆسرەت بەڕووکاری دوکاندا کەوتینەڕێو تاریک داهات بـەرەو بەری کەڵکەسـماق و لەوێشـەوە بۆ گوندی سـارتکە بەڕێکەوتین، چووینــە ماڵی شـێخ قادر شـێخ مارف سـارتکەیی. ئەوان دۆسـتی ئێمە بوون و خزمی شـەهید عەلی عەسکەری بوون، ئێمە زۆر ماندوو ببووین، چونکــە لەو لاپـاڵ و ناوڕەزانــەی بەرمالآنی کەڵکەسـماق و سـارتکەوە زۆر هەڵدێرابووین و هەڵدەسـتاینەوە، زۆر برسـیمان ببـوو چاوەڕوانی ئەوەمـان نەدەکـرد چەند مریشـکێک سـەربڕن و پلاوێکـی چەورمان بۆ لێبنێن، چونکە لەوانە خۆشـتر نانە ڕەقێکە بەجامێک ئاوەوە یان بەچایەکی شیرینەوە، لەبرسان ئەوە زۆر خۆشتر بوو لامان، بۆیە هەموو یەک دەنگ هاوارمانکرد نان و چایەکی بەپەلە بۆئەوەی سەرخەوێک بشکێنین تا ڕۆژ نەبۆتــەوە. ئەوانیش یەک هیزە دۆشـاوی ترێی ڕەشـیان هەبوو بەجامی گەورە گەورە بۆیان تێکردین و خۆمان تێدا شـەهید کرد، تێرمان خواردو هەر کەسە لەلای خۆیەوە بەتاقم و تفەنگەکەیەوە گورگە خەوی کردو چەند برادەرێکیش دوو دوو بوونە ئێشکچی، بەیانی کاتژمێر چوار هێشتا چۆلەکە نەکەوتبووە جریوەجریو هەڵیانسـاندین، دوو هێسـتریان بارکرد لەچوپ و بەرمیل و لەولاشـەوە قەلەمونێکی گـەورەو کاوڕێکی چاک ئامادە کرابوو، بەلاوێکـدا لەدوامانــەوە هێنایان ڕوو لەسـەر زێو تەنگەبـەری پەنجە، کە شوێنێکە بەردەڵان و دەم زێی دوکانەو ئەمبەرەوبەری شاخەکەیە ڕێگایەکی پیادەیـەو بەگوێدرێـژ نەبێت هاموشـۆی ئۆتومبێلی پێدا نەدەکـرا. لەکۆندا شوێنی لەمەکۆدانی ئاژەڵی دزراوی ناوچەکە بووە، ئەوێ سەنگەری شەڕی دزەکان بووە، لەگەڵ ئەوەی بنکەی حەوانەوەو پشوودان و ساغکردنەوەی دزیەکەیـان بـووە. لـەزێ پەڕینــەوە بەری تــەلان و لەناو چـڕی پەنجەدا خۆمان دا بەزەویدا.

دووان لەپێشمەرگە گورجوگۆڵەکان لەگەڵ خوشکەزاکەی شێخ قادردا کە ناوی حسێن بوو، کاوڕەکەیان سەربڕی، لەگەڵ قەلەموونەکەو پاش پۆڕینەوە خرانە مەنجەڵەوە بەجیاو بەدارو چیلکەی وشک و بێدوکەڵ خرانە سەر ئاگر. قاچ و ورگ و سـەری کاوڕەکە بەدوو سـێیەک کە نەخەوتبووین ئاگرێکی چاکمان کردەوەو بەزمەی تفەنگ دەسـتمانکرد بە هەڵکڕوزان و برژاندنی. بڕوا بکەن هەتا برادەران هەڵسان و خواردن پێگەیی، کەم شوێنی سەرو پێو قاچ و فاتەڕەشـەو گەدەی کاوڕەکە مابوو ئەوەیتریمان گورگئاسـا خوارد، لەیادمە مام جەلالیش لەگەڵمان بەشداریکرد لەکڕانەوەی سەرو پێیەکەی.

## ژیانم لەشاری چەمچەماڵ

هەر ئەوەندە لەچەمچەماڵ دامەزرام خانوویەکی چۆڵم گرت بەکرێو هەندێک کتێبم هێناو دەستم کرد بەخوێندنەوە، دەچوومە ناو خەڵکی بۆ دروستکردنی بنکەی ڕێکخستنی کۆمەڵە، لەژێرەوەو لەولاشەوە زەختم لەپارتی دەکرد خێرا ڕێکم بخەن لەناوچە، بەڵام ئەوان بڕیاری خۆیان زوو دابوو بەهیچ شێوەیەک نەیانهێشت بڕۆمە ناوچەو لە شانەیەکی سەرەکیدا دایاننام و منداڵێکیان کردبوو بەلێپرسراوم کە هیچ شتێکی نەدەزانی. من لەهەموو کۆبوونەوەیەکدا کۆمەڵێک پرسیارم لێدەکرد هیچی وەڵام نەدەدایەوە، هەمووی بەڕێدەکرد بۆ ناوچە، ناوچە تێگەیشتن منم، دەیان نووسی با ئەو برادەرە بێت لەناوچە بۆمان شەرح بکات نیاز لەو پرسیارانە چییە؟

چوومە ڕێکخراوی لاوانی دیموکراتی کوردستانەوە هەروەها چوومە نقابەی کرێکارانی چەمچەماڵ و لەگەڵ کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی دەستەی چەمچەماڵ بەشداریم کرد، خولاسە ببووم بە ئاردی ناو درک هەمووشی بۆ ئەوە بوو باشتر بڕۆمە ناو خەڵکی و خەڵک ڕاکێشم بۆ کۆمەڵەو شانە شانەیان بکەم و لەحەڵقەی ڕۆشنبیرییەوە دەستپێبکەم، هەر وەهاشم کردو سەرکەوتنی چاکم تێدا بەدەستهێنا. لەغاباتەکەی چەمچەماڵ ژمارەیەکی چاکمان کرێکار ڕێکخست لەڕێی جوانەمەرگ کوردە محەمەد ئەفەندییەوە واتە (هەڵگورد)، لەلاوانیشدا بۆ کۆنفرانسی یەکێتی لاوانی کوردستان کە لەهەولێر بەسترا بەسەرپەرشتی شەهیدی نەمر مامۆستا ساڵح یوسفی بەهەڵبژاردن لەناوچەی چەمچەماڵ من بووم بەنوێنەری کۆنگرێس لەساڵی (١٩٧٤)دا.

لەکۆمەڵەی هونەرو وێژەش هەندێک لاومان لەخۆمان نزیک کردەوە لەهەموو بوارەکاندا دۆستمان بۆ کۆمەڵە پەیداکرد، سەرەڕای ئەوەی هەندێک لەکادرەکانی پارتی کە لەلادێکاندا بوون و بۆ کۆبوونەوە دەهاتن بۆ ناوچەی پارتی دەمگرتن و دەمبردنە لای خۆم کتێبم دەدانێو دەمخستنە بەردەمی پرسیارو وەڵامێکی زۆر. هەندێک لەوانەش بەکەڵکمان دەهاتن بۆئەوەی نەکەوینە ژێر چاودێری پارتی و هەندێکیشیانمان ڕێکخستن لەکۆمەڵەدا، لەوەش باشتر لەناوچەی سەنگاو و لەسورداش و لەبازیان و لەقەڵاسێوکە شانەی ڕێکخستنی کۆمەڵەمان دامەزراندو هەمووی پەیوەندیان بەخۆمەوە هەبوو.

بەڕۆژیش لەمەکینەی کارەباکەی چەمچەماڵ دەوامم دەکرد، بەڵام سێ وەخت و چوار بەش بووین لە ٨ بەیانی بۆ ٤ ئێوارە لە ٤ بۆ ١٢ شەو لە ١٢ شەو بۆ ٨ بەیانی، وەهامان ڕێکخستبوو کە ئەگەر یەکێک کاری

هەبوو بۆ هەشــت ســەعاتەکەی ئامادە نەبوو دائیرە ئــاگادار نەکەین و ئەو بــرادەرەش لەوێیە خۆی کارەکە هەڵســوڕێنێت، بۆ کاری کۆمەڵەش بەنهێنی دەچوومــەوە بۆ کۆبوونەوەو هەر ئــەو ڕۆژەش دەگەڕامەوە بۆ چەمچەماڵ، بەمشــێوەیە کارماندەکرد، کاتێک چووین بۆ کۆنگرێســی لاوان و گەڕاینەوە چەمچەماڵ، زۆری نەخایاند شەڕ دەستی پێکردەوەو ئەوسا کتێبەکانم لەکۆڵم گرێــداو بەرەو گوندی عەســکەر کەوتمەڕێ. هەر لەو سەردەمانەشــدا بوو یەکێتــی قوتابیــان لەگوندەکاندا دەگەڕان و کاریان لەگــەڵ جوتیاران دەکرد، بەرنامەیــەک بــوو یەکێتی قوتابیانی گشــتی پێی هەڵدەســتا. لەو بوارەشــدا برادەرانی کۆمەڵەی تێخزابوو زۆریشیان دەوری لێپرسراویان پێ سپێردرابوو، ئەوەی لەدێهاتدا لەگەڵ جوتیار دەکرا زۆربەی بیروباوەڕەکانی کۆمەڵەبوون جێبەجێ دەکران. یەکێک لەو قوتابییە ژیرانە شەهید ئازاد هەورامی بوو، پێش ئەوەی چەمچەماڵ بەجێبهێڵم هاتە لام و وتی: دەڕۆم بۆ ناوچەی قەڵاسێوکە لــەوێ چیبکەم؟ ناوی نهێنی خۆشــی لەڕێکخراوی کەرکوکەوە بۆ هێنابووم، منیش هەندێک هاوڕێی ئەو ناوەم بۆ دەستنیشــان کردو ناوی هەندێک ماڵی خزم و برادەری تایبەتیشــم دایە، بۆ کاتی پێویســت. کاتێک شــەڕ دەســتی پێکردەوەو ئێمە چەمچەماڵمان بەجێهێشت کە چوومە گوندی دایک و باوکم، ڕوانیم شــەهید ئازاد تۆوێکی چاکی چانــدووەو لاوێکی زۆری گوندەکەمانی لەخــۆی کۆکردۆتــەوە، ئــەو کاتانەش تەنیــا کادری جوتیاری ئێمە شــەهید عەلی مەجیدە جاف بوو، پاشان خۆشم کەوتمە ئەو ناوەو دوا بەدوای ئەوە ئەمین کەریم (شــێرکۆ)ش هاتە ئەو ناوە. لەوێ لیژنەیەکی ســێ کەســیمان دروســتکرد بــۆ کاری کۆمەڵــەو ئــەو هاوڕێیانــەی لەقوتابیانیــش بــوون کۆمانکردنــەوە لــەدەوری خۆمان و لەخانووەکەی ماڵی ئێمەدا دانیشــتین و بەنهێنــی کارمان بۆ کۆمەڵە دەکرد، بەڵام باری ئابووریمان خراپ بوو. بۆیە مــن چووم بۆ چۆمان لــەوێ وەزارەتی بەلەدیە هەبوو نیــوە یارمەتی دەدا، ناوەکــەی خۆمداو پاش شــەوو ڕۆژێک چاوەڕوانی نامــەی وەرگرتنی نیوە یارمەتیــم وەرگرت، ئەوەبوو بە ســەرچاوەیەک بۆ ئەوەی هەر ســێ لامان بەتایبــەت من و شــەهید ئــازاد پێی بژیــن. وردەوردە کاری ڕێکخســتنمان جوڵاندەوەو دەچووینە ســەر جوت و درەو و زەرعات و هاوکاری خۆڕایی خەڵکمــان دەکرد لەســەربان ســواغدان و قوڕکاری و لەکاتی نەخۆشــی و سەرئێشــاندا سەرمان بەلای هەموو کەســێکدا دەکردو هەوڵمان دەدا دەواو دەرمانی بۆ پەیدا بکەین، کارێکی ئەوەندە دڵســۆزانەو نەترســانەمان دەکرد گوندی عەســکەر ببوو بەبنکەیەکی بەهێز بۆ کۆمەڵە. چونکە زۆر تێکەڵاوی خەڵکەکە ببووین هەموو بەیانیەک کە لەخەو هەڵدەســتاین دوو پەنجەرەمان هەبوو شووشــەیان پێوە نەبوو، بەیانیان جوتیارەکان ماســت، هێلکە، ژەمە کــەرە، تەماتە، هەنجیر، هەنار ئەو شــتانەیان لەپەنجەرەکاندا دادەنا بێئەوەی

بزانیــن کێ داینــاوە. کاتێک بۆ قاپــەکان دەهاتنەوە دەمانزانــی کێ هێناونی، لەبــارەگای بەتالیۆنەکانــی پارتیشــدا خەڵکی بەدەســەڵات هەبــوون لەکاتی هاتوچۆ لەناوچەیەک بۆ ناوچەیەکی تر پســوڵەی ڕێگامان بەمۆری بەتالیۆن دروســتدەکرد بەبێئەوەی بزانن چۆنکراوە. لەبەتالیۆنی (٥) کە شــەهید نازم حەمەی سلێمان فەرماندەی بوو، شەهید عەلی مەجید لەبارەگاکە بەدۆستایەتی وەرەقەی دەهێنا تا عەریف تالب مۆریاســی بوو بەجێگری بەتالیۆن، ئەوســا ڕێکخــراوی کۆمەڵــە نــاوە نهێنییەکەیان دامــێو پەیوەندیم پێــوە کرد، ئیتر فیشــەک و وەرەقەو پێویستی وردەمان ئاســان بۆ جێبەجێدەبوو. شەهیدان عەلی حســێن (شوان) ئەحمەد عەســکەری و (صادق بەهادین) خەڵکی بەغدا بوو، کۆمەڵێکی زۆر لەناو قوتابیان و لاواندا هاوکاری چاکیان دەکردین، لەوانە شەهید نەجم عەزیز کەرکوکی و محەمەد عەزیز، کە ئێستا حاکمەو بورهان کەرکوکی و مامۆســتا عەبدوڵا عەبدولقادر برازای شەهید عەلی عەسکەری، بەهەموومان ناوچەی قەڵاســێوکەمان جوڵاندبوو، بیروباوەڕی کۆمەڵە لەناو پێشمەرگەو لەناو جوتیاراندا ڕەنگی دابۆوە:

من کرام بەنوێنەر لەنێوان سەرکردایەتی کۆمەڵەو ڕێکخراوی کەرکوک، کە ئەوسا ئیحسان نەجم (ئەبوشەهاب) بەرپرسیاری بوو، دەبوو هەواڵ بدەمەوە بەســەروو، وەڵامی سەرووش بدەمەوە بەشار، جگە لەوەش لەگوندی تۆمار هاوڕێیەکمان هەبوو بەناوی (مەلا ناسیح مەجید) جوتیارێکی زۆر کارامەبوو لەو کاتانەدا تاریق ئەحمەد فەوجێکی مغاویری بۆکرابۆوە لەلایەن حکومەتی عێراقــەوە هەموو ڕۆژێک پەلاماری دەوروبــەری کەرکوکی دەدا، بە تایبەت ناوشوان، بۆ خۆڕزگارکردن لەدەست هێرشی جەیش و جاش هاوڕێ ناسیح لەناو چەمەکەی سەر ماڵەکانی تۆماردا کونی هەڵکەندبوو، سەری بەدرکوداڵ گرتبوو، لەکاتێکدا جەیش و جاش بڕۆیشتنایە سەری هەستیان نەدەکرد یان ئاگریشــیان لەکۆمەڵە توترکەکە بەربدابایە ســەربانەکەی ئەوەندە ئەستوور کردبوو لەناوەوە دەپارێزرا. لەکاتی سەردانم بۆ تۆمار ئەو کاتەی دەگەیشتم دەبوو شــەو بێت، بەڵام ئێواران چاکتر بوو، کاتێــک لەوێ دەگەڕامەوە هەر دەبوو دوای نیوەڕوان بێت، چونکە بە دەست ئەو فەوجەی تاریق ئەحمەدەوە ناوچەکە وەزعی هەمیشە لەمەترسیدا بوو، پاش تۆمار دەبوو بڕۆم بۆ گوندی تۆپزاوا لەوێش حەمید محەمەدی لێبوو لەگەڵ عەلی مغاویر کە هەردووکیان دوو هاوڕێی کۆمەڵەبوون. هەر لەڕێی ئەوانەوە نامەکان دەگەیشتنە ئیحسان نەجــم یان دەمنارد ئیحســان خــۆی دەهات لەوێ ڕامان لەســەر شــتەکان دەگۆڕیەوە.

## سەردانی ڕێکخستنەکانی گەرمیان

لەسەردانەکانمدا زۆرجار دووچاری پەلامارەکانی جاش و سەرباز دەبووم، یەکێک لەجارەکان ماڵ و منداڵی کاکە عەبدوڵام لەشارەوە هاتبوون بۆلام، جگە لەوە ماڵ و منداڵی عومەری برازاشم و عومەریشم لەگەڵ بوو، لەتومار لەسەربانی ماڵی مەلا ناسیح خەوتبووین. بەیانی هێشتا هەتاو هەڵنەهاتبوو، سەربازو جاش هاتنە سەرمان، من و عومەری ڕەحمەتی و عەلی مغاویرو ناسیح لەسەربانەکەوە خۆمان هەڵدا بۆ ناو ئاشەکەو ڕۆیشتین، لەوێ باراشهاڕەکە زۆری لێبوو قەرەباڵغیان کردبوو، بەدۆشکا تەقەیان لەدەوروبەری ئاشەکە دەکردو جاش و سەرباز دەیانویست ئابلۆقەی گوندەکە بدەن، بۆئەوەی کەس دەرباز نەبێت. من و ناسیح و عەلی بەرەو گوندی قەفار ڕامانکردو بەپاڵ گردۆڵکەکەی پشتی ئاشەکەدا، کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی گوندی تۆمارو لەپەڕی گوندەکەوە بوو، هەر ئەمەندەمان خۆش بوو دەرکەوتین دەتوانم بڵێم هەزار فیشەکی هەمەجۆر لەسانیەیەکدا بۆمانهاتووە، سەدجار دایانین بەئەرزداو هەڵسااینەوەو ڕاماندەکردەوە، ئەوەندە خستیانین و هەڵساینەوە لەشمان فێری جمناستیک ببوو. هەرچۆنێک بوو زامدار نەبووین و لەژێر ڕەحمەتی گوللەی جاش و سەرباز بزر بووین، نەوەستاین بەرەو هەیبەو ساتی ڕۆیشتین، لەوێش ڕوو لەنزیکی جەبەلبۆر لەو هەڵەتانەدا خۆمان مەڵاسداو چاودێری گەردەلوولی سەیارەی فەوجەکەی تاریق ئەحمەدمان دەکرد، زۆر ماندووبووین کاتێک لەچەمە وشکەکەی خاسە پەڕینەوە لەپشتی سوورەدێی سەروو، کەپرێکی بێستانەوانی لێبوو چووینە بن کەپرەکە، لەوێ لاوێک لەهۆش خۆی چوو بوو، من قەت بەرچاوم نەکەوتبوو، بەڵام دەستمبرد هەڵیسێنمەوە، کاتێکمزانی چەپکێک لەوتەکانی ماوتسی تونگی لەباخەڵیدا بەربۆوە، زانیم ئەمە هەر کەسێک بێت هاوڕێی ئێمەیە، لەو ناوەش تەنیا زامن ناوێکمان هەبوو خەڵکی سوورەدێ بوو، هەندێک ئاومان پێداکرد، وشیار بۆوە، لێمپرسی تۆ زامنی ئەویش یەکسەر وتی: ئەی تۆ کاک عەلیت؟ لەیەکتری ئاشکرا بووین، ئەویشمان لەگەڵ خۆمان برد بۆ هەڵەتەکان لەبەرزێکەوە چاودێری ناوچەکەمان دەکرد. کاتی پێش ڕۆژئاوا بوون بوو، فەوجەکە ملیان شکاندو گەڕانەوە بۆ ناو کەرکوک و ئێمەش چووینە سوورەدێ لەماڵێکی خزمی زامن چایەکیان داینێو بەڕێکەوتینەوە بۆ تۆمار. کاتێک چووینەوە ماڵی مەلا ناسیح هەواڵی عومەری برازام پرسی وتیان، بێسەرو شوێنە، زۆر مەترسیم پەیداکرد، بۆیە لەگەڵ هەندێک دۆستی ماڵی مەلا ناسیحدا کەوتینە شەوکێڵ هەموو چەم و پەناکان گەڕاین بەرەو ژوور هەتا عەلی موساکان لەخواریشەوە تا کۆتایی واروبیەکانی تۆمار، لەولاشەوە خەڵکمان نارد بۆ گورگان و

هەڵەتەکانی پشتەوە، هەرچی کرا کردمان سۆراغمان دەستنەکەوت، بەیانی مــاڵ و منداڵــی کاکەم بەڕێکردەوە بۆ کەرکوک و ماڵو منداڵی عومەریشــم هێنایەوە بۆ عەسکەر. کاتێک چووینەوە عەسکەر عومەر گەیشتبووە ئەوێ، ئیتر ئاهێکمان بەبەردا هاتەوە.

## سەردانی گەلاڵەو چۆمان

هێشتا کاکە عەبدولڕەحمانم کۆچی نەکردبوو، ڕۆژێک هاتە لام و زۆری گلەیی لێکردم و وتی: من لەسەر شۆڕش ئاوارە بووم، ئەوە دوو کوڕیشم پێشمەرگەن، باشە بۆچی وەها ناکەیت نیوە معاشم بۆ سەرف بکەن، قسەکەی لەجێگای خۆیدابوو، بۆیە بەڵێنم دا سەفەرێکی سەرەوە بکەم و هەوڵێکی جدی بۆ بدەم. بەکاری کۆمەڵە چووم بۆ پێنجوێن و لەولاوە هاتمەوە چوارتاو پاشان بەدۆڵی سەفرەو زەرووندا لەگەڵ کۆمەڵێک سەربازی فیراردا بەرەو گەناو بەڕێکەوتین. بەهەورازەکەی گەناودا چووینە زوودان، لەوێوە بۆ گوندی گەش و سەوزی هێرۆ، پاشان بەبیکلودا چووینەوە دارەشمانەکەی مەلا ئەحمەدی دارەشمانەو لەوێوە بۆ گوندی هەڵشۆو لەوێوە هەڵگەڕاینەوە بۆ گوندی بێگەلاس، کاتێک چووینە ئەوێ نزیکی ڕۆژئاوابوون بوو، ئەوساش خەڵکی وەزعی ئابوورییان زۆر خراپ بوو. زۆر لەوە خۆیان لادەدا پێشمەرگە بەرنە ماڵەوەیان، چونکە ژیانی خۆیان زۆر دژوار ببوو، بۆیە کە لێمانپرسین گوندی سونێ دوورە؟ وتیان: لێرەوە هەر نیوسەعات دوور دەبێت، وتمان: بەسەعاتە گەورەکە، وتیان: ئەوەتا چەناگەیان خستە سەر، ناچار ملی ڕێمانگرت هەر نەگەیشتین گیانمان بەوە بوو شەقامەڕێ بوو پاشان مانگەشەوێکی خۆش بوو دەمانتوانی ڕێگاکە ببڕین، لەپڕێکدا کەوتینە ناو گوندی سونێوە، پێمواببێت لەبێگەلاسەوە بۆ ئەوێ سەعات و نیو زیاد بوو بە پێی ماندوویەتی ئێمە. خەڵکی گوندەکە دەتوت خۆڵودۆی بەسەردا کراوە، هەر ماڵە لەسەربانەکەی خۆی بێدەنگ دانیشتبوون، گوێیان لەدەنگەدەنگی ئێمە بوو، ئەوەندەیتر چرکەیان لەخۆیان بڕی، ئێمە ناچاربووین هەواڵی مەسئوولی گوندمان پرسی، دوو زەلامیان نیشاندایـن، داوامانکرد کە ئێمە (١٥) نەفەرێک دەبین لەگەرمیانەوە هاتووین، دەڕۆین بۆ بارەگای بارزانی نان و چایەکمان بدەنێو تا سبەینێ لێرە جێگامان بکەنەوە، هەر ئەوەندەمان خۆش بوو کابراکان پێماندا هەڵشاخان وتیان: ئێرە حەسۆ میرخان قەدەغەی کردووە نابێت کەس شەو لێرە بمێنێتەوە، نەک دابەشتان ناکەین بەیەکەوە دەبێت بەپەلە بڕۆن هەتا کاک حەسۆ نەیزانیوە، ئەگینا هەمووتان زیندانی دەکات. هەندێک لەو برادەرانەی یەکمان گرتبوو لەڕێ زۆر ترسان وتیان: با بڕۆین، من وتم: ڕێگام بدەن با هەندێک قسە بکەم بەهەلمزانی چونکە لەهیچ شوێنێکدا مەسئولەکانی شۆڕش بۆیان نەبووە خەڵکی ڕێبوار دەربکەن، بێئەوەی نەزانن ئەو خەڵکانە کێن، دەستمکرد بەقسەکردن وتم: ئێمە لەکەرکوک لەدەست سیاسەتی چەوتی بەعسی هەڵاتووین و لەوڵاتەکەی خۆشماندا بۆمان نییە هاموشۆ بکەین، سەرەڕای ئەو هەموو ڕێگا درێژە کە بەکار دەڕۆین بۆ سەرکردایەتی، کێ دەتوانێت دەرمان بکات، ئەی بۆ ئێمە دەممان نییە لەسەرەوە شکاتیان

لێبکەین، قسەم زۆر کرد کاتێکمزانی یەکێک لەماڵە کاوانیەکان کە ئەوسا لەو ناوە سـاباتیان کردبووو دەژیان بەهەڵەداوان هات وتی: تۆ ناوت چییە برا؟ وتـم: عەلی، وتی: لەچەمی ڕەزان پێشـمەرگە بوویت وتـم: بەڵێ، وتی: ئەی خێرە بەم شـەوە بۆ کوێ دەڕۆن؟ وتمان: ئێسـتا گەیشـتووین نەشارەزاین هـەر یەکەمان لە شـوێنێکەوە هاتووین کاری سـەرکردایەتیمان هەیە. وتی: کاک عەلی گوێم لەدەنگت بوو دەنگەکەم لا ئاشـنا بوو، هەر بۆیە هاتم کاتی خۆی ئێمە بەیەکەوە لە چەم بووین من ناوم جەلال کاوانییە، باوەشـمان بە یەکتریـدا کـردو ئەمـلاولای یەکتریمـان ماچکرد، وتـی: برا لێپرسـراوانی گوندناحەقیان نییە، بەڕاستی ڕووداو لەم ناوە زۆرە، لەبەرئەوە کاک حەسۆ قەدەغەیکردووە شەوان میوان لەم گوندە بمێنێتەوە، بۆیە زۆر خەجاڵەتم کە گوێم لەدەنگتان بوو لەگەرمیانەوە هاتوون، چونکە خۆم هاتوومەتە گەرمیان، دەزانم خەڵکی ئەوێ سـەرەڕای ئازایی و دڵسـۆزی زۆریش میوانپەروەرو نـان بـدەن، بـەڵام ڕووی ڕۆژگار ڕەش بێـت ئێسـتا وەزعـی خەڵکـی ئەم ناوە زۆر خراپەو خۆراک ئاسـان دەسـتناکەوێت، بەهـۆی ئەو ئابڵووقەیەی دوژمن خسـتویەتیە سەر ناوچەکە، هەر بەدەم قسـەکردنەوە لەگەڵ جەلال ڕۆیشـتین تا چووینە بەردەمی هەندێک کەپر کە دروسـتکرابوو گوڕەپانێکی لێبـوو وتی: لێرە دانیشـن مـن دەڕۆم لەماڵان بەرماوەی ئێـوارە چی مابوو کۆیدەکەمەوەو بەشی ئێستاتان بۆ پەیدا دەکەم، بەڵام تکا دەکەم کە نانەکەتان خوارد بەڕێ بکەون گوندەکە بەجێبهێڵن، حەز ناکەم دووچاری گرفتبن لێرە. هێشـتا جەلال نەڕۆیشـتبوو ژنێکی کامڵـی ڕەش پۆش هات دەسـتیکرد بە قسەکردن بە خەڵک و بەشۆڕش و سەد جاری وتووە کوڕە بم، دەستم بشکێ خەڵکـی گەرمیان وەهـای لێبێت، لەگوندان دەریان بکـەن لەبەر ژەمە نانێک، زۆری دڵدایەنەوە دوو سێ بەرەی هێناو بۆی ڕاخستین و کوڕێکی مێرد منداڵی لەگەڵ بوو سـەتڵێک ئاوی بەو هەڵگرتبوو، جامێکی لەناو دانابوو دەستیکرد بەئاو دابەشـکردن بەسەرماندا، لەجەلالم پرسی وتی: دایکی خەسرەوە، واتە ژنی مەحمود کاوانی شەهیدە، ئەوجا ئێمەش زۆر سوپاسمان کردو پێمانوت: دایکە گیان دڵی خۆت سـەغڵەت مەکە ئەمە ڕۆژگارە، ئێمەش لەشۆڕشـداین، لەشۆڕشیشدا شتی ئەوها ئاساییە.

هەندێک چێشتی پاشماوەی ماڵان لەتەشتێکی گەورەدا بەسەریەکدا کرابوو، بەچێشتی ئێوارانی مجێوری مزگەوتەکان دەچوو، بەڵام چونکە ماندو و برسی بووین بەهەموو شتێک ڕازیبووین، نانمانخوارد لەماڵی شەهید مەحمودیشەوە چایـان داینـێ‌و فەرمووبانکردین گوندی سـونێ بەجێبهێڵیـن، لای ئەوانمان بەجێهێشـت و بەدزییـەوە چووینە نـاو مزگەوتەکە، لەوێـش چونکە کێچی زۆر بوو کێچ نەیهێشـت بخەوین و هەراسـانیکردین، بەیانی تاریک و ڕوون

مزگەوتەکەمان بەجێهێشت و ڕوو لەبناری قەندیل کەوتینەڕێ. هەندێک ماڵی مەڕدار هاتبوونە گوێ چەمی سونێ و لەوێ دەواریان هەڵدابوو، بەیانی هەتاو لەزۆر شوێن کەوتبوو، بەڵام گوێ چەمەکە هێشتا فێنک بوو هەتاو نەیگرتبۆوە، ڕێکەوتین چاوقایمی بکەین و هەر سێ سێ بڕۆینە بەردەمی دەوارێک و داوای ئەوە بکەین نان و دۆیەکمان بدەنێ. ئێمە ڕێمان کەوتە سەر جۆگەیەک داربیەکی لەسەر بوو، دەوارێکی ڕەش لەپەنایدا هەڵی دابوو، مەلایەکی مێژەر سپی کورتەباڵا چوارمشقی دانیشتبوو، من لەهاوڕێکانم بەتەمەنتر بووم، لەپاش سڵاو داوام لەمەلاکە کرد کە دوو سێ کەسین، یەکی نانێک و قومێک دۆمان بداتێ ڕێبوارو ماندووین و لەئێوارەوە نانمان نەخواردووە، هەروەکو زەمـان زەمانی ڕبەو لیرەبێت تەقییەوە بەدەممداو وتی: بڕۆن نان نییە، زۆر دڵتەنگ دیار بوو ڕۆشنایی تێدا نەمابوو، هەرچی سەرنجمان دا پێنەدەچوو لەقسەکەی خۆی دابەزێت، ناچار ڕۆیشتین و نەماندەزانی لەکوێیتر نانمان دەستدەکەوێت. ئەو سـەردەمەش لەکۆتایـی (١٩٧٤)دا بـوو تومان بازاڕی کوردستانی داگیرکردبوو هەمووشتێک بەتومان دەکڕدرا، هێزەکانی شۆڕش دووچـاری بێ هیوایی ببوون هەر لەسـەرکردایەتی تا دەگاتە خواروو، هەر کەسە لەئاسـتی خۆیەوە ناڕەزایی دەردەبڕی لەسیاسـەتی دەستتێوەردانی ئێـران و لەناکۆکـی نـاو ڕیـزەکان و لەزەبەلاحـی شۆڕشـێکی بەربەرەڵا. جوتیارەکانیـش ناهەقیـان نەبوو کە نانیان نـەدەدا، چونکە بازاڕێکی گران و بێـکار، پولێکی زۆر لەلای شـۆڕش بڵاوبـۆوە، بەڵام بێنرخ بـوو. کەلوپول بەئاسـانی نەدەگەیشتە دەست جوتیاران، بەتایبەت بناری شاخەکان. ئێمەش ئەم ڕاستیانەو زۆر شتیترمان لا مەعلوم بوو بۆیە هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نەبـوو گلەیـی لەجوتیارێک بکەین کە تیکە نانەکـەی دەمی منداڵەکەی خۆی نـادات بەئێمە. ملمان درێژکـردو وردەوردە بەهەورازێکدا سـەرکەوتین کە نەماندەزانی کەی دەگەینە ئاوەدانی، یەکەمجار بوو بەو ڕێیەدا دەڕۆیشـتین، لەناومانـدا ڕەئیـس عورەفایەکی سـەربازی ڕاکردوو دەیویسـت بۆ هێزێک بڕوات کە بۆ سـەربازی ڕاکـردوو کرابۆوە لەو ناوە، دووچاری نەخۆشـی بـوو لەهەورازەکـە لەپەلوپۆ کـەوت، ئێمەش (١٢ تا ١٥) کەسـێک دەبووین تەنیـا مـن کڵاشـینکۆفێک و دوو مەغزەنم پێبوو، ئەوانیتر بـێ چەک بوون. ئەوسـاش خەڵکی تەنیا لەترسـا نانیان بەچەکدار دەدا، لەوە دەترسان ئەگەر نانیان نەدەنێ ئازاریان بدەن. کوڕێکی ڕەئیس عورەفا خەڵکی سـەید سـادق بـوو پەکیکەوتبـوو، هەرچی کردمان توانای ڕێگا ڕۆیشـتنی نەمابوو، ناچار داوامکـرد لەوانیتر هەر کەسـێک چەنـد تومانێکی بۆ کۆبکەنـەوە با پارەی پێبێـت بۆ خۆی کەی پشـوویدا بڕواتەوە ئەو دەورانـەو گوێدرێژێک بەکرێ بگرێت، بەهەر لایەکدا دەیەوێت بڕوات، خۆشـی زۆری پێخۆش بوو، پێموایە ناوی حەبیب و خەڵکی شارەزوور بوو.

## شانۆگەریی نان

دوای ئـــەوەی ئەومـــان جێهێشـــت، مێگەلێک بزنمان بینـــی، چووینە لای شوانەکە هەواڵی نزیکترین ئاوەدانیمان پرسی، وتی: ناوم مەبەن ئەوە لەبن ئـــەو دار بییە گەورەیەدا دوو ســـێ ماڵـــە ڕەوەندی لێیە، زۆر سوپاســـمان کـــردو بەرەو دار بییـــە گەورەکە دامانشـــکاند، چووینە پێشـــەوە کەپرێک لەســـەر ئاوەکـــە کرابوو نیوەی کەوتبـــووە بن دار بییەکـــە، لەمبەرووبەری ســـەکۆی بۆ کرابوو، لەخوارووی کەپرەکەوە تەونێک دانرابوو، دوو کیژە کـــوردی چاو کەژاڵی باڵابەرزی دەم بەخەندە تەونیان دەکردو بەخەندەوە ســـەرنجی گفتوگۆی ئێمەو دایکیان دەدا، کاتێک ســـڵاومانکرد، بەدەنگێکی گرژ پیرەژنەکە کە باڵایەکی بەرزو ڕەنگێکی گەنمڕەنگی هەبوو پشـــتێنێکی زلەی بەســـتبوو، وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، نیشانیداین کە بەخێر نەڕۆینە ماڵیـــان، ئێمـــەش دەتوت منداڵێکی بێ خوای بێ باوکین ســـەرمان داخســـت و مـــن لەجیاتـــی ئەوان وتم: دایکە گیان زۆر ماندو و زۆر برســـین، خەڵکی گەرمیانین دەڕۆین بۆ سەرکردایەتی؛ ئەگەر بەئەرکی نەزانن سەرو تیکەیەک نـــان و قومێـــک دۆمان بدەنێ ماڵتان ئاوەدان بێـــت. زۆر بەبێبەزەییانە وتی: نیمانـــە بـــڕۆن، جارێکیتر وتم: بیکە بۆ خاتری خـــوا، تووڕەتر بوو وتی: من دەڵێـــم نییـــە بڕۆن، هیچ ماندوو نەبووم برســـێتی تینی بـــۆ هێنابووین وتم: دایـــە، وتی: ها وتم: بیکـــە بەخاتری پێغەمبەر، زۆر بەتووڕەیی جوابیدامەوە پێیناخـــۆش بـــوو ئەوەندە ناوی خـــواو پێغەمبەری بەگـــژدا دەکەم. هەرچی بکـــەن دەمتـــان لەگوێچکێـــک نان ناکەوێت بـــڕۆن، ئێمە هەتـــا ڕبەیەک ئارد ســـەردەخەینە ســـەر ئەم شـــاخە ڕۆحمان دەردەچێت، هاکا ڕۆژێک تەیارە یان تۆپ لێرە هەپروون بەهەپرونمان دەکات. لەســـەر یەکێک لەسەکۆکانی کەپرەکە دانیشـــتم و تفەنگەکەم خســـتە ســـەر ئەژنۆم و کڵاو و جامانەکەم داگرت و چاوم پێ سرپییەوە، وتم: دایە بەو خوایەی لەسەروو هەموومانەوەیە شـــێت و هـــار بیت، هەموومان بەشـــەق بکوژیـــت تواناى ڕۆیشـــتنمان نییە هەنگاوێـــک بڕۆیـــن، جا یان بەهیمەت یـــان بەقیمەت نانێکمـــان بدەنێ. ئێمە ئامادەیـــن بۆ هـــەر نانێک یەک دینـــار بدەین، چونکە نـــان نەخۆین دەمرین ژنەکە دەستی نایە کەلەکەی و سەرنجێکی ڕقاوی دام، وەکو بڵێ ئەم بەڵایە چییە تووشـــم بووە هەر تێیدەڕوانیم، هەردوو کچەکەش گەنج و بەبەزەیی بوون گرژبوون، بەچاویاندا دیاربوو لایەنگری داواکەمان بوون، بەڵام ئەو دایکـــە نەفوراتە وەهای ترســـاندبوون نەیاندەوێرا چرکـــە بکەن، لەو ناوەدا شـــانۆگەریەک دروست ببوو لەنێوانی ڕێبواری برسی و پیرەژنی دڵڕەق و غەمداگرتوویی دوو کیژۆڵەی قەد باریکی دەموچاو گەشی لێو بەخەندە. لەم لاشـــەوە ڕیزێک هەتیوی لەبرسا مردووی بێنەوا، برادەرەکان بەپێوە بوون

دەتوت من مەسئوولیانم، هەموو بێچرکە چاوەڕێی مشتومڕی دایەپیرەی دڵڕەق بوون، یەکێکیان ناوی (خولە دریژ بوو) خەڵکی شاری چەمچەماڵ بوو کوڕێکی سپی کاری دەموچاو پانی باڵابەرز لەپشتمەوە وەستابوو، فەنێکی بەکارهێنا، بووە هۆی سەرکەوتنی داواکەمان، تومەز ئەو باش درکی بەوە کردووە مەسئوول لەناو جوتیاراندا جێگایەکی دیاریکراوی هەیەو حیسابی بۆ دەکرێت، جا لەترسا بێت یان لەخۆشەویستی، مەحمود خێرا لێم هاتە پێشەوەو وتی: مامۆستا دەهەڵسە با بڕۆین دەک ماڵم وێران مامۆستایەکی وەکو تۆ بەدەسەڵات وەهای لێبێت دوو سەعاتە بۆ یەک نانوچا ئەوەندە دەپاڕێیتەوە، دەهەڵسە مامۆستا توخوا بەسە با بمرین نامانەوێت لەوە ڕەزیلتر بتبینم، منیش لەقسەکانی گەیشتم، هەڵسامە سەرپێ، هەر ئەوەندەمان خۆش بوو ناوی مامۆستا هات، کەتە پیاوێکی باڵا بەرزی ڕیش ماشوبرنج خەنجەرێکی بەبەر قەدەوە لەبەرامبەرمانەوە لەپاڵ گەمەڵە بییەکەدا هاتە دەرێ‌و وتی دەک ماڵم کاول مامۆستا، وەڵڵا گوێم لێبوو کڕوزەم لێدەهات، توخوا مامۆستا لێمان مەگرە بەخوا ژیانمان زۆر خراپەو شوێنەکەشمان سەرەڕێیە، میوانێک و دووان نییە، شەو و ڕۆژ کاروانسەرایەو هەرچی چاوی بەدەوارەکانمان دەکەوێت لا دەدات، هەندێکیان برسیش نین هەر بۆ پشوودان و چاخواردن لادەدەن، حیساب بۆ خراپی وەزعی ئێمە ناکەن، توخوا مامۆستا بمانبوورە. دەفەرموو دوو لبادی ڕاخست و هەموومانی داناو خۆشی بەپێوە دەنگی لەکیژەکان کرد دۆو نان هات، خێرا چاشیان پێگەیاند فریایان خستین، ئێمەش و کیژە بەویژدانەکانیش شێوەمان ڕۆشنبۆوە، خاڵەی خاوەن ماڵ هەندێک سەرینی گەورە گەورەی هێنایە ئەمدی و ئەودیومەوە، ژێر پیاڵەیەک شەکری کولاوی لەبەردەمم داناو خێرا چای دامێ، وتم: حاجی گیان دەستخۆش من چا ناخۆم وتی: نابێت دوو سێ جار پیاڵەکەیم ڕەتدەکردەوە، ئاخری وایزانی من عاجز بووم وتی: هەر شەش تەڵاقم کەوتبێت ناڕۆیت تا چا نەخۆیت، دەزانم لێماندڵگرانی، بێسوود بوو لەبەرئەوەی سوێندی خوارد چایەکم خوارد. کە زانیم حاجی لەگەڵمان تێکەڵاو بوو وتم: حاجی گیان برادەرێکمان لەو نزیکانە لەبرسا کەوتووە لەسەر ڕێگاکە، ئەگەر منداڵێک بە وڵاخێکەوە بنێری بۆ ئێرەی بیهێنێت بەڵکو تیکەیەک نان دەخواو دەبووژێتەوەو نامرێت، وتی: بەسەر چاو مامۆستا، خێرا گەنجێکی لەدەروازەکەی نزیکەوە بانگکردو ناردی حەبیبیان هێناو تێر نان و دۆی خوارد، ئەویش کەوتەوە سەر قاچ، ماڵیان ئاوابێت، کاتێک ڕۆیشتین هێسترێکی بۆ مامۆستا ئامادەکردو بە زۆر وتی: هەر دەبێت هەتا فڵان شوێن کوڕەکەم لەگەڵتدا بێت ڕێگاکە کەمێک هەورازە. زۆرمان سوپاس کردو ئێمەش هەندێک لەو دوور کەوتینەوە، نەخۆشەکەمان سەر خست تا ئەو شوێنەی بۆی دەست نیشان کردبووین.

ئەو سەفەرە گێرمەوکێشەی زۆرمان تووش بوو، بەڵام هەمووی هی گێڕانەوە نیین، لەهەندێک شوێن چایخانە دانرابوو بەپارە نانیان دەفرۆشت، بەکڕین و بەخۆگرتن گەیشتینە چۆمان، بازاڕی چۆمان شوێنەواری فڕۆکەکانی دوژمنی پێوە دیاربوو، بەڵام تۆپی لوولەدرێژی دوای جێب دەبیندرا، دوکان و بازاڕیش هەبوو بەتایبەت ئێواران لەسەعات چوار بەدواوە هاتوچۆ زۆر گەرم بوو، لەوێ هەمووومان لێکدابڕاین هەر کەس بەلایەکدا، من سەرم دا لەشوێنێک کە خاڵە شەهابی شێخ نوری و شەهید ئارام (شاسوار جەلال) لەوێبوون. هەندێک ڕاسپاردەی کۆمیتەی باڵای ناوچەکەم پێبوو، پێم داو ئەویش وەڵامەکانی دامێ، پاشان چوومە وەزارەتی بەلەدیات لەوێش داوای نیوە یارمەتیم بۆ کاکە عەبدولڕەحمانم کردو نامەیەکیان دامێ کە لەسنووری چەمچەماڵ بۆی سەرف بکەن و گەڕامەوە، لەچۆمان هەندێک کولێرەی ئەستوورم کڕی بۆ ڕێگاو لەپەڕۆیەکدا لەپشتم بەست، چونکە تەنیا بووم زۆر خێرا ڕێگاکەم بڕی و بێ کێشە بووم، چونکە نانم پێبوو، چام نەدەخوارد تواناى ڕۆیشتنم زۆر چاک بوو، چونکە هەموو تەمەنم بەو شاخەوە بردۆتە سەر، مارئاسا ڕێگاکانم قەدبڕ دەکرد. بەهەمان ڕێگا هاتمەوە دارەشمانەو لەوێوە بۆ هێرۆو لەوێشەوە بۆ زودان، کاتێک بەدیوی گەناودا شۆڕبوومەوە لام دایە شوێنێک هەندێک تەماتەم بینی پەڵەیەک پیازی لێبوو، بەڵام کەس لەوێ نەبوو لەبن ساباتی باخەکەدا قاپی لێبوو بەهەندێک تەماتەو پیاز زەڵاتەیەکم دروستکردو نانێکی بەتاموچێژم خوارد. پاشان وردەوردە گەڕامەوە، کاتێک هاتمەوە چەمی ڕەزان تووشی هەندێک ناسیاو بووم بەدەمەتەقێوە چوومەوە بۆ عەسکەر، زۆر دڵم خۆش بوو دیاریم بۆ کاکەم کڕی بوو پاشان نامەم بۆ هێنابوو نیوە یارمەتی بدەنێ، خۆم زۆر بەسەرکەوتوو دەزانی، کاتێک گەیشتمەماڵەکەی خۆم، شەهید ئازاد لەماڵ نەبوو، چوومە ماڵی عومەری برازام لەهەیوانەکەیاندا جێگا داخرابوو بەوە دەچوو میوان بێت دانیشتم مرومۆچ بوون کاکەشم دیار نەبوو، لێم پرسین کوا کاکە؟ لەساڵی (١٩٦٤) بوو جوابیان نەدامەوە، پاشان تینم بۆ بردن بەگریانەوە وتیان: چەند ڕۆژێک لەمەوبەر بۆ پشوودان لەگەڕما چۆتە بن ئەو دارتووەی بەرماڵەکان لەوێ ڕاکشاوە، کاتێک خەڵکی بەسەردا چوون لەوێ خوێنێکی زۆری هەڵهێنابۆوەو هەر بە ئاستەم ڕوحی تیا مابوو، هاواریان هێناو چووین هێنامانەوە، داوو دەرمان و دکتۆر نەبوو، ڕێگای شار نەبوو، هەر بەو خوێن هەڵهێنانەوە گیانی دەرچوو. لەساڵی (١٩٦٣) لەکەرکوک بەدیل گیراو برا بۆ نوگرەسەلمان و ساڵێک لەوێ زیندان بوو، سەرەتا ویستم دان بەخۆمدا بگرم، کاتێک خەڵکی هاتن و سەرەخۆشییان لێکردم، پاش ڕۆیشتنی خەڵکی زامی خۆشەویستی ئەو کاکە وشیارو دڵسۆزو ژیرەم کولایەوەو کەوتمە هەنسکهەڵدان هەر ئەوەتا بوو گیانم لەگەڵیدا دەرنەدەچوو.

## هەرەسی شۆڕشی ئەیلول

ڕۆژگاری کوردستان تا دەهات ڕوو لەئاڵۆزی دەچوو، کۆمەڵەش چالاکانە کەوتبووە تێکۆشان بۆ وشیارکردنەوەو سازدان و ڕێکخستنی خەڵکی و لەناو هێزی پێشمەرگەشدا تووی بڕوابوون بەگەل خۆی دەچاندو پێشبینی ئەوەشی کردبوو کە ئەگەر کورد خۆی کۆنەکاتەوە شۆڕشی ئەیلول بەسەرۆکایەتی بارزانی بەرەو کۆتایی دەڕوات، لەناو خەڵکدا ئەوە دەوترا، زۆری نەخایاندو لەئازاری (١٩٧٥)دا بەڕێکەوتنێکی شای ئێران و ڕژێمی عێراقی بەنوێنەرایەتی صەدام لەپایتەختی جەزائیردا ڕێکەوتننامەی دۆستایەتی ئەو دوو دەوڵەتە لەسەر لاشەی گەلی کورد مۆرکراو پێیان خستە سەر ڕێزەی ملی سەرکردایەتی ئەوسای کورد کە ئاشبەتاڵ بکەن. ئەوانیش زۆر بەگورجی داوای دوژمنەکانیان جێبەجێکرد لەکاتێکدا زیاتر لە (١٥٠) هەزار پێشمەرگەی کورد بۆ خۆبەختکردن ئامادە بوون، لەپێناوی ئازادی کوردستاندا. ئەوسا سەرکردایەتی بارزانی مستەفا داوای لەهێزی پێشمەرگەو گەلی کوردستان کرد چەک فڕێ بدەن، ئەوەی دەڕواتەوە خۆی بداتەوە دەست ڕژێمی عێراقی با بڕوات و ئەوەشی دێتە ئێران بالەوێ ببێت بەپەنابەر، بەو بڕیارە دوژمنکارانەیەی دژی گەلی کوردستان شۆڕشی زۆر مەزنی (١٩٦١)کیان بەچۆکدا هێناو گەنم گرتوجۆ بڵاویان لێکرد.

## شۆڕشی زیندان

دوای هەرەس، کۆمیتەی سەرکردایەتی کۆمەڵە چەند کۆبوونەوەیەکیان کـردو بارودۆخەکەیـان هەڵسـەنگاند، چیبکـەن؟ شـەڕ درێـژە پێبـدەن بەشـێوازی خۆیان، یان هاوڕێکانیان هانبدەن بڕۆنەوە لەگەڵ خەڵک بۆ ناو شـارەکان، ژمارەمان لە (١٥٠) ئەندامی دڵسـۆز تێنەدەپـەڕی، لەناو هێزی پێشـمەرگەش ژمارەمان ئەوەندە نەبوو تابتوانیـن هێزێکی لێ پێکبهێنین و ڕاپیگەیەنین کە ئێمە بەئاشبەتاڵ ڕازینابین. هەر بۆیە سەرکردایەتی کۆمەڵە بەنهێنـی هاوڕێکانـی ئاگادارکـردەوە چەکەکانیـان لەزەوی کوردسـتاندا بشارنەوەو خۆیان تێکەڵاوی ئەو خەڵکە بکەن کە دەڕۆنەوە شارەکان.

ڕۆژگاری ئاشبەتاڵ شتێکی هێندە ناخۆش و دڵتەزێن بوو دڵ بەئاستەم خۆی پێدەگیراو نەدەتەقی، هەرچەندە هەندێک دڵی زۆر بە پەرۆش و ناسک تەقیـن و خۆیـان پێنەگیرا لەبەردەمی ئەو ڕۆژە ڕەشـەی بەسـەر کورددا هاتبوو.

ئـەو شـەو و ڕۆژانەی جاڕی ئاشـبەتاڵی شۆڕشـی ئەیلولی (١٩٦١)ی تێدا درا من لەگوندی شـێخانی سوورقاوشـان خەریکی مشـوورخواردنی ڕێکخستنی نارۆنەوەی هاوڕێکانی کۆمەڵەبووم لەگەڵ جەماوەر بۆ شارەکان دوای ئەوەی بێ هیوابووم لەوەی بتوانین ئاڵای شـۆڕش بگرینە دەسـت و نەهێڵین ئاشبەتاڵ بکەین، لەناخۆشترین ڕۆژەکانی ژیانم بوون.

خەڵکـی کـەم مابوونـەوە خۆیان بـە (نادیم) بنووسـن، ئێمـەش چەند هاوڕێیەکی کۆمەڵە بووین چووینە ناوشـوان، نەمانوێرا لەئاغجەلەر خۆمان بدەین بەدەستەوە، بۆیە چووینە ناوچەی ڕێداری شوان و لەوێ برادەرێکم هەبوو کـۆن لەپارتیدا بەیەکەوە کارماندەکردو پارتی کردبووی بە مفەوەز شـورتە، بەڵام مدیری ناوچە ئەوسا محەمەد هەمەوەندی بوو ئەویش زۆر بـرادەرم بـوو، کۆن ئەویـش هـەر لەهاوڕێکانی پارتی شۆڕشـگێڕم بوو، کاتێـک چوومە لای هیچ بەجوانی پێشـوازی نەکردم، هـەر بەلالووتێکەوە ناردمـی بۆ لای هـاوڕێ مفەوەزەکـەم، لەژوورەکەی هاتمـە دەرێ لەبەر کۆشـکی ناوچەکـە چاوەڕوانی هاوڕێکانیتـرم بووم، دیم مدیـری ناحیەو ڕەفعـەت مەحمـود ئەفەندی کە ئەویـش مفەوەز بوو بەیەکەوە پیاسـەیان دەکـرد، ڕەفعەت وتی: بەخوا چاک دامان بەزەویدا، ئەوەندەم لەدڵگران بوو هەتـا دەمرم لەگوێمدا دەزرنگێتەوە. بـۆ دەبێت کورد ئاوات بەوە بخوازێت شۆڕشـی گەلەکەی بەچۆکدا بێت و بەسـەرکەوتنی خۆی بزانێت، زۆر ڕقم هەڵسـا، بەڵام بێدەسـەڵات بووم، تەنیا بمزانیایە سـەد کەسێک بەشاخەوە

هەیە خێرا دەگەڕامەوە شـاخ و لەوێ چەكـم بەكاردەهێنایەوە بۆ داواكەم، هەرچۆنێك بوو چوومە لای (ساڵح بەفرفرۆش)ی كۆنە برادەرم لەمەركەزی دارەمان بوو، زۆر ڕێزی لێگرتم، لەگەڵ خۆی و بەسـەیارەی خۆی هەموو هاوڕێكانـی لەگەڵم بوون بردمانی بۆ ناحیەی پردێو لەوێ خێرا وەرەقەی تەسـلیمبوونی بـۆ كردین و بەڕێیان كردین بۆ ئەمنی كەركوك، بەڕاسـتی هەڵوێستێكی چاكی وەفاداری هەبوو هەرچەندە ئەویش ببوو بە بەعسی بۆ ئەوەی لەكارەكەی كە مفەوەزییە لای نەبەن.

كاتێك چووینە ئەمنی كەركوك هەندێك وێنەیان لێسەندین و فۆرمێكیان پێپڕكردینەوەو بە (نادیم) نووسـراین، لەمێژووی ژیانمدا بەناشـیرینترین وشـەی دەزانـم، چونكە من پەشـیمان نەبووم و هەمیشـەش پەشـیمان نیـم، لەوەی بـۆ كوردم كردووە، بەڵام ڕۆژگارو نەبوونی سـەركردایەتی بەتوانـای بزوتنەوەكـەش وەهایكـرد هەمـوو شۆڕشـگێڕانی كـورد (نادیم)بـن چ لەئێـران و چ لەعێـراق.

پاشئەوەی ئەمن وەرەقەی داینێ بگەڕێین بۆ كاركردن، چوومەوە ماڵی كاكە عەبدوڵڵام ماوەیەكی چاك بێكار بووم، پاشان گێڕامیانەوە بۆ دائیرەكەی خـۆم لەچەمچەمـاڵ، لەوێ لەگەڵ كارەكـەم خۆم گونجاندو لەژێریشـەوە سەرپەرشـتی ڕێكخسـتنی چەمچەماڵی كۆمەڵەم دەكردو بۆ كۆبوونەوەی كۆمیتەی ئەسـتێرەی سوور لەكاتی دیاریكراودا دەڕۆیشتم، چونكە دەوامی كارمان (٨) سـەعات بوو ئێمەش كرێكار بوویـن بەدیار مەكینەی كارەبای چەمچەماڵـەوە لـە (٨) بەیانی بۆ (٤) دوای نیوەڕۆ لەچوار بۆ (١٢) شـەو لـە (١٢) شـەو بۆ (٨) بەیانـی ڕێكەوتم لەگەڵیان ئەگـەر فریای دەوامەكەم نەكەوتم یەكێكیان كارەكـەم بەڕێوەبەرێت و نەهێڵێت بەلەدێ بزانێت، بۆیە هەموو جار بەئاسـانی دەڕۆیشـتم بۆ كەركوك، هەولێر، بەغدا، سـلێمانی. بڕیاری كۆبوونەوە لەهەر شوێنێكدا بوایە منیش دەچووم بۆ ئەوێ.

زۆر لەسـەر كارەكەم نەمابوومەوە كە ڕێكخراوەكەمان خەڵكی لێگیراو سـەركردایەتی كۆمەڵـە ناویـان هات لەئەمنـی بەغداو ئێمـەش بڕیارماندا خۆمـان بشـارینەوە، بۆئـەوەی كۆمەڵە لـە لەناوچوون بپارێزیـن، چونكە كۆمەڵـە ئەوەندە لامـان پیرۆز بوو بۆ ئـەو قۆناغـەی بزووتنەوەی كورد دەبوو لەبیلبیلەی چاومان زیاتر بیپارێزین.

## جارێکیتر کوردستان بەجێهێشتن

پاش زنجیرەیەک کۆبوونەوەو ڕاوتەگبیر، بڕیارماندا لەکوردستانیش دوور بکەوینەوە بۆئەوەی لەسەر دەستی ئێمەو بەهۆی ئێمەوە کۆمەڵە دووچار نەبێت، بەڕۆیشتنی ئێمە ئەڵقەی نێوانی گیراوەکان و کۆمەڵە دەپسا، بۆیە لەهەر شارێکدا کۆمیتەیەکی سەرکردایەتیمان داناو پێمانوتن: تا سێ مانگیتر ئێوە خۆتان سەرپەرشتی ڕێکخستن دەکەن و ئێمە بەهیچ شێوەیەک دەنگمان ناتانگاتێت. بۆ سەرپەرشتی هەموو کۆمەڵەش کۆمیتەیەک دانراو ئێمەش بەڕێی قاچاخدا چووین بۆ شاربازێرو بەپشتی چوارتادا ڕوو لە شیوەکەڵ و لەوێوە بۆ لێواری سنووره دروستکراوەکەی نێوانی کوردستانی ڕۆژهەڵات و کوردستانی خواروو لەگوندی سیرین لەنگەرمان لەباخێکدا گرت، کە نموونەی جوانی باخی کوردستانە لای پیاوێکی بەساڵاچوو ناوی مامە قالەبوو، چەند شەو و ڕۆژێک چاوەڕێی قاچاخچی بووین کە بمانگەیەننە تاران و لەوێوە بڕۆینە سەفارەتەکان و داوای پەنابەرییان لێبکەین. پێمانوابوو زوو دەگەین و خێراش وەردەگیرێین و بەڕێدەکرێین بۆ دەرەوەو لەوێشەوە لەگەڵ مام جەلال یەکتری دەبینین و پاش تەواو یەکخستنی بیروڕامان لەسەر هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێی دیموکراتی گەلی لەکوردستان و پەیداکردنی کەمێک پول بۆ ئیدارەدانی ئەو ماوەیەی دەستەی بچوک بچوک پێشمەرگە دادەمەزرێنین، بەش بکات، بەڵام نەخشەکەمان لەبناواندا سەرکەوتوو نەبوو، ئەو قاچاخچییانەی لەسلێمانیەوە هێنایانین، چاوەڕوانیان نەکرد قاچاخچیەکانی ئێران بێن و بمانبەن، گەڕانەوەو وتیان: ئەمڕۆو سبەی دێن، بەڵام هەر نەهاتن و ئێمەش پاشئەوەی زۆر پەژارەمان خوارد ئەوجا زنجیرەیەکیتر کۆبوونەوەو مشتومڕمانکرد لەسەر (چی بکەین؟) ئاخر بڕیار ئەوە بوو خۆمان بڕۆین بۆ ئێران ئەگەر گیراشین بڵێین هاتووین بۆ پەنابەری.

## سەرەتای زیندانیکردنمان لەئێران

ئێـوارەی ڕۆژی ١٩\٢٠/٩/١٩٧٥ گوندەکەی مامەقالەمان بەجێهێشـت و بەدڵێکـی پـڕ لەغەمەوە ڕوو لەئێران بەڕێکەوتین، هێشـتا نەگەیشـتبووینە مەرکـەزی چەمپـاراو دووچـاری گیـران بوویـن، لەلایـەن ژاندرمـەی دەوڵەتی حەمەڕەزا شـاو زۆر پرسـیارو قسـەیان لێپرسـین، تێکڕا وتمان: "هاتوویـن بـۆ پەنابەری و لەدەسـت ڕژێمی عێراق ڕامانکـردووە"، ئەوان پێکەنینیـان بەقسـەکانمان دەهـات و دەیانـوت: "ئێمە لەگەڵ عێـراق براین و وەزعـی عێراق ئێسـتا چاکـە، ئێوە دەبێت کاریترتـان هەبێت، یان عێراق ناردوونی بۆ ئەوەی بزانێت ئێمە خەڵکی عێراق وەردەگرین یان نا، دەوڵەتی شـا بڕیاریداوە هەرکەسـێک بێتە ئێرانەوە وەریناگرین، بۆیە هەرچی ئێوە دەیڵێـن لای ئێمـە وانییە، بەڵام ئێمە دەتانبەین بـۆ بانە و لەوێ بزانین چی دەڵێن."

بەیانی ڕۆژهەڵهات پاش نانخواردن پێش خۆیان داین و بەرەو گوندی (بلەکێ) بەڕێکەوتین و دنیا هێشتا گەرم بوو، لەڕێگا چاک ماندووبووین و ئارەقەی زۆرمانکرد، لەدیار کانی و ئاوێک لەناو بلەکێ دانیشـتین، سەرو چاومـان فێنک کردەوە، ماوەیەک لەوێ ڕایانگرتین پاشـان ئۆتۆمۆبێلێکی سەربازی هات و بردیانین بۆ ناو سەربازگەیەک لەپاڵ گردە لوتبەرزەکەی ئەربەبا، چەند شـوێنێکیان پێکردین، پاشـان لای ژوورێکی سـەربازەکان نانێکـی سـەربازانەیان داینـێ، بـە دوو سـێ پۆلیسـدا بەڕێیانکردین بۆ ناوشـار، لەڕێگا داوامانکـرد ڕێگەمان بدەن لەحەمامێکـدا کەمێک خۆمان بشـۆرین، داواکەیان جێبەجێکردین، پاش خۆشۆرینێکی خۆش پۆلیسەکان بردیانیـن بۆ زیندانی مەرکەزێکی پۆلیسـی شـاری بانە، کاتێک گەیشـتینە زیندانەکـە دیمان هەندێک کوردی بانەیی تێدابوو بەشـێوەیەکی کوردانەی ڕەسـەن پێشـوازییان لێکردین، هەرچەندە لەپۆلیسـەکان دەترسـان، بەڵام هـەر کە هەلیان بـۆ دەرەخسـا لەژوورەکـەی بەرامبەرمانەوە پێویسـتی شەکر و چاو نانخواردنیان دەداینێ.

ڕۆژی دوایی بردیانین بۆ شـوێنێکیتر کە دائیرەی ئەمنی شـاری بانە بوو، لەسـەرخانەکەی سـەرەوەی ئەو کۆشـکە پڕبوو لەهۆدەی بچووک بچـووک، لێیانکردیـن بە ڕاوەڕێوی، پرسـیارێکی زۆرو چاوبەسـتنەوەو هێنـان و بـردن و لەیەکتـری جیاکردنـەوە، لەئەنجامدا هەندێـک وێنەیان بەهەموو شێوەیەک لێگرتین و گێڕایانینەوە بۆ زیندان.

یەکەمجار بوو خواردنێک بخۆین بەناوی پاستۆریزا یەکێکی چوارشانەی دەموچاو پانی کەڵەگەتی ئەستوور (دیاربوو خەڵکی ناو شاری بانە بوو) پڕ کاسەیەکی گەورەی چێشت بۆ هێناین لەگەڵ دەستەوارەیەک نانی سپی تەنک نەماندەزانی لێمان پرسی ئەم خواردنە ناوی چییە؟ لەوەڵامدا وتی: "پاستۆریزای پێدەڵێن، گەنمی کوتراو و دۆ بەیەکەوە دەکوڵێنن هەندێک گژوگیای تێدەکەن و لەزستاندا زۆری بەکاردەهێنن"، بەڕاستی لەسەر ئەو هەموو بارە دەروونییە ئاڵۆزەی خۆشمانەوە چێژێکی زۆرمان لێوەرگرت، بەتایبەت لەو هەموو خزمەتەی ئەو کوردانە کردیان لەگەڵمان ئازاری کەوتنە داوی زیندانەکەی سووک کردبووین.

پاش شەو و ڕۆژێک بەرەو شاری سەقز بەپێچاوپێچی کەلیخانداو بە بەرچاوی ئەربەبای سەربەرزەوە براین، کاتێک گەیشتینە ناو شاری سەقز براین بۆ مەرکەزی شارەبانی و پاش ناو نووسین براینە هۆڵێکی گەورەی (٥) بە (١٠) مەتری کە پێشەکەی شیشبەندبوو شوشە و شتی وای پێوە نەبوو بەربەرەڵا بوو، بەڵام لەپێشەوەی چوونە ژوورەوە دیوارێکی ئەستوور بەدەرگایەکی تەنگەبەر دادەخراو شیشبەندەکەی دەرگای خۆی هەبوو، کە هەمیشە بەقوفڵێکی گەورە دادەخراو لەڕێڕەوە بچووکەکەی نێوانی دیواری دەرگای سەرەکی و شیشبەندەکەشدا پۆلیس هاموشۆی دەکرد.

سەرەتا نامۆبووین بەخەڵکەکە، چونکە کوردبووین دواتر وردەوردە تێکەڵاوییەکی زۆرمان پەیداکرد، هەرچەندە ئەوان لەسەر کێشەی کۆمەڵایەتی جیاجیا گیرابوون و زۆر لەساواک دەترسان، بەڵام چونکە ئێمە (٥) کەس بووین زۆر ڕێک و تەبابووین و ڕێزمان لەخۆشمان و لەخەڵکی دەگرت، زیندانییەکانیتریش ڕەوشتی کوردانەیان هانیدەدان لێمان نزیکببنەوە، ئەگەرچی خەڵکی زۆر شەڕانی تێدابوو، ناوی دەرکردبوو بەچەقۆوەشێن، خەڵکانیتریشی تێدابوو کە هەموو ژیانیان بەشتی خراپەوە بردبووەسەرو بەشی زۆری ڕۆژگاری ژیانیان لەزیندان و دوورخستنەوە لەشاری خۆیان بردبووەسەرو ئەوە وەهای کردبوو لەگەڵ زینداندا ڕاهاتبوون و هیچ سڵیان لەشەڕ و ئاژاوەی ناو زیندان و لێدان و شەڕەجوێن نەدەکردەوە، وەکو عەباسی قەدەمی، ئاغا محێی سنەیی، ئەمیری سەقزی، حەسەنی بەشیری و هتد...

هەرە شەڕانییەکان زۆر خۆیان لەئێمە نزیکدەکردەوەو زۆر ڕێزیان لێدەگرتین و دەهاتنە لامان و قسە و باسی زیندان چی ڕوویبدایە و هەتا شتی کۆنی خۆشیان بۆ دەگێڕاینەوە، لەهەموومان زیاتر ڕێزی زۆریان بۆ خاڵە شەهاب دادەنا، ئێمەش بەگشتی خاڵە شەهابیش بەتایبەت زۆر ئامۆژگاریمان

دەکردن، بەڵام ئەوان لەمنداڵیەوە لەگەڵ زیندان ڕاهاتبوون خۆیان پێنەدەگیراو ناوبەناو شەڕیان هەر دەکرد.

ماوەیەک لەوێ ماینەوە دووچاری ئەسپێ تێدان بووین، کە تا ئەو ساتەش شتی وەهامان نەدیبوو بەخۆمانەوە، ڕۆژی دووجار دەریاندەکرین بۆ حەوشە بۆ "هەوا خۆری" تا سەعاتێک خۆمان دەدایە بەرخۆر و دەستماندەکرد بە ئەسپێ دۆزین، ئەسپێکە لەوەدا نەبوو بژاری یەک و دوو جار بکرێت لەو دووجارەی ڕۆژەدا هەر جارەی دەیان ئەسپێ زیاترمان لەجلەکانمان فڕێ دەداو بۆمان نەدەکوژران، بەڵام چونکە هەموو بژارمان نەدەکرد کە دەچووینە ژوورەکە پاش سەعاتێک هەموویان بۆ دەبژاردینەوەو لەشمان پردەبووەوە، خۆ بەتایبەت من پیاوێکی بانەیم لابوو کە ناوی (حاجی ئەحمەد) بوو بەکرێ شەکری کەللەی بۆ زیندانییەکان دەشکاندو لەجیاتی حەقدەستەکەی وردە شەکرە شکاوەکەی وەردەگرت، قەت خۆی نە دەشۆرد، هەرکاتێک ئەسپێکە بەسەر دەموچاویدا بڕۆیشتبایە ئاگادارم دەکردەوە دیاربوو زۆری پێناخۆشبوو باسی دەکەم، بەڵام بەناچاری دەیگرت و فڕێی دەدایە بن لێوی ڕاخەرەکەی ژێری، دەموت: "حاجی بۆ نایکوژیت؟" بەژێر لێوەوە دەیوت: "گوناحە"، جا زیندانێک خەڵکی وەهای تێدابێت ئیتر چۆن ئەسپێ کۆتایی دێت؟

ڕۆژێک لەحەوشەی زیندانەکەی شارەبانی سەقزدا بووین خۆمان دابووە بەر تیشکی خۆری ئێوارە، کاتێک دەمانڕوانییە لوتکە بەرزەکانی دەوری شار لەپڕێکدا یەکێک لەزیندانییەکان هەواڵێکی داینێ، وتی: "ئێستا دوو کوردی نوێ هێندراون بۆ زیندان وەرن با بزانین نایانناسین، کاتێک هەر پێنجمان بە هەڵەداوان ڕۆیشتین بۆ ژوورەوە ڕووبەڕووی کاک ئەرسەلان بایز و کاک ئاوات عەبدولغەفور بووینەوە، لەگەڵ ئەوەی زۆرمان پێخۆشبوو کە چاومان پێیانکەوت، بەڵام لەهاتنەکەیان زۆر ترساین و زۆریشمان پێ ناخۆشبوو، چونکە دڵمان لێیدا کە کۆمەڵە دووچاری موشکیلەی نوێ هاتووە بۆیە ئەمان بە دواماندا هاتوون.

پاش پشوودان زۆر بەوریایی و تاک تاک لەهەواخۆرییەکاندا پرسیارمان دەکرد لەسەر وەزعی کۆمەڵە و هاوڕێکانی، چونکە سەردەمی حەمە ڕەزا شا (ساواک) ئەوەندە خۆی سەپاندبوو لەناو خەڵکی ئێراندا بەخۆشی و ناخۆشی هەواڵەکانی دەگەیاندەوە، بۆیە ئێمەش لەو ڕاستییە گەیشتبووین کە ساواک ڕێکخراوێکی جاسوسی زۆر بەلایە و دەبێت خۆمانی لێبپارێزین هەتا لەناو خۆشماندا قسەوباسی سیاسیمان دەپاراست، ئەنجامی گفتوگۆ و پرسیارکردن لەو دوو برادەرەمان بۆماندەرکەوت کە پاش

گیرانی کاک ئەنوەر و کاک ئاسـۆ و ئەوان، کادرێکی زۆری کۆمەڵە گیراون کە بڕبڕەی ئیشـوکاری کۆمەڵەبوون، لەوانە محەمەدی میرزا سەعید، سەلام محەمەد برزۆ، ئیبراهیم حەسـەن، سـەعدون یەدوڵلا و دارۆی شـێخ نوری برای خاڵە شەهاب و ئەنوەر و حەسەن کەرکوکی و جەبار فەرمان و کەمالی ئەلەکە و هەندێکیتر، کە لەپاشاندا لیستی ناوەکان دەخەینە بەرچاو، ئەوەندەی لەیـادم مابێـت. ئەم هەواڵە دڵـی هەمووانی زۆر پەرێشـانکرد، بەڵام چونکە هیـچ شـتێکمان پێنەدەکرا ناچـار دانمان بەخۆماندا گـرت و بڕیارماندا لەوە بەدواوە هەوڵێکی زۆر بدەین لەڕێگەی کەسانی پارتی دیموکراتی کوردستان کە ئەوسـا لەئێراندابوون و لەڕێگەی کەسـوکاری فەرەیدونـەوە لەمەهاباد دەنگی خۆمان بگەیەنین بەمام جەلال و داواشـمان لەبرایانی پارتی ئەوەبوو کەفالەتمـان بکـەن و لەزینـدان ئازادمان بکـەن، بەڵام بەداخـەوە نە ئەوەی پارتی بەرهەمی هەبو و نە خزمانی فەرەیدونیش هیچ شـتێکیان پێکرا بۆمان لەزیندان، ئێمە ناچاربووین کۆشـش بکەین، هەربۆیە کوردێکی ئێرانی ئازاد دەبوو نامەمان پێدادەنارد بۆ دەرەوەی زیندان بۆ ئەوەی هەواڵمان بگاتە مام جەلال لەسوریا و ئەو کاتە نێوانی سوریا و ئێران چاک بوو، دەمانوت بەڵکو مام لەڕێگای سوریاوە داوای ئازادبوونمان بکات، بەڵام نەک هیچ یەکێک لەو نامانە سـوودی نەبوو، بەڵکو هەندێکی کەوتبووە دەسـتی ساواک، ئەوانیش لەڕۆژانی مواجەهە دەیاننارد بەدوای فەرەیدون یان کاک شەهاب کیسەیەک خەیاری زەردی پیر و بێکەڵکیان دەهێنا و خۆیان دەخسـتە بەرگی پیاوێکی سیاسـی ئێران و گوایە دەیانەوێت هاوکاری ڕفاندنمان بکەن لەزیندان، هەر زوو برادەران لەوە بە ئاگابوونەوە و لەقسەکردندا زۆر وشیاربوون.

ماوەی چوار مانگ لەم زیندانەداماینەوە، جارێک پێش ئەوەی دادگاییمان بکـەن بردیانین بۆ دائیرەی ئەمنی سـەقز لەحەوشـەیەکی بچـووک و لەناو بەفرێکـی زۆردا ڕایانگرتین، ڕێککەوت وابوو بەرێکی حەوشـەکە هەتاو بوو بەرەکی تری سێبەر، ئێمەیان لەسێبەرەکە ڕاگرتوو، هەرچەندە نیو جزمەمان لەپێدابوو و سەرو پاڵتۆی درێژی پیرانەی بەڵەکی ڕەش و سپیمان لەبەردابوو، بەڵام سەرمای سەقز و زۆری بەفر تینی بۆ هێناین و داوامانکرد لە سێبەرەکە لامان بدەن و ڕێگەمان بدەن لەهەتاوەکە بوەسـتین، بەڵام سـاواکییە دڵڕەقە بێویژدانەکان گوێیان بەداواکەمان نەداو هەر لەسێبەرەکە چوار پێنج سەعات ڕایانگرتین و پاشـان گێڕایانینەوە بۆ شارەبانی بێئەوەی پرسیارمان لێبکەن، بەڵام هەمووان بووین بە کۆتەرە وەکو کرێمی بەستەنیمان لێهاتبوو.

ئێوارانی زیندانمان تەرخانکرد کە جەعفەر عەبدولواحید دەرسـی زمانی ئینگلیزیمان پێبڵێت و خۆشـمان وەختی پێ دەبەینەسـەر، ماوەیەک لەڕۆژدا

بـەوە کاتمان بەسـەردەبرد و بەتایبەت لەکاتی هەواخـۆری ئێواراندا، بەڵام سـاواکییەکان تەنگیان پێهەڵچنین و ناچار وازمـان لەخوێندنی ئێواران هێنا، شـەوانیش کۆڕمان دەبەسـت بەنوکتـەی خۆش خـۆش و گێڕانەوەی باس و خواسـی ڕابوردووی عەباسـی قەدەمی، چونکە هەمـوو ژیانی لەزینداندا بردبووەسەر چ لەسەر پۆخڵەواتی خۆی و چ لەسەر ڕابوردووی زیندانەکانی کە دیبوونی، سیاسـی و کۆمەڵایەتی، ناوبەناویش سەیری فیلمی تەلەفزیۆنی و ئاهەنگی گۆرانی کچانی دەنگخۆش و مۆسیقای ئێرانیمان دەکرد.

لەهەموو ئەم زیندانەی ئێمە تێیدا بووین تەنها یەک پیاوی ئێرانی سیاسی تێدابـوو کە ئەویش ئەندامێکی بەرزی پارتی دیموکراتی کوردسـتانی ئێران بوو کە بەهیچ شـێوەیەک نەیاندەهێشـت کەس قسەی لەگەڵ بکات و ئێمەش چەند هەوڵماندا، بەڵام هەلێکی وەهامان بۆ نەڕەخسـا بزانین کێیە و لەسـەر چی و چۆن گیراوە و چی بەئێمە دەکرێت بۆی بکەین.

پەیوەنـدی نێـو زیندانییـەکان و ئیـدارەی زینـدان و ڕەوشـتنزمی ناو زیندانەکە بوون بەشتێک و لەهەر شوێنێک باسی زیندان بکرێت ئەوە لای من زیندودەبێتەوە و کارێکی دەروونی خراپم دەکاتەسەر.

ئێـوارە لەکاتـی هەواخۆریـدا بووین لەپڕێکدا گۆڕانێکی سـەیر بەسـەر خەڵکەکەدا هات، هەرچەندە شـتێکی ئەوتۆش بەرچاو نەدەهات، نەماندەزانی چی ڕوویداوە، عەباسـی قەدەمی و ئاغا محێی سـنەیی و حەسەنی بەشیری و ئەمیـری سـەقزی دەهاتن و دەچـوون، هەندێک وردە چەقۆکێشـی تری پـاش ئەمانیـش هەبـوون کەوتبوونـە جموجـوڵ، زۆرمـان نیگاکـرد هیچ شـتێکمان بۆ ڕۆشـن نەبۆوە، فەرەیـدون و ئاوات لەئێمە دابـڕان و چوونە نـاو خەڵکەکەوە پرسـیاریانکرد چی ڕوویـداوە دیاربوو شـتێکی ئەوتۆیان دەسـتنەکەوتبوو پاش دوو ئەمسەر و ئەوسـەری حەوشەکە هاتنەوە لامان وتیـان پێدەچێـت خەڵکی تازە هاتبـن، بەڵام نازانین لەکوێـوە هاتوون، خاڵە شـەهاب وتی: "فەرەیدون مـن ئەمڕۆ ئەو کوڕەم بینی کـە لەزیندانی بانەدا خزمەتی کردین داوام لێکرد ئێوارە لای ئێمە میوان بێت و هەر بەو بۆنەیەوە مـن و عەلی خەفەرین پاسـتۆریزای خۆشـی بـۆ لێدەنێیـن"، برایان هەموو بەیەکەوە وەسـتابووین زۆریان پێخۆشبوو پاش تۆزێک من و خاڵە شەهاب بـەلای خەفەریاتی خۆماندا ڕۆیشـتین و لەڕێڕەوەکە تەباغـە نەوتییەکەمان داگیرساندو خەریکی پاسـتۆریزاکەمان بووین عەباسی قەدەمی وتی: "خاڵە شـەهاب ئەمشـەو ئەزمەڕ دەگرم"، جا عەباس زۆر ڕێزی لەخاڵە شـەهاب دەگـرت و هەرچـی هەبوو بـۆی باسـدەکرد، هەندێکجاریش لەسـەردەمی عەباسەوە باسی تێکۆشەرانی سیاسی ئێرانی دەکرا لەکاتی ئازاردانی ساواکدا

چۆن خۆگربوون، خاڵەش حەزیدەکرد ئامۆژگاری زۆری بکات، خاڵە لەوەڵامی عەباسدا وتی: "عەباس شەو وەرە قسەم بۆ بکە جارێ کارم هەیە"، ئێوارە کە میوانەکەمان هاتەوە، زۆر خۆشحاڵبووین کەوا ئێمەش هەلمان بۆ ڕەخسا و لەهەمان وڵاتدا پاداشتی پیاوەتی دەدەینەوە.

هێشتا نانمان تەواو نەخواردبوو ڕوانیمان قەرەباڵغییەکە ڕووی لەنزیکی ئێمە کرد، ئێمە هێشـتا نەماندەزانی چی ڕوویداوە، گۆڕان تەنها ئەوەندە بوو ئەو برادەرەی لە زیندانی بانە خزمەتی ئێمەی کردووە هاتۆتە ناو زیندانەکەو کەسـێکیتریش نییـەو ئەویـش منداڵێکـی وەهـا نییە تـا چەقووەشـێنەکان بەدەوریدابێن، پیاوێکە تەمەنی لە (٣٠) ساڵ کەمتر نییەو کەڵەگەت و بەخۆوەو پەلقەوی، هی ئەوەش نییە تەنها کەسـێک پێـی بوێرێت ئەی چی ڕوویداوە؟ نەماندەزانــی نان و چامان خوارد، خێـرا عەباس بانگی میوانەکەمانی کرد و وتی: "ئیدارەی زیندان بانگت دەکات"، میوانەکەمان ڕۆیشت سەعاتێک زیاتر نەهاتــەوە، عەبــاس لە ڕێڕەوەکەوە دەسـتی بە شیشـەکانەوە گرت و وتی: "دەزانی ئەزمەڕ گرتن یانی چی؟" واماندەزانی عەباس شەڕێکی بەدەستەوەیە، چونکــە زۆرجار دەیانگێڕایەوە کاتێک عەباس دەیەوێت شـەڕبکات، سـەری پاکپاک دەتاشـێ بۆ ئەوەی پاش شەڕەکە پۆلیس سەری نەتاشن و داواشی لەڕووبەڕووەکەی دەکرد کە دوو چەقۆ بوەشـێنێت ئەوسـا عەباس دەست بەشـەڕدەکات، وتمان دیارە نیازی هەیە عەباس لە شـەڕ و لێدان نەدەترسا هەمــوو سـەری بەدێراوی توتن دەچـوو ئەوەندە چەقۆی لێ ڕاکێشـرابوو، پشتی کون کون ببوو بە نووکی چەقۆی پێشەکی کاتی کەلەپچەیان دەکردو لە حەوشــەکە لەبەر بەفری زسـتان دایاندەنا کەلەپچەکەی دەکردەوە، بۆیە ئیـدارەش لێی دەترسـا و لەبـەری دایاندەهێنا، عەباس هیرۆین و شـیرە و تلیـاک و گـەردی دەخوارد، هیچ شـتێک کاری تێنەدەکـرد. عەباس هێندەی باسـوخواس دەگێڕایـەوە، بۆیـە خاڵـە ئەوەنـدە گرنگی پێ نـەدەدا، بەیانی ڕۆژی دوایـی عەبـاس بـەلادا دەهات لـە ژوورە تەنهـا نەفەرییەکەی خۆی هاتــەدەرێ کە لەڕێڕەوەکەدا بۆیان دانابوو وتی: "خاڵە ئەزمەڕم گرت؟" هەر حەوتمان سـەرنجی یەکتریماندا ئەزمەڕم گرت و هیچ ڕووینەدابوو بانگمان کـرد لێمان پرسـی یانی چی؟ وتی: "ئـەو کوڕەی لەبانــەوە هێناویانە کاتی خۆی بە منداڵیش لێرەبووە کۆنە دەنکی خۆمەو ئێستا گەورەبووە دەیویست هەڵگەڕێتــەوە، بەڵام بە ئیدارەی زیندان لوتیم شـکاندو بەهاوبەشــی لەگەڵ بەرپرسـیاری زینـدان ئەمشـەو...."هەموو تەزووییەک دایگرتیـن خاڵە لێی تورەبـوو، ئێمەش هەموومـان ڕوومان لێوەرگێـڕاو ڕق و نەفرەتمان لێکرد لەخۆی و لەو ڕژێمەش ڕێگای کاری وەها دەدات.

لەم زیندانەدا پۆلیسەکان بەمەبەستی خۆیان ڕێگەیان دەدا کاری بێئەخلاقی گەشـە بکات، هەربۆیە ڕێگەیان بۆ خەڵکی وەکو عەباس خۆشـدەکرد کاری بەدڕەفتاری بکەن و پۆلیسـەکان دەرمانی بێهۆشی و سەرخۆشیان دەهێنایە ناو زیندان و بەزیندانییەکانیان بەقازانج دەفرۆشتەوە.

جارێکیـان پێـش ئـەم ڕووداوە هەموومـان دانیشـتبووین و کۆمەڵێک لەزیندانییەکانی ئێران دەووریان لێدابووین باسـی بارودۆخی کوردسـتانی عێراق کرا و باسی خەبات و ئازایەتی پێشمەرگەی کوردستان دەکرا، عەباس وتی: "من لە تاران زیندان بووم پیاوێکی کۆمۆنیستی ئێران گیرابوو ساواک زۆر هەوڵیـان لەگەڵ دەدا کە شـتێک بدرکێنێت و ناوی هاوڕێکانی بهێنێت"، وتـی: "هەرچـی کردیـان ورەی دانەبەزاند، بۆیە هەڕەشـەی ئەوەیان لێکرد ئەگەر ڕاسـتییان پێنەڵێت ئەمـن دایکی دەهێنن لەبەرچاوی سـواری دەبن". عەبـاس قەدەمـی گێڕایەوە کە پیاوە سیاسـییەکە بـە زەردەخەنەوە پێیوتن دایکـم مەمنـوون دەبێت، چونکە خۆی لەشـوێنێکدا کاردەکات، ڕۆژانە زیاتر لەچەندان ئارەزووی خەڵکی نامۆ دادەمرکێنێتەوە.. دەڵێ بەم قسەیەی داریدا بەڕۆحی سـاواکییەکاندا تۆزێک وەسـتان و پێیانوت: "باشـە تـۆ ئاگاداری خوشـکە عازەبەکەشـتی، خەڵکی سەرەی لەسـەر دەگرن"، وتی: "بەڵێ، من ئـاگادارم ئێمـە ژیانمـان زۆر خراپبـوو کـە باوکم مرد دایکم لەشـی خۆی دەفرۆشـت بۆئەوەی ئێمەی پێ بەخێوبکات، ئێسـتاش خوشکم گەورەبووە هەقە دایکم کەمێک بحەسێنێتەوە."

لێمان پرسـی پاشـان مەسـەلەکە بەچی گەیشـت، عەباس درێـژەی بە قسـەکانیدا و وتی: "سـاواکییە دڵڕەقە بێئابڕووەکان بەوەشـەوە نەوەستان، وتیان ئەوە شتێکە و پەیوەندی بە ماڵی خۆتانەوە هەیە، بەڵام ئەگەر ڕاستیمان پێنەڵێیت ئێستا هەندێک زیندانی دەهێنین سوارت بن."

عەبـاس وتـی: "زیندانییە ئازاکە وەڵامیدایەوە "کە ئێوە شـتێکی پیاوەتی لەگەڵ من دەکەن، چونکە من فێرم، بەڵام لەترسی ئەوەی ئێوە گێچەڵم پێنەکەن وازم لێهێنابـوو، ئێسـتاکە ڕازیم چەنـد کەس دەهێنن مـن زۆرم پێ چاکە". وتی: "لەوەڵامی پیاوە وشیارە شۆڕشگێڕەکە، سەریان سورماو بەشەرمەوە پاشـەوپاش کشانەوە". عەباس وتی: "لەڕاسـتیدا ئەو پیاوە کە وەها وەڵامی ساواکییەکانی دایەوە، خۆی نموونەی پیاوێکی ڕەوشتبەرز و خاوەن بڕوابوو هەموو زیندانییەکان زۆر ڕێزیان لێدەگرت و خۆشی پیاوێکی زۆر هەڵکەوتوو بوو."

## ڕۆژی دادگاییکردنمان لەشاری سەقز

ئیـدارەی زیندانی شـارەبانی ئاگاداریان کردین کـە ڕۆژی دیاریکراو بۆ دادگا ئامادەبین، ئێمەش لەناو خۆماندا قسەمان لەسەر ئەوەکرد کە لەیاسای ئەوسای ئێراندا هاتبوو، بۆ کەسێک کە سنوور ببەزێنێت (٣) مانگ، شەش مانگ، سـاڵێک هەقە سزابدرێت. ئێمە کامیان هەڵبژێرین، کاتێک برایان ئەرسەلان و ئاوات هاتن و باسی ئەوەیان بۆ کردین هەندێک هاوڕێمان گیراون هەموومان زۆر لەپەژارەدا دەژیان و زۆر پەلەمان بوو زوو ئازادبکرێین و لەسووچێکەوە سـوراغی وەزعـی کۆمەڵە بکەیـن، کۆمەڵە هێندە لامان خۆشەویسـت بوو بڕواناکـەم هیچ دایکێک لەوە زیاتر جگەرگۆشـەی خۆی خۆش ویسـتبێت، بۆیە ئێمە شەش کەسمان دەمانوت تا زووترە حوکم بدرێین، بەڵکو ئازادمان بکەن و بکەوینە سوراغی هاوڕێکانی ولاتمان، بەلام خاڵە شەهاب بەتەنیا ڕای وەهابوو ماوەی ساڵێک هەڵبژێرین و بۆی باسکردین کە بارودۆخی سیاسەت بەڕۆژ و سـەعات گۆڕانی بەسەرداديێت، با ماوەی ساڵێکمان بڕیار بەسەردا بدەن، بەڵکو تا ئەوسـا گۆڕانێک بەسـەر پەیوەندی عێراق و ئێراندا دێت، یا وەزع لە ئێران یان لەعێراق دەگۆڕێت ئەوسا بۆ ئێمە چاکە، ئێستا بەدووری مەزانن بماندەنەوە بەعێراق، هەرچی خاڵە وتی ئێمە ڕای زۆربەمان ئەوەبوو بەسـێ مانگ ڕازی بین و داوامان لە دادگاکرد کە سـەرۆکی دادگا (پیاوێکی قسەخۆش) بوو کە سێ مانگ بڕیاری زیندانیمان بدات، ئەوەبوو ئەو بڕیارەداو بردیانینـەوە بۆ زیندان، ڕۆژانە زیندانییەکان ڕۆژێک یەکێک دەیوت دەتانبەن لەتـاران ئازادتان دەکەن، ڕۆژێکیتر یەکێکیتر دەیوت دەتاندەنەوە بەعێراق و خەڵکی سەر بەئێران لەوێ هەن وەریدەگرنەوە، عەباس و هاوڕێکانی ڕەشبین بوون زۆر تەگبیر و ڕایانکرد بۆ ئەوەی لەڕێگا بیر لەهەڵهاتن بکەینەوە، بەلام تەگبیر و ڕاکانیان زیاتر بەخەیاڵ دەچوون.

ئەو ماوەیـەی پاش بڕیاری دادگا زیندانییەکان زۆر دەوریان لێدەدایین و شـەوان بە قسـەی خۆش و بەسـەرهاتەکان کاتمان دەکوشت، ئاخر ئەو شـەوەی کە بۆ سـبەینێ ئێمەیـان دەگوێزایـەوە نەماندەزانی دواڕۆژمان بەچی دەگات، شـەوەکەی خەڵکێکی زۆر هاتن تەگبیری شـاردنەوەی لەتە مـوس و بەنـی کردنەوەی کەلەپچەیـان بۆ دەکردین، کە بۆ کاتی پێویسـت کەڵکی لێوەربگرین، من و خاڵە شەهاب خەفەربووین، من هەڵسام چایەک بۆ میوانـەکان لێبنێم و بڕیاریش بوو بەیانـی هەرچی ئازووقەمان هەیە بیدەین بەزیندانییەکانیتر هەرچیشـمان هەبوو ئەوسا تاووتوێی بکەین، زۆر دەمێک بوو لەگەڵ حەسەنی بەشیری چەڵەمەشکێنەیەکمان کردبوو زیاتر لەمانگ و نیو دەبوو و حەسەن مەشهوربوو بەوەی کە کەس لێیناباتەوە، منیش خۆم

بەوەدەزانــی خــراپ نیم، بۆیە ڕێککەوتبووین لەســەر ئەوەی ئەگەر لەیەک دوورکەوتینەوە هەرکاتێک نامەی یەکتریمان بۆهات پێشکردنەوەی نەمانوت لەبیرمە ویژدانەن یەکتری ئاگاداربکەینەوە کە دۆڕاوین، چەڵەمەشکێنەکەمان وەهــای لێهاتبــوو بــوو بەجێگای ســەرنجی هەمــووان، چونکــە لەهۆڵێکی بچــووک و لەیەکتری نزیــک هی ئەوە نەبوو ئاوا درێــژە بخایەنێت، کاتێک لەڕێڕەوەکەدا تەباغە نەوتییەکەم هێنایە پێشــەوە زۆر بەملاوبەولای خۆمدا دەگەڕام شقارتەیەک پەیدابکەم لەپڕێکدا یەکێک لەپشتەوە وتی: ها، شەمچەت بدەمێ، منیش هیچ ســەرم هەڵنەبڕی و دەســتم بەرزکردەوە بۆ پشــتەوەو شەمچەکەم وەرگرت، کاتێک لەقاقای پێکەنینی حەسەنی بەشیری ڕاپەڕیم و زانیم چەڵەمەشــکێنەکەم دۆڕاند، ئای ئەو شەوە لام لەناخۆشترین شەوانی ئــەو زیندانە بــوو، هەرچیم دەکرد کەلێنێکی گەورەبوو، بــۆم پینە نەدەکرا، نەمدەزانی چۆن چام لێناو چۆن ئەو شەوە خەوم لێکەوت.

بەیانــی ڕۆژ بۆوەو ماڵئاواییمــان لەزیندانییەکانیتر کردو هەر حەوتمان براین بۆ دەرەوەی شــارەبانی و خراینە ئۆتۆمۆبێلێکی ســەربازی گەورە، دەستیان کەلەپچەکردین نەماندەزانی دواڕۆژ چی دەبێت، دڵمان بەوە خۆشبوو هەریەکە لەتە موسێکی تیژمان لەپزووی شەرواڵەکانماندا شاردبۆوە بۆ کاتێک ئەگــەر دراینــەوە بەعێراق دەماری خوێنبەر ببڕین، بــۆ ئەوەی زوو گیانمان دەربچێت، گەیشــتینە ئــەو بڕوایەی کە هەردەمان دەنــەوە بەڕژێمی عێراق، بەڵام هەندێکجاریش دەمانوت ئەوە مەســئولیاتە و تا دەماندەنە ســەرووی خۆیان گرنگیمان پێدەدەن بۆ ئەوەی هەڵنەیەین.

بەیانی ئەو ڕۆژە بەفری ســەر شــەقامەکانی ســەقز هێشتا بەتەواوەتی بلــدۆزەرەکان ڕایــان نەماڵیبــوو خۆمان کــوڵ و کۆڵبارمان کــە بریتیبوو لەســەرو پاڵتوی پیرانەی درێژ لەبەرمانکردبوو ماڵئاواییشمان لەڕەزاقی و عەلی جەمشــیدی کرد، کــە دوو کارمەندی پۆلیســی زیندانەکە بوون و بە لەســەرخۆیی ماڵئاواییمان لەشاری سەقزی کوردستان کردو بەرەو شاری کوردستان (ســنە) بە بەرزایی هۆبەتوی ساردوسڕو بەفرگرتوو بەهەوارە پیرۆزەکــەی مامۆســتا عەلی مەرداندا کەوتینــە ڕێ، بەفرێکی زۆر دەباری لەبەرزایی هۆبەتو، چەندان ئۆتۆمۆبێل لەڕێ لایان دابو و سەرنشــینەکانی کەوتبوونە بن ئۆتۆمۆبێل و لێشیان ڕەق ببوونەوە، پۆلیسە دڵڕەقەکان هیچ گوێیان پێ نەدان و ئۆتۆمۆبیلی پڕ لەژاندرمەی پێشــەوەمان و ماشــێنی پڕ لەژاندرمــەی دوامان چەند مەترێک لەماشــێنەکەی ئێمە دوور دەیان ژواند تاگەیشــتینە هەورازە پێچاوپێچەکانی ســەرووی تونێلەکەو لەولاوە سەرما تینی بۆ هێنابووین ســەرمان شۆڕکردبۆوە بەسەر دەست و قاچەکانماندا و

میزەڵدانمـــان لەبـــەر پڕبـــوون ئـــازاری زۆری پەیداکردبوو، لـــەو هەورازە سـەرکەوتین وزەمـــان نەمـــا داوامانکـرد سـەر و میزمان پێبکـەن، بەڵام ژاندرمەی ترسـنۆک گوێیان بەداواکەمان نەداو بەرەو شـاری کوردسـتان بردیانیـن، ئێوارەبـوو لەپارێـزگای سـنەدا بەقادرمەیەکـی پێچاوپێچـدا بردیانین بۆ ژێرزەمینێکی تەنگەبەر کە (٣) هۆدەی تێدابوو بە تەک یەکەوە بەو ژوورانە دەچوون لەباخچەی ئاژەڵاندا بۆ فیل و شێر و شتی لەو بابەتە دروستکراون، دەرگای شیشبەندی هەبوو لەیەکێک لەژوورەکاندا چوار پێنج ئیسـفنجی تێدابوو بۆ زۆرانبازی، باشـبوون هەریەکەیان (٢٠) سـانتیمەتر بـەرز و مەترو نیو درێژ دەبوون تاکـە ژوورێکیتری بێدەرگاش هەبوو بۆ خۆشـۆرین و سـەرئاوی زیندانەکە کرابوو، لەناویشـی واتە نـاو ڕێڕەوە یەک مەترییە پانەکەشـی دوو ئاو گەرمکـەر هەبوون، کاتێک ئێمەیان کردە ژێرزەمینەکەو دەرگایان لەسـەر داخستین و دەستیانکردینەوە کە چاومان بەو شـوێنە کەوت زۆر خۆشحاڵ بووین، چونکە ئازادانە چووینە سەرئاو پاشـان دەست و دەموچاومان شـۆری و تۆزێک پێوپلمان خاوێنکردەوە، لەڕێڕەوەکەدا هەندێک هاتوچۆمان کرد، پاشان دوو دوو (سابونە ڕەقیمان کـرد) بـۆ کەمێک پشـت تەقانـدن و ئازاری شـان و مـل کەمکردنەوە و من و ئاواتیش دەستمانکرد بەزۆرانبازی و هەندێک گەمە و گاڵتەمان کرد، تۆزێکیتر پشـووماندا و یەکە یەکە فانیلەی ژێرەوەو کراسەکانمان بەئاوی بێ سـابوون شـۆریی و دامانن بەسـەر ئاو گەرمکەرەکـە (بۆیلەر) زۆر زوو بۆی وشـککردینەوە، ئای چەند خۆشبوو شتی وەهامان بەخۆمانەوە نـەدی بوو، هەرچەندە لەژێر ئەرزبووین و لەهیچ شـوێنێکەوە ڕۆشـنایی دەرەوەمـان بـەدی نەدەکرد، بەڵام مـادام هەر خۆمان بوویـن لەچوونە سـەرئاو و جلشۆرین و قسـەکردن بێترس ئازادبووین، حەزمان نەدەکرد لـەوێ بمانگوێزنەوە، شـەو خۆیدابـوو لەسـەعات (١٠)، پیاوێکی خەڵکی سـنەیان بەبەندی هێنا، لەسەرەتا ئاگاداری یەکترمان کرد بە ئیشارەت کە لێی وریابین نەک سـاواک خۆی ناردبێتی بۆ قسە دزین، بەڵام وردەوردە ناوەڕۆکـی خـۆی بۆ دەرخسـتین کـە لەئەنجامی زوڵـم و زۆری ڕژێمی پاشـایەتیدا خۆی سەرخۆشـکردووە تـا گەیشـتۆتە ڕادەی ئالوودەبوونی تەواو لەسـەر حەشیشـەو هیرۆین، زۆری نەخایاند وەکـو هاری لێهات و هەڵسـایە سـەرپێی و چاوەکانی دەرپەڕی و کەوتە گەڕان بە بن دەرگا و بنمیچەکـەدا نەماندەزانـی بۆچی وادەکات، ئەو هـەر خراپتر دەبوو ئاخری خۆمـان پێنەگیراو لێمان پرسـی، ئەرێ برا تۆ لەچـی دەگەڕێی؟ وتی: "من شـارەزام زۆرجار زیندانـی وەکو من دەهێننە ئێرە لەترسـی ژاندرمەی و سـاواک گەرد، شیرە و حەشیشە لەم شـوێنانە دەشارنەوە، منیش وەختی ئـەوەم هاتـووە بخۆم وەزعم لەمـەش خراپتر دەبێت، بۆیە ئەگەر دەسـتم

نەکەوێت دەچمە سەر دەرگاو لێیدەدەم هەتا ژاندرمە بۆم دەهێنێت و پارەی دەدەمێ."

هەندێکیتر گــەڕا لرخەلرخی پێکەوت بەکووڕەکــووڕ چووە بەردەرگاو دەستیکرد بەقسەکردن و هاوار هاوار تا چوون بۆیان هێناو شتێکی خوارد، ئەوســا خۆیدا بەزەویدا، هەی ئێســتا مردووە، هەی سەعاتێکیتر ئێمە شتی وەهامان نەدی بوو زۆر پێی دڵتەنگ بووین.

کات خۆیدابوو لە (١)ی شــەو کەوتە جوڵەجــوڵ چاوی کردەوە ئێمەی بەدی کرد، داوای لێبووردنی کردو هەستایەوەو قسەکانی گۆڕابوو، ئارامی گرتبوو لەدەم و دویدا پیاوێکی ماقووڵ بوو برایان ڕوویان تێکردو هەندێک پرســیاریان لێکــرد، وردەوردە وەڵامیدەدایەوە بەو پیاوە نەدەچوو کە تازە هاتبوو، پەژارەی زۆری لابوو، نەیدەوێرا دەریانبڕێت، پاشــان ئەو پرســی ئێوە خەڵکی کوێن؟

وتمــان ئێمــە کوردیــن خەڵکــی کوردســتانی خوارووین، ئێســتا وەزعی کــورد زۆر خراپــە، بەعســییەکان پاشــئەوەی شۆڕشــەکەیان تواندینــەوە دەســتیانکرد بە بەعسیکردنی کورد، بەزۆر کورد لەخانووەکانیان دەردەکەن لەشــاری کەرکوک و عەرەبێکی زۆر دەخەنە شــوێنی و بەکۆمەڵ و بەناوی ئیــش بۆ دۆزینەوە کــورد دەبەن بۆ خوارو و ناوەڕاســتی عێراق و عەرەب دەهێنــن لەپرۆژەی نەوتی کەرکــوک دایدەمەزرێنن، وردەوردە دێهاتی کورد لەناو شاخەکان دەگوێزێتەوە بەناوی ئەوەی ئۆردوگای نوێ دادەمەزرێنێت، بەڵام دەیانبات بۆ خواروو و ناوەڕاســت، ئاوا بڕوات کوردســتان پڕدەکرێت لەعەرەب و کوردیش بەزۆر کچەکانی دەبێت بدات بەعەرەب و کچی عەرەب بەکورد بدات بە تەواوەتی لە چوارچێوەی عەرەبدا کورد دەتاوێتەوە و باسی کورد و کوردستان و سیاسەت ئێستا بقەیە، هەرکەسێک فیشەکی پێبگیرێت لەداردەدرێ و چەک لەکوردستاندا نابێت بمێنێت و لای هەرکەسێک بگیرێت بە واروویێخیدا دەڕۆنە خوارەوە، پاشــان باسی خۆمانم بۆکرد کە لەدەست ئــەو وەزعە ڕامانکردووەو هاتینە ئێران ببیــن بە پەنابەر، بەڵام ئەوە چوار مانگە گیراوین و ئێســتاش مەترسی ئەوەمان هەیە کە بماندەنەوە بەعێراق، دڵنیایــن هەمووان ئیعدام دەکرێین و بێ سەروشــوێن کەســێک لەخزمانمان ئاگاداری هەواڵمان نابێت، کوردە سەرخۆشــەکە وتــی: "براینە ئەوەی ئێوە دەیڵێن ڕاســتە، بەڵام وەزعی کورد لەم وڵاتەش لەلای ئێوە باشتر نییەو ئەم سەرخۆشــی و کاس و وڕیــەی منیش هەمان پــەژارەی ئێوەیە دڵنیابن هەر ئازادبووم تەیر بڕوات بۆ کوردستانی خواروو هەواڵتان دەنێرم کەوا حەوت کەس بەم ناوانە بەزۆری و بەزیندانی نێردرانەوە بۆ دەستی ڕژێمی عێراق.

ئێمـــە لەگەڵ ئەو پیـــاوەدا خافڵابووین ئاگامان لەدنیای دەرەوە نەمابوو، پیاوێکی تەمەن (٤٠) ســـاڵەیان لەدەرگاکەوە کردە خوارەوەو پیاوەکەش بە بۆڵەبۆڵ بەرەو لای ئێمە هات، ئێمە کە بینیمان لێی نەهاتینە جواب، سڵاویکردو لامانەوە دانیشت، کەوتە بۆڵەبۆڵ دژی ڕژێم و گوایە زوڵمی لێدەکەن، برادەرە سەرخۆشەکە بەتیلەی چاو تێیگەیاندین کە بڕوای پێنەکەین.

هێشـــتا پیـــاوە پیرەکـــە ئاخ و ئۆخـــی تـــەواو نەبووبوو دوو ســـاواکی، ژنێکـــی کورتـــە باڵای نەرم و شـــل و پانوپـــۆڕی زۆرجوانیـــان لەگەڵ بوو هاتنە ژوورەوەو پیاوە پیرەکەیان بانگکردو ژنەکە هەندێک قســـەی بۆکردو ساواکییەکان بانگی پیاوە پیرەکەیان کردو ئازادیان کرد.

وەکو شانۆگەری وابوو تێنەگەیشتین چۆن وەها زوو ئازادکرا، برادەرە زیندانییەکەی لامان بۆی باســـکردین و وتی: "ئەم کۆمەڵگایەی ئێران ڕژێم هەمووی فێری ڕەوشتنزمی کردووەو ئەو ژنە لەپاڵ سێبەری بەرگی شرِی ئەم پیاوەدا خۆفرۆشی دەکات و ساواکیش پارێزگاری لێدەکەن.«

چەند شـــەوێک لـــەم ژێرزەمینـــەدا هێشـــتیانینەوە، پاشـــان بردیانین بۆ دائیرەیەکیتـــر لەشـــوێنێکیتر کردیانیـــن بـــە باڵکۆنێکـــدا و خۆشـــیان لەگەڵ کارمەندەکان لەبابەت ئێمەوە قسەیان دەکرد.

لـــەو باڵکۆنـــەدا ســـێ تەنەکەی نەوتـــی لێبوو دیاربوو بۆ ســـۆپا و شـــتی دائیرەکـــە دانرابـــوو، من و ئەرســـەلان و ئـــاوات عەبدولغەفـــور ڕوومانکردە برادەرانیترمـــان و وتمان: "بـــا بەم نەوتە هەڕەشـــەیەک بکەین، بڵێین ئەگەر وەعدمـــان نەدەنێ ئازادمان بکـــەن لەئێران، خۆمان دەســـووتێنین"، زۆرمان هەوڵـــدا، بـــەڵام خاڵـــە و هاوڕێکانیترمـــان ڕازی نەبـــوون و نەیانهێشـــت ئـــەو کارەبکەیـــن، ئەنجـــام لـــەو دائیرەیـــەش گوێزایانینـــەوە، کات خۆیـــدەدا لـــە(٣)ی دوای نیـــوەڕۆ و بردیانیـــن بـــۆ ســـەربازگەیەک هەر لەناوشـــاردا ئێمەیان خســـتە حەوشـــێکەوە کە چەند هۆدەیەکی درێژی بەسەریەکەوەی تێدابـــوو بەهەیوانێکی درێـــژ بەردەمی گیرابوو، ڕووبـــەڕووی ئەمانیش لای خوارەوە هۆدەیەکی گەورەی (٥بە٨) مەتری تێدابوو لایەکی شیشبەندبوو بێ شوشـــە ناوەکەی کاشـــی لووس بوو لەبنمیچەکەی یەک گڵۆپی تێدابوو هیچ ڕاخەر و شتی تێدانەبوو ئاو و ئاودەست و شتی وەهاشی تێدانەبوو ئێمەیان کـــردە ئەوێوەو بەچەند قوفڵێکی گەورە دەرگای شیشـــبەندەکەیان لەســـەر داخســـتین، لەودیوی شیشـــبەندەکە هەمیشـــە چوار ئەفســـەر ئێشکچیبوون جگە لەوەی سەربازگەکە خۆی ئێشکچی خۆی تێدابوو، دنیا زۆر ساردبوو حەوشـــەکە (٥بـــە١٠) مەتر دەبـــوو ئەمبەرو ئەوبەریـــش خانووبوو، بەفری

زیــادەی ســەربانەکانیشماڵدرابــووە ناو حەوشــەکەوە، ئەوەنــدە بەفری تێدابــوو مرۆڤ ســامی لێدەکــرد، بایەکی یەکجار بەتین دەهات، شوشــەی بەستەڵەک بەگوێسەبانەکانەوە شۆڕبووبۆوە وەکو نەشتەر مرۆڤی دەبڕی، ئێشــکچییەکان پۆســتاڵی ســەربازی توندیان پێچابوو، پاڵتۆی ســەربازی دوگمەکانیان گرتبوو، سەروکڵاوی گەرمیان لەسەر کردبوو، بەناو درێژایی هەیوانەکــەی خۆیاندا دەهاتن و دەچوون و چاودێری ئێمەیان دەکرد، هەر جار ناجارێک پۆستەکەیان دەگۆڕی ئەوهاش زۆر پەرێشان دەبوون.

ئێمەش لەژوورێکی ســاردو بێ ئاگرو شیشبەندو بێ ڕاخەردا باشترین نوێنمان بریتی بوو لەنێو جزمەکانمان و پاڵتۆ پیرانەکەی دەهاتە ئەژنۆمان، لەژوورەکــەدا دەهاتیــن دەچوویــن خۆمان کۆرش کردبۆوە شــێت ئاســا هەندێکجــار گورگە لۆقەمــان دەکرد هەندێکجار ســەرمان بەیەکدا دەکردو فوومان لەدەستمان دەکردو لەیەکتری نزیکدەبووینەوە هەریەکە بەشتێکەوە مێشــکمان خەریککردبوو بیــری زۆرمان لەوە دەکردەوە کــە دەماندەنەوە بەعێراق و دەبێت لەوێ چیمان لێبکەن؟

کات خۆی دابوو لەدووی شــەو، برادەران لەگەڵ ئەفســەرەکان کەوتنە قســەکردن وتیان، ئەرێ برا ئێوە نیازتان هەیــە چی لەئێمە بکەن، خۆ ئێمە هاتووین بۆ پەنابەری ئەم زیندانی ئازاردانەی بۆچییەو خۆ ئێمەتان لەجەنگدا نەگرتووە.

زۆر بەبێ شەرمانە وتیان: "ئێمە کچی خۆمان ناکەین بەقوربانی کوڕی خەڵکــی"، ئێمــە ئێــوە دەدەینەوە بە عێــراق و (١٨) ئەفســەری ڕاکردووی شاهەنشــایی لەعێراق وەردەگرینەوە بەم قسەیەیان دڵنیایان کردین لەوەی دەماندەنەوە بەعێراق ئەوسا خێرا خێرا کەوتینە پیاسەو ئاگامان لەو هەموو سەرمایە نەما کە ویژەی و ورشەورشی باو ساردی تەوژمی بەفر لەموسی ناسێت تیژتر مرۆڤی دەبڕی.

## هەڵوێستێکی ئازایانەی کاک جەعفەر

بەبیســتنی هەواڵی دانەوەمان بەعێراق هەنگاوی هاتوچۆمان زیاتر کرد، دوو بــەدوو کەوتینــە وتووێژ کەچی بکەین؟ و چی بڵێین؟ هەڵوێســت چی بێت؟ وەڵامی پرسیاری لێکۆڵینەوە لەبەردەمی ئەمندا چی بێت؟ چونکە ئێمە دڵنیابووین دەکوژرێین، جا کام هەڵوێست ڕاست و نەمرانەیە بیگرین؟

مامۆستای ئازا جەعفەر بانگیکردین و لەناوەڕاستی هۆڵەکەدا دەستێکی درێژکــرد نیشــانەی پەیمــان بــە یەکتریدان بۆ ئــەوەی کام هەڵوێســتمان دەستنیشــانکردو پەســەندمانکرد پەیمــان بدەیــن لێــی پاشــگەز نەبینەوە، ئێمەش هەموومان دەســتمان خستەســەر دەستی و بڕیارماندا کە بەرگری لەبیروباوەڕمــان بکەیــن و هەوڵبدەین کۆمەڵە بپارێزین بەخوێنی خۆمان و هاوڕێکانمان سەربەرز بکەین بەگرتنی هەڵوێستی نەترسانە.

ئێشکچییەکان و ئەفسەرەکان لەکۆبوونەوەی ئێمەو دەست خستنەسەر دەســتی یەکتریمان سەریان سوڕمابوو، ئەوان لەسەرما خۆیان پێناگیرێت، ئێمــەش لەئێــوارە زووەوە هاتوچــۆ دەکەیــن، کــە چــی تــازە ورەمــان بەرزتردەبێتەوە و هەستی خۆشەویستی و ورەی شۆڕشگێڕی و تەباییمان بەرزتر دەبێتەوە.

خاڵە شــەهاب مامۆســتای دنیادیدەی هــاوڕێ و برامان وتــی: "من پێم چاکــە بــە کەڵەپیــاوی بمرین و ســەر بــۆ دوژمــن شــۆڕنەکەین و خۆمان شەرمەزاری مێژوو نەکەین، هەڵوێستمان ئەوەبێت بەرگری لەبیروباوەڕمان بکەیــن بەیەکەوەو یەکدەنــگ لەبەردەمی لێکۆڵینەوەدا بڵێیــن: "ئێمە (تەنزیم) نیــن و نــە ئابوونەمــان داوە بەکــەس و نەکــەس ئابوونــەی داوەپێمان، چاپەمەنی و بڵاوکراوەشــمان نەبووە، بەڵام ئێمە شەپۆلێکی بیروباوەڕیین (تەیاری فکری)ن، لەناو خەڵکدا هەوڵمانداوە کە خەڵکی خۆی بەبیروباوەڕی پێشــکەوتووانە پەروەردە بکات و دژی سیاسەتی بەزۆر بە بەعسیکردن و بە عەرەبکردن و بەزۆر ڕاگوێزان."

ئێمــە بەخەڵکمــان وتووە باشــتر خۆتان پــەروەردە بکــەن بۆ ئەوەی بەرێگای ڕاســتدا ڕابەری بزووتنەوەی شۆڕشــگێرانەی کوردایەتی بکەن و لەدەست سیاسەتی چەوتی ئێوە خۆیان ڕزگار بکەن."

خاڵە شــەهاب وتی: "من دەڵێم بەرپرسیاری یەکەمی بیروباوەڕەکەمم و بەخەڵکم وتووە کە بخوێننەوە، وتی: ئێوەش بڵێن ئێمە بەیەکەوە تەنیا کتێبمان خوێندۆتەوە، ئەو برایانەی ئێستاش گیراون و لەژێر دەستی ئەمن دان ئێمەش

دەناسـن و لەگەڵماندا لەسـەرکردیەتیدا بوون کە دەممان گەیشـتە ئەوان ئاگاداریـان بکەین بەدوای ئێمەدا هەمان قسـەی ئێمـە بکەنەوەو هەموومان لەسـەر ئـەوە ڕێککەوتین کە هەندێکمان لەئێران زیندان بووین بەناسـیاو و لەسـەر دەستپێشکەری هەڵوێسـتی ئازایانەی جەعفەر عەبدولواحید و قسە بەنرخەکانـی خاڵـە شـەهاب ڕێککەوتیـن و جارێکیتر بڕیارمانداو دەسـتی یەکترمان گوشی بەپەیمانی کوردانەو کردمان بە بەرنامەی کاری زیندان.

## ساڵی نوێ

سەری ساڵی نوێ لەهەموو دنیادا خەڵکی یادی ڕابوردووی دەکاتەوەو نەخشـە دەکێشێت بۆ ساڵی تازەو ئەو شـەوەش ئاهەنگی تێپەڕبوونی ئەو سـاڵی ڕابوردووە دەگێڕن، بەڵام ئێمە لەو سەرماوسـۆڵەو سەهۆڵبەندانەدا لەتەگبیـر و ڕای ئەوەدابوویـن کـە گەڕاندرایـنـەوە عێـراق چـی وەڵامـی لێکۆڵینـەوەی دەزگاکانی ئەمن و مخابـەرات بدەینەوە، چۆن ڕێگای مردنی سەربەرزانە هەڵبژێرین.

## ڕۆژی ١/١/ ١٩٧٦

بەیانی ١٩٧٦/١/١ دەسـتیان کەلەپچەکردیـن و چەند ئۆتۆمۆبێلێک پڕکرا لەچەکداری پۆلیس و بەڕێکراین بۆ شاری مەریوان بەئێشک لێگرتنێکی زۆر گرنگەوە، کاتێک گەیاندیانینە شاری مەریوان بۆ جگەرەخۆرێک ڕایانگرتین و پاشان بەرەو مەرکەزی بناوەسوتە بە بەردەمی گۆلی مەیوی زرێباردا بردیانین، ئێوارە دنیا خەریکی تاریکبوون بوو، گەیاندیانینە نزیکی بناوەسوتەو هەندێک پۆلیسـی عێراقی هاتن، ئێرانییـەکان ئێمەیان دایەوە دەسـتیان و گەڕانەوە دواوە سـەرەتا ویستمان هەندێک پۆلیسـەکان خاوبکەینەوە و وتمان ئێمە لەکۆنەوە لەئێران بووین ئێسـتا خۆمان داوامانکـردوەو هێناویانینەتەوە تا ڕادەیەک لەناو مەرکەزەکە خاو بوونەوە، یەک دوو پۆلیسـی کورد خەڵکی سـلێمانی بوون هەندێک لەبرادەرانیان وەکو خەڵکی شـار دەناسـی، بەڵام نەیاندەزانی کاری سیاسییان چییە.

خۆمـان لەڕێگـە ڕێککەوتبوویـن لەسـەر ئەوەی ئەگەر هەل ڕەخسـا ڕابکەین و ناوی نهێنیمان کردبوو بە (تەتەشـم) کە ناوی نهێنی کارکردنی ئێمە بوو بۆ کۆمەڵە لەجیاتی ئەوەی بمان وتایە کۆمەڵە دەمانوت تەتەشـم، وەک بڵێیت: تەتەشم (وتی، کردی، دەیکا).

لەنێوانی بناوەسـوتەو پێنجوێن هەل ڕەخسـا هەندێکمـان ناوەکەمان هێنـا، بەڵام ڕاوبۆچونەکان یەکی نەگرت و ڕاکردن سـەری نەگرت ئەگینا زۆر چـاک ڕێکەوتبو و دەشـکرا، بەڵام نەمانتوانـی یەکبگرین، هەرچەندە هەتـا چووینە ناوشـاری پێنجوێن کاک عومەری سـەید عەلی هەر لاڕێی دەگرت و دەیویسـت ڕا بکات.

کات خۆیدابوو لە (١١)ی شەوی ١٩٧٦/١/٢\١١ شەوقی گڵۆپی پێنجوێنمان لێدەرکـەوت، کاک عومەر هەر نیازی ڕاکردنـی هەبوو منیش هەر بەدوایدا دەڕۆیشـتم، خەڵک لەناوشـاردا کـەم هاتوچۆی دەکرد، توشـی (٣) کورد بووین یەکیان کاک عومەری سەید عەلی دەناسی زانیان ئێمە گیراوینەتەوە، بۆیە کاک عومەری سـەید عەلی ئاگاداریکرد کە بەخزمان ڕابگەیەنێت ئێمە گەیشـتووینەتەوە مەرکەزی پێنجوێـن، ئامانج لەوەش ئەوە بوو هاوڕێیانی کۆمەڵە بزانن و خۆیان بپارێزن.

ئێمەیـان بـردە مەرکەزەکە، خێـرا دەرگایەکی بچکۆلەی شیشـبەندیان لێکردینـەوەو کردیانینـە ژوورێکی بچکۆلـە کە (١٢) زیندانیتـری تێدابوو، بەفر لەپێنجوێن هەر زۆر بوو لەڕێگا کەمتر سەرمامان بوو، چونکە بەڕێدا

دەهاتین، بەڵام کە کەمێک پشـــوومان دا سەرما پەیدا بۆوە، زۆرمان برسی بوو زیندانییەکان ماستێکی زۆریان لابوو لەدێهاتەوە بۆیان هاتبوو، چونکە ئەوانیـش بەبوختـــان گیرابـوون، کە چەک و شـــتی وەهایان شـــاردۆتەوە، پێیانوتیـــن نان و ماســـتی چاکمان لایە ئەگەر دەخۆن و برســـیتانە، ئێمەش بەهەلمانزانی و وتمان چاکە خێرا ئازایانە چایان بۆ لێناین و تێریان کردین، پاش نانخواردن و کەمێک بوژانەوە پرسیاری سەرئاومانکرد وتیان شەوان دەرگامـــان لێناکەنەوە تا بەیانی میز دەکەینە ئەو تەنەکەیەوە، ســـەرنجێکی تەنەکەکەمانـــدا زۆری نەمابـــوو پڕببێـــت لەمیز، ســـەیرێکی یەکتریمان کرد کەسمان لەڕوومان نەهات، بەڵام هەمووشمان میزەڵدانمان زۆر پڕبوو بوو، هیچ چار نەبوو هەر دەبوو بەتاڵیبکەین بەتاڵکردنیشی شتێکی ئاسان نەبوو چاو و ڕووی دەویســـت و یەکەمجاریشە ڕووبەڕووی موشکیلەیەکی وەها دەبووینەوە، کاتێکمانزانی خاڵە شـــەهاب هەڵســـاو پشـــتی کردە خەڵکەکەو هەندێک ئاوی ڕشـــتە تەنەکەکەوەو وتی هەڵســـن ئێوەش ئاوەکانتان بەتاڵ بکەن، ئەوسا ئێمەش یەکە یەکە بەدوایدا ئاوەکانمان بەتاڵکرد، بەڵام تەنەکەکە وردە وردە لێی دەڕژایەوە و دەهاتەژێر جێگاکان.

شێوەو شکڵی ئێمە هەر حەوتمان شتێکی نوێ بوو بە نیسبەت زیندانییەکان هەموومـــان نیوە جزمـــەی ئێرانیمان لەپێبوو، بەتێکڕایـــی پاڵتۆکانمان وەکو یـــەک بوون هەتـــا ئەژنۆمان، هەموومان ڕیشـــمان هاتبوو دوو دەســـتەش بوویـــن، هەندێـــک باڵابـــەرز و باریک ئەوانیتر پڕو تۆکمـــە، ئەگەرچی باڵای مـــن و فەرەیدون لەهەموویان کورتتـــر بوو، زۆر تەباو ڕێک و برابووین و شتی بێسەرەوبەرەمان نەدەکردو نەدەوت، هەرچی سەریان دەهێناو دەبرد نەیاندەزانی ئێمە براین یان دۆست و خزم.

لەترسی ئەوەی سەرنگون نەکرێین و بۆئەوەی خەڵکی ناوەکانمان بزانن لەچەند جێگایەکی زیندانەکە هەر ئەو شەوە ناوی کات و هاتنەوەی خۆمان نووسی لەسەر دیوارەکە.

## هاتنی جێگری ئەمنی سلێمانی

ڕۆژی دووەم بوو کە جێگری ئەمنی سلێمانی بەخۆی و دووسێ ئۆتۆمۆبێلەوە خۆی کرد بەناو مەرکەزەکەدا، ئێمە نەماندەزانی، بەڵام زیندانییەکانیتر هەڵسانە سەرپێ و وتیان جێگری مودیری ئەمنی سلێمانییەو زۆر لەخۆیان دەترسان، ئێمەش کە زانیمان لەدڵی خۆماندا دەمانزانی بەدوای ئێمەدا هاتووە، ئەو ڕۆژە واتە ١٩٧٦/١/٣ بوو، کاتژمێر دەی بەیانی بوو بەلیست ناوەکانیان، خوێندینەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. شەهاب نوری سالح

٢. فەرەیدون عەبدولقادر

٣. جەعفەر عەبدولواحید

٤. عومەر سەید عەلی

٥. ئاوات عەبدولغەفور

٦. ئەرسەلان بایز

٧. عەلی محەمەد قادر (عەلی بچکۆل)

ئەوسا خەڵکەکەیتری ژوورەکە دڵنیابوون ئێمە شتێک هەین و ئەم جێگری ئەمنەش بەدوای ئێمەدا هاتووە بمانبات ئەوسان کەمێک ئارامبوونەوە.

ئێمەیان بردە ئاودەستەکان و چاویان بەستینەوە، یەکە یەکە لێیان دەپرسین کە چاومان دەبینێت یان نا، هەموو پاکانەمان کرد کە نابینێت و توند بەستوویانە، سەرە گەیشتە سەر کاک عومەری سەید عەلی لێیان پرسی: "بەشەرەفت نابینێت؟" کاک عومەریش لەوەڵامدا وتی: "نە بەشەرەفت چاوم نابینێت"، کابرا سوندەیەکی کێشا بەسەریداو دووبارەیکردەوە بەشەرەفت چاوت نابینێت؟ کاک عومەر هەمان وەڵامیدایەوە، سمرسمرێکی سەیر دروستبوو بوو، بەڵام چاک بوو کابرای ئەمن دایهێنا هەندێک هەڕەشەوگوڕەشەیان لێکردین، بەڵام لێیان نەداین و پاش چەند خولەکێک دەستیان توند کەلەپچە کردین و دوو دوو فڕێیانداینە ناو ئۆتۆمۆبیلێکی بچووک و چاوەکانیشیان هەر نەکردینەوەو لەمەرکەز چووینە دەرەوە بەرەو شاری سلێمانی، بەفرێکی زۆر باریبوو ئۆتۆمۆبیلەکان زۆر لەسەرخۆ دەڕۆیشتن ئێمە نەماندەزانی لەکوێوە دەمانبەن، کاتێک هەستمانکرد

سـەر شـەقامە، دەنگی خەڵکێکی زۆر دەهـات ئۆتۆمۆبێلێکـی زۆر هەبوو هۆڕنیان لێدەدا، لەدەمودوی خەڵکەوە هەسـتمان بەوەکرد گەیشـتووینەتە شـاری سەیدسادق، ئێمە نەماندەتوانی سـەر بەرزبکەینەوە خێرا ئەمنەکان سـەریان پێدەخسـتینەوە خوارەوە، پاش هەندێک وەسـتان کەوتنەوە ڕێ، گفەگفـی بـا قایمتر دەبوو دنیـا بەتەواوەتی سـاردیکرد ڕوو لەئێوارەیەکی درەنگ دەڕۆیشـتین پێسـتمان شـین بووبۆوە لەسـەرماو هەنـدە خۆمان گرمۆڵـە کردبـوو، چونکـە شـوێنەکەمان زۆر تەنگەبەر بـوو، بۆیە لەگەڵ گرمۆڵەییەکەمان ڕاهاتبووین و خۆمان پێڕاست نەدەکرایەوە، سەرما کاری خۆی تێکردین جارێکیتر حەوزی ئاوەکەمان پڕبۆوە دەسـتمان بەستراوەو چاویش، هەروەها داواکردن بۆ ڕێگادان بۆ بەتاڵکردنی حەوزی ئاوەکەمان سوودێکی نەبوو، بووبوو بەهیوایەت دەمانوت بڵێی بگەینە جێگایەک و بتوانین میزەڵدانەکانمان بەتاڵبکەین، سەیتەرەکەمان هەست پێکرد کە لەسلێمانییەوە نزیک بووینەتەوە، بەڵام لەشاردا نەماندەزانی لەکوێوە دەمانبەن و بۆ کوێ دەمانبـەن، کاتێکمان زانی کردیان بەبن هەنگڵمانـداو فڕاندیانین و لەپڕێکدا فڕێیان داینە شوێنێکەوە نەماندەزانی ژوورە یان شوێنێکیترە.

ئەو ژوورەی ئێمەی تێدا فڕێدراین دەنگی هەناسەی خەڵکیتری لێدەهات، پاش تۆزێک بەزمانی عەرەبی بەپێی ڕابردوومان دەسـتیانکرد بەپرسیاری پڕوپـوچ لێکـردن، لەبەرئەوەی ئێمە لەئێرانەوە خۆمان بۆ شـتی لەو بابەتە ئامادەکردبوو هیچ پێیدڵگران نەبووین و بەهەندمان نەدەزانی.

## بۆ وا بەگرنگییەوە لە ئێمەیان دەڕوانی

کۆمیتەی ئەستێرەی سوور لەساڵی ١٩٧٤ دروستبووە بۆ سەرپەرشتی ڕێکخراوەکانی شــارەکانی هەولێر، کەرکوک، بەغدا، ســلێمانی و شارەکانی تری کوردستانی عێراق.

١. شەهید جەعفەر عەبدولواحید لێپرسراوی بووە.

٢. ئەنوەر زۆراب.

٣. ئاسۆی شێخ نوری ئەندام و لێپرسراوی سلێمانی کۆمەڵە.

٤. ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب).

ئەبو شەهاب پاش ماوەیەک پەیوەندیکرد بەهێزی پێشمەرگەوەو چووە شاخ، شەهید جەعفەر سەرپەرشتی شاری کەرکوکی کۆمەڵەی دەکرد.

دوای هەرەســی شۆڕشــی چەکداریی، هاوڕێیان عومەر ســەید عەلی و هــاوڕێ عەلــی بچکۆل بــوون بەئەندامی کۆمیتەی ئەســتێرەی ســوور کە ئەوسا بەرزترین کۆمیتەی سەرپەرشتی کۆمەڵە بوو، هەرچەندە فەرەیدون عەبدولقادر و خاڵە شەهاب شێخ نوری لەپشتەوە هاوکارییان دەکردن.

## قۆناغی یەکەمی لێکۆڵینەوە لێمان

کاتێک گەیاندینیانە ژێرخانەکەی ئەمنی سلێمانی لەیەک دایانبڕین و خاڵە شەهاب و عومەری سەید عەلی و فەرەیدون و من لەژوورێکدا بووین، شەهید جەعفەرو ئاوات و ئەرسەلانیش لەژوورێکیتردا بوون، ئەو ژوورەی ئێمەیان تێفڕێدا هەناسەی خەڵکیتری لێدەهات، هەستمان لێڕاگرتبوون و چاوەڕوانی سەدایان بووین، زۆر خۆیان نەگرت و کەوتنە دوان بەزمانی عەرەبی، سەرەتا هێرشیان کردە سەر حکومەت و باسی شێوەی ئازاردانیان دەکرد، دەیانویست تێمان بگەیەنن کە زۆر بێزەمیرن، وردەوردە کەوتنە پێڕابواردنمان، ئێمە چاو و دەستمان بەسترابۆوە نەماندەدیتن، زۆری نەخایاند یەک دوو پۆلیس هاتن بەدوای خاڵە شەهاب و فەرەیدون و جەعفەر عەبدولواحید دا، ماوەیەکی زۆر نەیانهێنانەوە، هێشتا ئەوان نەگەڕابوونەوە یەکە یەکە ئەوانیتریش بانگکراین بۆ شوێنی جیاو تەنیا تەنیا قسەیان لەگەڵ کردین و کەوتنە پرسیارو زمان و کێشانەوەو هەڕەشەوگوڕەشە، ئێمە هەر چۆن لەسەر ئەوە ڕێککەوتبووین کە بەرگری لەبیروباوەڕمان بکەین، هەر کەسە لەلای خۆیەوە بەرگری قارەمانانەی خۆیکرد بێئەوەی سڵ بکەینەوە لەدوارۆژ چی ڕوودەدات.

کاتێک براینەوە شوێنەکانمان بۆمان دەرکەوت خاڵە شەهاب و ئەو دوو برادەرەیتریان بردبووە بەردەمی لیژنەیەکی بالای لێکۆڵینەوە کە پێکهاتبوو لەمونەزەمەی بەعس و مودیریەتی ئەمنی سلێمانی و مەنزومەو حاکمی تەحقیق، کە ئەوسا حاکم عومەر ناوێک بوو کە خەڵکی سلێمانی بووەو لەگەڵ کاک شەهابدا یەکتریان چاک دەناسی، پاشان ئەو لەدەرەوە گێڕابوویەوە کە چۆن ئەم سێ هاوڕێیەمان چوون بەگژ سیاسەتی چەوتی بەعسدا، چۆن ئازایانە بەرگریان لەبیروباوەڕی خۆیان کردووەو دژی سیاسەتی بەعەرەبکردن و بە بەعسیکردن و ڕاگوێزانی بەزۆر قسەیان کردبوو. بەگشتی بەرگرییەکی باشیانکرد هەر وەکو ئەوەی لەسەری ڕێککەوتبووین، وتمان: "تەیارێکی فکری لەکوردستاندا شەپۆل دەدات و ئێمەش دەورمان هەیە لەهاندانی خەڵکی بۆ خوێندنەوەو خۆ پەرەوەردەکردن بەنیازی خۆ ڕزگارکردن لەدەست سیاسەتی چەوتی ئێوەو هەر بۆیە بەناچاری کوردستانمان بەجێهێشت و ویستمان بڕۆینە زەفارو لەگەڵ شۆڕشگێڕانی ئەوێدا کاربکەین و خۆمان لەم گێژاوەی ئێوە دوور بخەینەوە، چونکە نەماندەتوانی چاو لەئاستیدا بپۆشین.

پێدەچوو بەرگریکردنەکەمان سەرنجی لێپرسراوانی ڕاکێشابێت، وەها بەبێترس و ڕاستگۆیانە قسەمان لەڕوویاندا دەکرد، گەیشتبوونە ئەو

بڕیارەی بماننێرن بۆ ئەمنی عام لەبەغداو لەوێ شانۆگەرییەکە تەواو بکەن بۆیە لێمان بێدەنگبوون. ئەو شەوەو لەلایەکیترەوە پێش ئەوەی ئێمە بگەین ژوورەکەیان ئەڵغامڕێژ کردبوو، ئەو دوو ئەمنەیان خستبووە ژوورەوە بۆ ئـەوەی لەئەنجامـی بەیەکەوە ژیاني چەند ڕۆژەدا بتوانن بەڵگەیان دەسـت بکەوێت لەســەرمان، چونکە هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆیان پێشووتر بەدەستەوە لەسەرمان نەبوو.

کاتێک هەمووم‌انیان گێڕایەوە تەنها چاوی فەرەیدون و خاڵە شـەهاب و جەعفەریــان کردبۆوە ئێمە هەر بەچاو و دەســت بەســتراوی مابووینەوە، فەرەیـدون عەرەبییەکـی چاکـی دەزانــی و زمانی خسـتەگەڕو بەمەولای مــەولای لەگەڵیاندا کەوتە قســەکردن و ڕازیکردن بەوەی داوامان بۆ بکەن لەپاســەوانەکانی بەردەرگا کە چاو و دەســتمان بکەنەوەو ڕێگەشمان بدەن بمانبەن بۆ ســەرئاو، بەڕاســتی، چوونە سەرئاو شتێکی زۆر پێویست بوو، چونکە هەر لەپێنجوێنەوە تا سلێمانی بەناو بەفرو سەهۆڵبەنداندا هاتبووین وەها کەســیرە بووبووین هەمیشــە حەوزی ئاوەکانمان پڕبوو، هەرچۆنێک بوو بردیانین بۆ ســەرئاو، بەڵام نەیانهێشت بە تەواوەتی بەتاڵی بکەین بەر داریاندا‌ین بۆ دواوە.

هۆدەکە بەتاڵ بوو پێخەفمان نەبوو یەکێک لەئەمنەکان لێفەیەکی لۆکەی زۆر گەورەی لابوو دای بەئێمە هەموومان چووینە ژێری بۆ ئەوەی هەڵاژین، ئازاری لەشمان نەیدەهێشت بۆ ساتێکیش بێت چاولێکنێن و بڕۆینە جیهانی دەرەوە.

ئەوبوو شــەوی یەکەم دوای ئەوەی تێر تێر گاڵتەیان پێکردین و هەوڵی زمــان دزینیــان لەگەڵ دەدایــن، لەئەنجامی زمان شــیرینی هاوڕێیانمانەوە گەیشتینە ئەو بڕوایەی سەعات یەکی شەو دوو سێ ئەمنیان ناردو بەپارەی خۆمان نان و کەباب و چایان لەناو شــاری ســلێمانی بۆ کڕین و پاش پێنج شەش مانگ تێر تێر نان و کەبابمان خوارد.

ئێمــە کەڵکــی چاکمان لــەو ئەمنانە وەرگــرت بەتایبەت بۆ پێویســتی و چوونە ســەرئاویش دەشمانویســت زووزوو بڕۆینە دەرەوە بۆ ســەرئاو، چونکە ژوورێک بەرامبــەری ژوورەکەی ئێمە بوو دەنگەدەنگی لێوەدەهات دەمانویست یەکێک ببینین و تێیان بگەیەنین کە ئێمە بە بەندی دراوینەتەوە بەعێـراق بــۆ ئەوەی هەواڵمــان بگاتــەوە هاوڕێکانی کۆمەڵە و کەســوکار لەو هاتوچۆیەی ئێمەشــدا زیندانییەکانی ئــەو ژوورەش بە ئاگا هاتبوون و یەکەیەکە لوتیان دەنا بەکونە بچووکە هەواکێشەکەی دەرگاکەوەو هەستیان

ڕادەگرت و هەناســەیەکیان هەڵدەکێشا، لەپڕێکدا یەکێک بەدەنگی بەرز وتی وەزعی (تەتەشــم) خراپ نییە هەرچەندە هەندێـک برادەریان گیراوە، بەڵام گــوێ مەدەنێ زیندان هێندە ســەخت نییە فشەیەفشــە، لەوکاتەدا عومەری ســەید عەلی و فەرەیدون لەســەرئاو دەهێندرانــەوە، فەرەیدون دەنگەکەی ناســیبۆوە کــە عەلی ئامەخانــی ژنبرایەتی بۆیە کە هاتنــە ژوورەوە بۆیان باســکردین عەلــی ئامەخانــەو گیــراوەو ئەو قســانەش هی ئــەون باس لە (تەتەشــمەوە) دەکات برایانــی ئێمەش هەوڵیاندا کەڵک لــەو هەلە وەربگرن لەســەر وەزعی (تەتەشــم) و هاوڕێکانی بە بەرنامەو بەگۆڕانی و قســەی بەرزکردنەوە پرسیارەکان بکەین.

ئــەرێ براگیــان چەنــد بــرادەر گیراون و کــێ و کێن و چییــان وتووە ناوی تەتەشــم هاتووە یان چی وتراوە لەســەر ئێمە کێ قسەی کردووەو چــی وتووە؟ کەس شــەهید نەبووە؟ تۆ لەســەرچی گیراویــت؟ لەگەڵ تۆ کــێ گیراون و لەســەر چی؟ ئایــا دەهێڵن خەڵکی بێتە لاتــان؟ پەیوەندیتان بەکەســوکارەوە هەیە؟ دەتوانن هەواڵی ئێمە بگەیەنن بۆ دەرەوە؟ شــێوەی ئازاردان چی هەیە؟ زۆر بە ژیرانەو لەسەرخۆ وتی: "زیاتر لە (٢٦) هاوڕێی کۆمەڵە گیراون لەســلێمانی، کەرکوک، هەولێــرو بەغدا، هەموویان لەئەمنی عامن، تیایاندا هەیە ناوی کۆمەڵەی هێناوە، ئێستا ڕێکخستن خۆی گرتۆتەوەو گرتن وەستاوە، هەندێک خەڵک لێرە لەگەڵ مندان کوردن پیاوی خراپ نین، بەڵام کەمیان بەڵگەیان لەسەرەو هەر لەژێر لێکۆڵینەوەن و منیش مەسەلەی کڕین و فرۆشتنەو هیچ باسی تەتەشم لەسەر نییە.

ئازاردان شێوەی زۆرە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ بڕوای بەخۆی هەبێت هیچ مرۆڤی ئازا ناڕوخێنێت و گوێ مەدەنێ فشەیە فشە، عەلی ئامەخان دەورێکی مەعنەوی چاکی هەبو و چاوســاغی چاکی بۆ کردین لەئەمنی ســلێمانیدا و وتی: "سبەی هەواڵ دەنێرم خزمان بێن و داواتان بکەن و بتان بینن ئەگەر ڕێگاتان بدەن."

قەســەکانی عەلی ڕۆشنایی خستەســەر داهاتوومان و خۆمان بۆ ئەوە سازدا لەفرسەتێکدا ئەگەر دەنگمان گەیشتە هاوڕێکانی زیندان پێیانڕابگەیەنین حاشا بکەن لەبوونی کۆمەڵەو ڕێکخستن و هەرچی قسەشی کردووە بینێتە ســەر تەیاری مارکسی- لینینی و پینەی بکات و ئاگاداریان بکەین ئێمە ئەم نەخشــەیەمان بۆ ئەوە کێشاوە بەرگری لەبیروباوەڕمان بکەین و خۆشمان واتە کۆمەڵەش لەتیاچوون بپارێزین.

دیار بوو هەم عەلی ئامەخان و هەم حاکم عومەر کە دادوەری دائیرەی ئەمن بوو ناسیارو دۆستی ناوشاری خاڵەش بوون، ئاگاداری خزمانیان کردبۆوە، بۆیە ماڵی فەرەیدون و خاڵە شەهاب و جەعفەر و عومەری سەید عەلی و ئاوات عەبدولغەفور هاتن و چاویان بە برادەران کەوتبوو.

ماوەی (٥) ڕۆژ لەئەمنی سلێمانی ئێمەیان هێشتەوە تەنیا یەکجار پرسیاریان لێکردین و بەس، لەم ماوەیەدا چەند جارێک لەڕێگای سەرئاوەوە کاک جەعفەر و کاک ئاوات و کاک ئەرسەلانمان بینی لەپەنجەرە بچووکەکەی سەر ڕێگای ئاودەست ئەویش ئاوات بۆ پێکەنین ملی درێژکردو ئیشارەتێکی پێکەنیناوی دەداینێ، دەبوو بەهۆی ئەوەی ئێمەش بەپێکەنین بهێنێت، مانەوەمان لەم (٥) ڕۆژەدا وایکرد ئەو دوو ئەمنەش لەگەڵماندا تێکەڵاو بن و هەندێکیشمان لەسەر بێ بەشی خەڵکی کوردستان قسە بۆ کردبوون و هەندەشمان باسی بێتاوانی خۆمان بۆ کردن هاوکاری چاکیان دەکردین لە هاتوچۆ و شت بۆ کڕین و هەتا لەژوورەکەدا ئێمە هیچ شتێکمان نەبوو ڕای بخەین یان پێی بخەوین ئەوان لێفەیەکی گەورەو بەڕەیەکی ژێریان داینێ، زوو زووش مشووری چا و خواردنیان بۆ دەخواردین هەوڵی خۆشیان دەدا وەکو ئەمن بتوانن وشەیەک بدزن و بیگەیەنن، بەڵام ئێمە زۆر وشیاربووین، چونکە لەژێر دەستی چاودێری ساواک تەجروبەمان وەرگرتبوو.

ڕۆژی ١٩٧٦/١/٨ بوو زوو هەر دوو ئەمنەکە ئاگاداریان کردین کە ئەمڕۆ دەمانبەن بۆ پۆلیسخانەی سەرای سلێمانی و لەوێ ئازادمان دەکەن، ئێمە پێمان نەوتون درۆدەکەن ئێمە بەنیازبووین بێسەروشوێن بکرێین و لەناو ببرێین، ئێستا خێرە بە یەک لێکۆڵینەوە لەژێر دەستی ئەمندا ئازاد بکرێین، شتێک بوو کە هی ئەوە نەبوو بڕوای پێبکەین و تێکڕامان ڕامان وەهابوو دەمانبەن بۆ شوێنێکیترو نیازیان هەیە لەسلێمانی لامان بەرن و بە پێویستمانزانی بە دەنگی بەرز قسە لەگەڵ یەکتری بکەین بۆئەوەی عەلی ئامەخان تێبگات و ئاگاداری ئەوەبێت کە ئەمڕۆ لێرەمان دەگوێزنەوە بۆ ئەوەی ئەویش بەخزمان ڕابگەیەنێت.

کات خۆیدابوو لە (١٠)ی بەیانی بانگیان کردینە ژوورێکیترو خێرا کەلەپچەیان کردین و هەر لەحەوشەی ئەمندا خستیانینە ئۆتۆمۆبێلەوەو کەوتینەڕێ، هەروەکو چۆن خۆمان پێشبینیمان کرد ئەوە بوو بە جادەی سلێمانی- چەمچەماڵدا کەوتینەڕێ بەفر هەتا مەقانیش لەگەڵماندا هات، سەرما بووبوو بەسەرەتان و لێمان دوور نەدەکەوتەوەو ژمارەی ئۆتۆمۆبێلەکان (٣) دانە بوون، باش لەیادم نەماوە جێبی سەربازی بوون یان لاندکرۆزەری دەبڵکابینەی پاش خاڵی بەچادر داپۆشراو، من زۆر مەترسی ئەوەم هەبوو

لەئەمنــی کەرکوک لامان بدەن، چونکە زیاتر شــوێنی چالاکی سیاســی من کەرکوک بوو پاش نەقڵبوونی فەرەیدون و برایم جەلال و ئەبوشــەهاب من سەرپەرشــتی ڕێکخســتنی کۆمەڵەم دەکردو هەر لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەشەوە من ئەندامی کۆمیتەی کەرکوکی کۆمەڵە بووم و ماوەی خەباتی ناو هەردوو پارتی دیموکراتی کوردستان و پارتی شۆڕشگێڕی کوردستانیش پێش تێکەڵاوبوونەوەو پاش تێکەڵاوبوونەوەی پارتی من لەکەرکوکدا کاری سیاســیم کردبوو، ئەمن و خەڵکی ســەربە دوژمن دەیانناسیم، سەرەڕای ئــەوەی هەندێــک بــرادەر هەبوون بۆ حەڵقەی ڕۆشــنبیری کۆمەڵە قســەم لەگەڵ کردبوون پاشان لایانداو بوون بە خەڵکی خراپ و هاوکاری دائیرەی ئەمنی کەرکوکیان بەئاشــکرا دەکرد و لەگەڵ مندا زۆر ناکۆک بوون، بۆیە کاتێــک ئۆتۆمۆبێلەکان لەفلکەی (نازم تەبەقچەلی) لایاندا بۆ ئەمنی ناوچەی کوردســتان دڵم داخورپاو زۆر ترســام و وتم کورد ڕاستی وتووە ئەوەی بترســێ ناخەڵەســێ ئەوەی من لێی دەترســام هاتەدی، بۆیە بە هاوڕێکانم وت: "من ئازارێکی زۆرم هەیەو سەرمامبووە داوای بوردن دەکەم کەمێک دەمەوڕوو دەکەوم"، هاوڕێکانم هەســتیان بەوەکردبوو من ترســی ئەوەم هەیە لێرە بمناســنەوە، بۆیە ئەوانیش بێدەنگ ســەریان بەســەرمدا گرت و لەدەرگا گەورەکەی ئەمنی ناوچەی کوردســتان لەکەرکوک ئۆتۆمۆبێلەکان ڕاگیــران و یــەک دوانێک لەوانە لەگەڵمان بــوون چوونە ژوورەوە و ئێمەش لەئۆتۆمۆبیلەکاندا بەدەست بەستراوی ماینەوەو پاسەوانەکانیش بە دیارمانەوە بــوون، مــاوەی (١٥) خولەکێک لەڕێ ڕاپانگرتین ژمــارەی لێدانی دڵم زۆر بەرزبیــۆوە، مێشــکم زۆر خەریک بــوو بەوەی چی بکەم بــۆ دەربازبوون لەکاتی هێنانە ڕووی ئەوانەی شتم لەسەر دەزانن.

هاتنــەوەو ئۆتۆمۆبێلەکەیان جوڵاندو ئێمەیــان دانەگرت، ئۆتۆمۆبێلەکان یەکەیەکە هاتنەوە ســەر شــەقامی کەرکوک- بەغداو بەرەو بەغدا کەوتینە ڕێ، ئای چەندەم پێخۆشبوو زۆر لەوە خۆشتر بوو لام کە ئازاد بکرامایەو بــڕواش بکەن مــرۆڤ بەســەربەرزیەوە بمرێت زۆر لەوە خۆشــترە ئازاد بێــت، بۆیە زۆرجار هەبووە مردنم بەخــەڵات زانیوە بەمەرجێک دووچاری ڕووزەردی و ڕووڕەشی بەردەمی جەماوەری گەلەکەم نەبم.

لەکەرکوک دەرچووین، برادەران قسەیان لەگەڵ جێگری مودیری ئەمنی ســلێمانی کرد، کە بەرپرســیاری گەیاندنمــان بوو بۆ ئەمنی عــام لەبەغدا، لەســەر وەزعــی کــوردو ڕاســتوڕەوای کێشــەی کــوردو دیموکراتییەتی گەلەکەمان، لەگازینۆکەی دووزخورماتوو کە لەوێ لایاندابن بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ و لەســەر مێزی نانخواردنیش نوکتەو قسەی خۆشی کاک جەعفەر

سەرخۆشـی کردبووین، چونکە شـەهید جەعفەر دەوڵەمەندترین نوکتەزان بوو شـتی وەهای بۆ دەگێڕاینەوە کە قەت بەخەیاڵیشـماندا نەدەهات، نەک هەر معاون کامل بگرە ئێمەش پێوەی خافڵابووین، پاش نانخواردن جێگری ئەمـن ویسـتی پارەی خواردنەکە بدات، چونکە مەسـرەفی ڕێگای لەسـەر بوو، بەڵام برادەران بۆ باشتر جێکردنەوەمان لەدڵیدا ڕێگایان نەداو پارەکە خۆمان سـەرفمان کردو جارێکیتر بەرەو بەغدا کەوتینەوە ڕێ، هەر لەپردە درێژەکـەی دووزخورماتـوو ڕەتبووین ئۆتۆمۆبێلەکان ڕاوەسـتان معاون کامـل پێیراگەیاندیـن کە پێش ئەوەی بتانبەمە ناوشـاری بەغدا دەسـتتان دەکەمـەوەو کەلەبچـەکان لا دەبـەم بۆئەوەی لەئەمنی عـام زەختتان زۆر لێنەکـەن ئێمە پێمانوابـوو درۆی پۆلیسـە، بەڵام دەستخۆشـەمان لێکردو هانمان دا کەشتێکی مرۆڤانەی چاکەو پێیدەزانین.

دنیـا تاریکداهاتبوو کە گەیاندیانینە نـاو بەغدا کردیانین بەئەمنی عامدا، لەپێشـەوە بردیانین بۆ (اسـتعلامات)ەکە، کامل دابەزی سـێ چوار ئەمنی بازۆڵە قەوی ڕەشی باڵابەرزی ئیسکگران چاویان لێزەق دەکردینەوە، کامل هەستی پێکردن وتی: "ئەمانە پیاوی نیشتمانپەروەرو چاکن قسەی ناشیرین مەکەن لەڕوویان و خۆی کردە ژووری ئیسـتعلاماتەکەو پاش تۆزێک کاک جەعفەریـان بانگکرد دوابەدوای ئەو ئێمـەش بانگکراینە ژوورێکی بچکۆلە مێزێکی لەبەردەمدا داندرابوو سەر مێزەکەی لەژێر شوشە ئەستوورەکەیدا وێنـەی جوان جوانـی مـاڵ و منداڵی خۆی تێـدا دانرابـوو، تەلەفزیۆنێکی ڕەنگی کاری دەکرد، ئێمە دەمێک بوو شوێنی ئاوا خۆشمان نەدیبوو تەواو تەواو سـەرنجی ڕاکێشابووین کابرای سـەرمێزەکە لەگەڵ کاک جەعفەردا کەوتبوونە قسەکردنی توندو کاک جەعفەر دیاربوو نوکتەی بەتەنگەدا دابوو بۆیە کابرای بەرپرسـی ناو نووسـین بەتوڕەییەوە ناوەکانی لێوەرگرتین و وتی: بڕۆن بیانبەن بۆ شوێنێک هەموو لەشیان جارێکیتر بشکێنن، هەندێک پارەمان لامابوو لێیانوەرگرتین و لەوێش ناونووسیان کردین و بەکۆشکەکەدا سـەریان خسـتین، لەیەکەم دەرگاوە یەکەم پێپلیکانەوە تا گەیشتینە تەختی حەوتەمیـن قاتی سـەرەوە، حەوت دەرگایان لەسـەر کردینـەوەو لەدواوە لەسەریان دادەخستین.

هەر حەوتمان لەڕیز وەسـتابووین پاڵتۆدرێـژەکان و پێڵاوە نیو جزمە ئێرانییەکان و ڕیشـی درێژمان سـێتی دروسـتکردبوو سەرەنجی ئەوانەی ڕادەکێشـا کە بۆ یەکەمجار دەیانبینین، پۆلیسـە کلیل بەدەسـتەکە خەریکی کردنەوەی دەرگا شیشـبەندەکە بوو وەها دروسـتکرابوو لەم سـەرییەوە دەرگایـەک شیشـبەندو ڕێڕەوەێکی یەک مەترو نیو پـان لەنێوانیاندا بەلای

ڕاستدا چوار ژووری یەک نەفەری (انفرادی) تێدابوو لەئەودیو دەرگای دووەمی ڕووبەڕوومان ساڵۆنێکی گەورەی تێدابوو کە (١٥) مەتر پان و (٢٥) مەتر درێژ دەبوو، هێندەی گڵۆپی شیری تێدابوو وەکو دەرەوە وەهابوو، نێوانی شەو و ڕۆژ تەنها بەکاتژمێر دەزاندرا، لەناو ئەم ساڵۆنەدا (١٠٠) زیندانی زیاتری تێدابوو کە جۆرەها ڕێکخراو و پارتی سیاسی و کەسانی نیشتمانپەروەرو خەڵکی جۆراوجۆریشی تێدا کۆکرابۆوە، کاتێک هەستیانکرد زرەی کلیل دێت یەک یەک خۆیان لەدەرگاکە نزیککردەوە، یەک دووانێک هاتن و بەپەلە گەڕانەوە دواوەو هەندێکی لەگەڵ خۆیان هێنابوو بۆ سەیرکردن لەناو ئەوانەدا ئەنوەر زۆراب، ئاسۆی شێخ نوریمان ناسی و دیاربوو ئەوانیش ئێمەیان ناسی بوو، بۆیە هەر بەدەوری یەکتریدا دەهاتن، پۆلیسەکە دەرگاکەی کردەوە جارێکیتر وەستاین تا دەرگای دووەمیان لەسەر کردینەوە باشتر بۆمان ڕۆشنبۆوە کە زۆربەی هاوڕێکانمان لەوێن، کاتێک پۆلیسەکان دەرگاکەیان کردەوەو ئێمەیان کردە ساڵۆنەکەوە زانیمان هەڵەیەکی گەورەیان کردووە، بەڵام بوارێکی مێژووییمان دەستکەوت خێرا برادەران دابەشیانکردین بەسەر جێگاکانی خۆیانداو بەپەلە ئێمە ڕاوبۆچوونی خۆمان بۆ باسکردن لەبابەت ڕووبەڕووبوونەوەی لێکۆڵینەوەی ئەمن و هەروەها ئەوانیش قسەیان بۆکردین لەبابەتە جۆراوجۆرەکانی لێدان و لێکۆڵینەوەو پێویستییەکانی ڕۆژانی بردن بۆ لێدان و بۆشیان باسکردین کە چییانوتووە لەسەر ئێمەو لەسەر خۆشیان، ئێمەش ئاگادارمانکردن ئەوانیش لەکاتی بانگکردن بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئێمە بڵێن ئێمە لەترسان قسەمانکردووە، ئەگینا ئێمە ڕێکخراومان نییەو تەنیا کتێب خوێندنەوە لەنێوانماندا هەبووە، بەکورتی تەگبیرو ڕای چاکمان کرد، چونکە دڵنیابووین تا لێکۆڵینەوەمان تەواو نەبێت ناهێڵین لێرە بین، بریان بەپێویستییان زانی یەکی یەک دەستەسڕمان بدەنێ بۆ ئەوەی کاتێک بردیانین بۆ لێدان چاومانی پێ ببەستنەوە، چونکە ئەگەر هەر کەس پەڕۆی چاوبەستنەوەی خۆی پێنەبێت بۆ ڕووخاندنی دەروونی زیندانییەکە بەپڕۆیەک کە لەپیسایی وەردەدرا چاوی پێدەبەسترایەوە.

بریان ئامۆژگارییان کردین لەکاتێکدا فەلاقەیانکردن کە هێنایاننەوە شوێنی خۆتان هەندێک لەسەری بجوڵێن بۆ دەرچوونی هەوای پێ و پلتان و هەرکات کە پۆلیس هاتە لاتان داوای حەبی ئازار بکەن، چونکە ئازارەکانی پاش لێدان مرۆڤ هەراسان دەکات ئەگەر حەب و دەواتان لانەبێت دووچاری دەردەسەری دەبن.

وەکو وتمان ئەو ئێوارەیەی کە گەیشــتینە (ئیســتعلامات) کامل دەوری بینی و ڕێکەوت وەهابوو ئێوارەی پێنجشەممە بوو، بۆیە تەنیا ڕۆژی هەینی دەستیان لێنەداین و هەر لەناو خەڵکەکەدا ماینەوەو هەرچی بەبیرماندا هات لەبابەت دوارۆژی لێکۆڵینەوە قسەمانکرد.

ئێـوارەی شـــەممە ئیبراهیـم عەلاوی لێپرســراوی بەشــی دووی ئەمن (الشعبة الثانیة) کە بەشێک بوو داندرابوو بۆ لێکۆڵینەوە لەپارت و ڕێکخراو کەســانی چەپ و مارکســییەکانی کوردســتان، هاتــە ژوورەوەو ناوەکانی ئێمەی بەدەســتەوەبوو نەڕاندی وتی: "چ سەگبابێک ئێوەی هێناوەتە ئێرە". بڕیاریـدا خێرا لەوێ دەریانکردیـن و بردیانین بۆ ژووره تەنهاییەکان یەک یەک و دوو دوو.

وەها ڕێککەوتبوو خاڵەشەهاب و جەعفەر و فەرەیدون خرانە ژوورێک، ئەرســەلان بایــز دوورخرایەوە بــۆ ژوورێک دەنگی ئێمەی نەدەگەیشــتێ، عومەری ســەید عەلی و ئاوات عەبدولغەفور و من خراینە ژووری یەکەمی نزیکــی ســاڵۆنەکەوە، دەنگــی ئێمــەو خاڵە و ئەوان بەئاســانی دەگەیشــتە هاوڕێیانی ساڵۆنەکە.

شــەوی شــەممە بوو پیاوە بالابــەرزە قەڵەوە دێزەکە لەگــەڵ مەفرەزە ئەمنەکەی لەگەڵیدا بوون هەر حەوتمانیان برد بۆ شوێنی لێدان و لێکۆڵینەوە، ســەرەتا لەهەیوانێکی بچکۆلەدا ڕایانگرتین دەســتیانکرد بەچاو بەستنەوە، هەموومــان دەستەســڕمان دەرهێنــاو ئەوانیش توند چاویان بەســتینەوەو هەریەکــە دەســتێکیان کەلەپچەکردیــن و ســەرەکەی تــری کەلەپچەکەیان لەبــەرزی لاوانــەی پێپلیکانەکــەوە بەســتبۆوەو خێــرا خێــراش ئەمنەکان لەنزیکمانەوە ئاخ و ئۆفیان دەکرد، دەیانویســت بمانترســێنن بۆ کاتی لێدان ئامادەمان بکەن و بروخێنن ناوبەناویش ســەری کێبڵێکیان دەهێناو بە درۆ دەیانوت: "وریابن ئەوە کارەبایە دەتانگرێت."

لەو شــوێنە تەنیا گوێت لەلێدان و هاوار هــاوارو پاڕانەوەیە، لەهەندێک شوێنیش بۆ خۆیان شریتی دەنگی لێدان و هاوارو دانپێدانانی تەسجیلکراو دەهێنن، لێیدەدەن بۆ دابەزاندنی ورەی زیندانی.

کاتژمێــر لەســەروو (١٠)وە بــوو جەعفــەر لەلایەکدا بانگکــراو منیش لەلایەکیتــرەوە لەقاتــی ســەرەوەی کۆشــکەکە جارێکیتــر لەڕێڕەوەکــەدا بەســتیانمەوە بەپێپلەکانەکانەوە، هەســتم ڕاگرت کوردێک لەژوورەوە بوو زمانــی عەرەبی ڕەوان نەبوو ناوبەناو بەکــوردی هاواری دەکردو دەیوت:

"بەخوا من کارمەندم و خەریکی بەخێوکردنی منداڵی خۆمم و هیچ پەیوەندیم بەکەســەوە نییە، بەدەنگێکی شــەکەتەوە هاواری بەرزتر دەبۆوە، دیاربوو ئەمنەکان دەمێک بوو لێیان دەداو ماندوو بووبوون هەڕەشــەیان لێدەکردو دەیانوت ئەگەر داننەیێت بەوەدا کە دەیزانیت ســبەینێ هاوڕێکەت دەهێنینە ڕووت و لەڕووتــا هەرچی کردوتە باســی دەکات، پاشــان هیچ بەزەییمان پێتدا نایەتەوەو خۆت بەرپرســیاری لەبەردەم لێکۆڵینەوەدا، لەپرسیارەکاندا بۆم دەرکەوت ئەو کەسە ناوی (مراد) بوو، لەپاشاندا ناسیم کە یەکێک بوو لەهاوڕێیانی کۆمەڵە.

لەکاتێکدا لەژوورەوە لەمرادیان دەدا، ئەمنێک لەتەنیشتمەوە وەستا بوو دەیویســت بمڕوخێنێت، دەیوت: "دەزانی ئەگەر ڕاســت قســە بکەیت و چی دەزانی پێیان بڵێیت هەر ئەم شەو ئازادت دەکەن و هیچ ئازارت نادەن؟ دەزانی لێرە کێبڵ بەکاردێت، پانکە، فەلاقە، پلایس، جۆدۆ و کاراتێ، جگەرە و هەندێ شــتیتریش کە تالێتنەدەن نازانی چییە"، منیش هەر دەموت: "بەڵێ"، سەرەم هات، بانگیان کردمە ژوورەوە دەنگی هەناسەی (٣) کەس دەهات لەشوێنێکدا ڕایانگرتــم نەمدەزانی لەکوێی ژوورەکەدام؟ چی لەدەووروبەرمە؟ لەپڕێکدا یەکێکی باڵابەرز لەتەنیشــتمەوە وەســتابوو و دەنگی لەپشــتی ســەرمەوە دەهــات بــەوەدا بۆم دەرکەوت باڵای بەرزە، لەســەرخۆ وتــی ناوت چییە؟ ئیشــت چییە؟ لەکام پارتیدا کاردەکەیت؟ بەرپرســیاری چەند کەسیت؟ کێ بەرپرســیارتە؟ پەیوەندیتان بەکێوە هەیەو لەگەڵ کام دەوڵەت دۆســتایەتی بەتینتــان هەیــە؟ کۆمەڵێــک پرســیاری هەڵڕشــت وەکو ســەڵییەی تفەنگ وەهابوو، داوایکرد "کوڕی چاک بە خۆشت ئازار مەدە و ئێمەش، چی لات هەیــە بێئەوەی خۆت دووچاری ئازاردان بکەیت پێمانبڵێ، ئەگینا بەزەییمان پێتدا نایەتەوە" و دەشــیوت: "خۆمان هەموو شــتێک دەزانین، خۆت پێمان بڵێ بۆ خۆت چاکترە"، زۆر نەرم و لەســەرخۆ قســەی دەکرد، کاتێک ئەو لێبــووەوە منیش زۆر بەکەساســی وتــم: "من پیاوێکــی نەخوێندەوارم لەم پرســیارانەی ئێوە ســەر دەرناکەم، حەز دەکەم بــڕوام پێبکەیت من لەهیچ ڕێکخراوێکدا کار ناکەم و پەیوەندیشــم بەکەســەوە نییە، تەنیا پێش ئەوەی بــڕۆم بۆ ئێران بەڕێککــەوت جارێک دووان لەگەڵ فەرەیــدون عەبدولقادر کتێبــم خوێندۆتــەوە ئەویش بەهۆی ئــەوەی لە بەلەدێ بــوو منیش لەوێ کارمدەکرد وەکو کرێکارێک هەر ئەوەندەم خۆش بوو وتم من هیچ شــتێک نیــم هەتــا توانیتی دای بەپشــتی ملمدا کاتێکمزانی ســەرم کەوتە بن مێزی نووســینەکەی موفەوەز عیماد هەڵیانساندمەوەو هەندێک جوێنی ناشیرینی ئەوتۆیان پێدام کە تەنیا لەوان دەوەشــێتەوە، هەرەوەزێکی باشیان لەلێدانم کرد ئەوســا پشــوویەکیتریاندا و لەســەرخۆ وتی: "عەلی دەی بڵێ خۆشت

ماندوو مەكەو ئێمەش، تۆ بۆ كێ خۆت هیلاک دەكەیت ئێمە هەموو شـتێک دەزانین، ئەگەر خۆت پیاو نەبیت ئێمە دەزانین چۆنت دەهێنینە قسـەكردن، چۆن چۆن عاقڵت دەكەین"، سەرلەنوێ وتم: "خوا دەیزانێت هیچ شتێک شک نابەم و هەرچی دەیڵێم هەر ئەوەیە"، جارێكیتر ڕقی هەستاو وتی: "فەلاقەی بكـەن خێرا دەسـتەكانیان لەپشـتەوە بەسـتم و هەر دوو قاچیـان كردمە فەلاقەكـەوەو توند توند بەسـتمیانەوەو دوو نەفـەر یەكێک لەملاو ئەوەیتر لەولاوە دەستیانكرد بە بەكرەیی لێدانم سەرەتا تەجروبەم نەبوو وامدەزانی هـاوار نەكردن و نوقـە لەخۆ بڕین چاكە، زۆریان لێـدام بەجووت گۆرانی عەرەبییان لەسـەرم دەووت زۆر ماندوو بووبوون، منیش زۆر زۆر ئازارم هەبوو هەندێک سڕبووبووم، بەڵام تۆپ تۆپێنەكەیان هێندە بێبەزەییانە بوو مرۆڤ ئازاری زۆری پێدەگەیشـت، بەمێشـكمدا هات هەڵوێسـت بگۆڕم و دەسـت بكەم بەهاتوهـاوار بۆ ئەوەی بڵێن ڕووخاوەو دیـارە هیچی پێنییە بۆیە هیچ نادركێنێت.

هاوارمكرد بۆ خاتری خوا، بۆ خاتزی پێغەمبەر، بۆ خاتری مرۆڤ بەسە مردم زۆر بێشـەرمانە وتیان خواو پێغەمبەر ڕۆیشـتوون بۆ ئیجازە، بەڵام ئـاگام لێبوو كە هاوارم لێهەسـتا كەمێک دەسـتیان توندتركـرد وەكو بڵێی ڕووخـاوەو بـا خێراتر ئازاری بدەین، ژەمێكی چـاک برنج كوت كوتامیان، پاشـان پشوویاندا فیشـكەی لوتیان بەقەد فیشـكەی لوتی هێستری ناعور دەهـات زۆر ماندوو بووبوون، جارجار لەنێوانی بەرزایی لوتمەوە سـەرم هەڵدەبڕی دەمبینی دوو ئەمنی دێزی ناشـرین كە ئەگەر ئەو شـوێنە نەبێت هیچی ئەوە نییە سـەگیان پێ بەخێو بكەیت، دوو بێ شەخسـیەت و بودەڵە بـوون مرۆڤ شـەرمی دەكرد هەر ببەزێت بۆ خەڵكـی وەها بودەڵە چۆک دابدات، بۆیە زۆرجار ڕقم هەڵدەسـتاو دەموت بشمكوژن نابێت ئۆف بكەم، بـەڵام كـە لێكمدەدایـەوە هونەری سـەركەوتن لەوەدایە هیـچ نەدركێنم و ئەوانیش بڕوام پێبهێنن كە من هیچ شتێک نیم بۆیە هیچ نادركێنم.

پشووەكەیان تەواو بوو دەستیان كردەوە بەپرسیار "پارەت داوە بەكێ؟ چەندەت داوەتێ؟ ماڵی هاوڕێكانت لەكوێن؟"

وتم بڕوام پێبكەن من ئەو شـتانەی ئێوە دەیڵێن هیچ یەكیان نیم و لەو شتانە نازانم و پەیوەندیشم بەكەسەوە نییە.

جارێكیتـر "چەنـد برات هەیـە؟"، لەكوێن؟"، "چی دەكـەن؟" خوێندنت تـا كوێیـە؟"، "یەک بـرام هەیـە تەمەنی (٧٠) سـاڵە عەرەبانەی دەسـتی دەگێڕێت بۆ بژێوی منداڵەكانی، خۆشـم خوێندەواریم نییەو نەمخوێندووە

لەبەر هەژاری و بێدەرامەتی بنەماڵەکەمان من هەر خەریکی ئیشوکار بووم.

مفەوەز عیماد هەڵسایە سەرپێ جاریکیتر دای بەدەموچاومدا پشتاوپشت دامی بەزەویدا، ئەمنەکانی بەردەستی ڕاستیان کردمەوە بوون بەدوان تێر تێر ئەملاو ئەولای دەموچاو و سەرومێشکیان کوتام، جاریکیتر دایان نامەوە و وتیان هاوڕێکانت هەموو شتێکیان وتووە و ئەوە ئێستا قسەیان لەگەڵ کردووم، ئەگەر هەرچی هەیە پێمان نەڵێیت دەیانهێنینە ڕووت. وتم: "هەرکەسێک دێننە بەردەمم با بێت من کەس هاوڕێم نییەو لەگەڵ کەس کاری ڕێکخستنم نییە جا هەر کەسێک قسەی کردبێت بابێتە ڕووم، زانیان زۆر سوورم لەسەر قسەکانم هەڵسانەوە دەستەکانیان لەپشتەوە توند توند بەستم و هەڵیان بڕیم کردیانم بەپانکەدا فڕەیەکیان پێدام، هەرچی دەماری لەشم هەبوو هاتە هاوار وەخت بوو دەمارەکانی لەشم هەمووی بپسێت بەسۆندەش لەقاچیان دەدام، هەر بەئاسمانەوە بووم هەندێک پرسیاریتریان دووبارەکردەوە وەلامەکەی منیش هەمان وەلام بوو"، "بەخوا من پەیوەندیم بە کەسەوە نییە."

دایانگرتم خۆم پێنەدەگیرا بەپێوە کەوتمە زەوی لەسەر لاشان لێیراکشام، چونکە خۆم پێنەدەگیرا دانیشتم لێم تووڕەبوون بەنوکە شەق هەڵیانساندم، هەندێک جوێنیتری ناشرینیان پێدام و کەوتنە هەڕەشە وتیان ئێستا دەتبەیەنەوە ئەم شەو پشوو بدەو باش بیربکەرەوە بۆ خوا پێتدەڵێین خۆت ماندوو مەکە و ئێمەش، شتەکەمان پێ بڵێ ئەگینا خۆت زەرەر دەکەیت.

دوو ئەمنەکەی بەردەستی مفەوەز عیماد بەنوکەشەق وتیان: "هەڵسە خۆت لەبەربکەو پێڵاوەکانت لەپێ بکەرەوە سبەی زوو دەمانەوێت کە هاتینەوە ڕاست و دروست قسە بکەیت."

هەوڵێکی زۆرمدا پێڵاوەکانم بەپێمەوە نەدەچوون، چونکە زۆر ئاوسابوون هەمووشی زامدار بووبوو خوێنی ڕەشی لێدەهات، کاتێک دەمویست زەختی لێبکەم خوێن فیچقەی دەکرد بۆ سەروچاوم، کابرا پشتی ملی گرتم و لەژووری لێکۆڵینەوە کردمیە دەرەوەو چاوی کردمەوە یەک دوو نوکە شەقی لەپشتم داو وتی: "خێراکە" هەرچی کردم پێڵاوەکەم نەچووە پێمەوە گرتم بەدەستەمەوە و پاڵتۆکەم قۆڵ تێهەڵکێشاو ویستم پێش ئەمنەکە بکەوم بۆ خوارەوە جاریکیتر لێم تووڕە بوو خێرا پێی خستەسەر هەردوو پێم و سەرێک دوان بەڕێڕەوەکەدا جولاندمی و پێڵاوەکانمی پێ لەپێکردم، کورد دەڵێ "کە زۆرهات قەواڵە بەتاڵە"، بەڕاستی وایە منیش لەترسان چاک چاک خۆم پۆشتە کردەوەو پێشی کەوتم بۆ خوارەوە، کە هاتم

تەنیا کاک جەعفەر نەهاتبۆوە، هەموومانیان پێشـدا لەحەوشەکە خستیانینە ئۆتۆمۆبێلێکی (فۆکس ڤۆلگن) کیسـەڵی بچووک، لەسـەر یەک وەکو فەردە، دایـان نایـن و دوو ئەمن لەپێشـەوە یەکیان ئۆتۆمۆبێلەکـەی لێدەخوڕی و ئەوەیتریش پاسـەوانی دەکردین، ئێمە لەژێرەوە دەسـت و ڕانی یەکتریمان دەگووشـی نیشـانەی خۆگری و نەبەزین. ئای لەو بڕوابەیەکتری بوون و سۆزو پاڵەوانێتییەی ئەوسا.

لەگەڵ هاوڕێکانیترمان ڕێککەوتبووین لەسەر ئەوەی لەکاتی گەڕانەوەمان لەلێکۆڵینەوە نیشـانەی نەدرکاندن ئەوەبێـت کە هێنایانینەوە پێبکەنین، بۆیە کاتێک هێنایانینەوە بۆ ژووره تەنهاییەکان خۆم پێنەدەگیرا، بەڵام بۆ دڵنەوایی هاوڕێکان پێدەکەنیم کە دەموچاوم لەبنی مەنجەڵ ڕەشتربوو، چونکە ساغی تێدا نەمابوو هەندەیان بۆکس لێدابوو خۆم پێنەدەگیرا پشتم دا بەدیوارەکەوە هەتا پۆلیسەکە دەرگای ژوورەکەی کردەوە.

ڕۆژگاری زینـدان فێـری داهێنانـی نوێـی کردیـن بـۆ ئەوەی باشـتر ئـاگاداری هەڵسـوکەوت و ڕووداوەکانـی یەکتـری بیـن لەسـاڵۆنەکەدا، هاوڕێکانـی ئێمە ڕۆژی دووانیان هەڵدەسـتان بەسـڕینەوەی سـاڵۆنەکەو ڕێڕەوی نێوانـی دەرگاکەی ئێمەو دەرەوەی هـەردوو دەرگا داخراوەکەی نێوانمان و دەگەیشـتنە نزیکی ژوورەکەی ئەرسـەلان کـە ئێمە هەموومان دڵمـان لای ئـەو بوو، چونکە لەشـولارێکی لاوازی هەبوو لەهەمووشـمان منداڵتـر بوو لێی دەترسـاین لەبەردەمی ئازاردانـدا دەرنەچێت، ئەو برایانە کە زەوییەکەی ژوورەکانیان دەسـڕییەوە بەدەنگی بەرز قسەیان بۆ خۆیان دەووت و نیازیـان ئەوەبـوو ئێمە بزانیـن، ئێمەش کاتێک ئـەوان دەهاتنە نزیک، بە سرووود یان گۆرانی ڕووداو و ئامۆژگاری لای خۆمان دەگەیاند بـۆ یەکتر، شـەو و ڕۆژێـک کاک جەعفـەر نەهێندرایەوە، کاتێـک هاتەوە سـیمای بەتەواوەتـی گۆڕابـوو، لـە کونـە بچووکەکـەی دەرگای ژوورە تەنیاییەکەمانـەوە کـە پرتەقاڵێکـی گـەورەی پێـوە نەدەچـوو دەرگای هاتنـە ڕێڕەوەکەمـان دەبینـدرا کاتێـک زرەزرِی کلیلەکان دەهـات تێکڕای زیندانییەکان دڵیان دادەخورپا دەکەوتنە ڕوانینی ئەو ڕووداوە، زرەزڕ هات سـەرنجمان دا کاک جەعفەر هێندرایەوە، خۆی بەپێوە پێنەدەگیرا شێرئاسا خۆی دایەپاڵ دیوارەکـەو پێکەنینەکەی بۆ هاوڕێکان کرد، چووە ژوورەوە خۆی هەندێک بێدەنگ بوو فەرەیدون بەدەنگی بەرز وتی هیچ نییە هیچ.

کات خۆیدابوو لەیەکی شەوی دووەم جەعفەر سرووودەکانی دەستپێکرد، ئێمەو هاوڕێکانی ساڵۆنەکەش کە گوێمان لێبوو بەڕاستی دەنگێکی خۆش و توانایەکی بێوێنە و شارەزاییەکی تەواوی لەمۆسیقا هەبوو، چی ڕوویدابوو

چـۆن گاڵتەی بەئەمنـەکان کردبوو، چۆن نوکتەی لەسـەر گێڕابوونەوە کە نیشانەی گێلی ئەمنەکان بێت، زۆریان لێدابوو باسمانکرد ئەو شەو و ڕۆژە نەیانهێشـتووە ساتێک پشـوو بدات یان لێیانداوە یان پرسیاریان لێکردووە سـروودەکانی کاک جەعفەر دڵی خۆشـکردین، خەمی ئەرسـەلانمان بوو، دوو بـرا بە بیانووی (مسـواک) بازاڕی نووسـین چوونـە لای و وتبووی: "زۆریـان ئازارداوم لەشـم هەموو تێکشـکاوە، بەڵام بـرادەران دڵنیا بکەن پارچە پارچەشم بکەن لەبەرنامەکەی دامانڕشتووە لانادەم، جارێکیتر پێیان بڵێن نەترسـن ورە بەقەڵەوەی و گەورەیی و بچووکی نییە من بڕوام بەوە هەیە کاری بۆ دەکەم، مومکین نییە دوژمن بتوانێت چۆکم پێدا بدات."

هەواڵەکانی ڕۆژانی یەکەم و دووەم وەها دڵخۆشـی کردبووین دەوری چاکی بینی لەوەی ئەو برادەرانەی بە نەشـارەزاییش قسەیان کردبوو ورە بدەنـەوە بەرخۆیـان و بەڵێن بـدەن ئەگەر بانگ بکرێن بـۆ لێکۆڵینەوە ڕاو قسەکانی کۆنیان بگۆڕن و لەسەر نەخشەی قسەکانی ئێمە ئیفادە بدەنەوە.

## هەڵوێستی هەندێک لەو هاوڕێیانەی پێش ئێمە لەئەمنی عام بوون

کاتێـک ئێمە کەوتینــە زیندانی ئەمنی عــام هەندێک لــەو هاوڕێیانەمان ناســی کە پێش ئێمە لەوێدا زیندان بوون، بەڕاســتی ئــەوان هاوکارییەکی جوامێرانەیــان کردیــن و خێــرا هەرچی شــێوازی دڕندانەی ئەشــکەنجەی ئەمنــە کــە لەســەر خۆیانــدا جێبەجێکرابوو بــەوردی بۆیان باســکردین، هەرچەندە شــەو و ڕۆژێــک پێکەوە بووین، بەڵام بــۆ ئەوکاتە کەمە ئەوان توانیان فێری ئەزموونێکی زۆرمان بکەن کە دواتر ئێمە سوودمان لێبینی.

هاوڕێیانی جوانەمەرگ دارۆی برای خاڵە شــەهاب، حســێن ڕەزا ڕەزا، شەهید ئەنوەر حەسەن، سەعدون فەیلی، پاڵەوانی ڕۆژە سەختەکان جەبار فەرمــان کــە ترس لەژیانیدا جێگــەی نەدەبۆوە هاوکات کرێــکاری مەیدانی خەبات و تێکۆشــان ئەنوەر زۆراب، ئاســۆی شــێخ نوری، عوسمان نانەوا، عەبدوڵــڵا عەلی ڕەشــید، کەمــال عەلــی، لاوی خۆگر خاوەنــی هۆنراوەی بێباک لەبەردەم ســێدارەی دوژمن فاروق ئەحمەد، کــە هەر لەزینداندا ئەو هۆنراوەیەی نووســیبوو، سەلام محەمەد برزۆ، عەلی حەمە مراد، محەمەدی میرزا ســەعید و حاکم ئیبراهیم حەســەن و چەند کەســێکیتر کە بەداخەوە ناوەکانیانم لەیادنەماوە، جگە لەوانەش سێ چوار جوامێرمان لەگەڵدابوو ئازاد بوون وەکو، دکتۆر جەمیل عەلی، حەمە سەعید، شێخ مەحمود، سەلاح مەجید کەرکوکی، زۆر جوامێرو بەوەفابوون لەسەر کۆمەڵە ئازاریان بینی و هیچیان نەوت.

لەنــاو هەمــوو ئــەو قارەمانانــەدا دەوری جەبــار فەرمــان زۆر دیارو ئاشکرابوو کە بەهۆی ئازایەتی خۆی تەنانەت ئیدارەی زیندانی ئەبوغرێبیش سڵیان لێدەکردەوە، بەڕاستی جێی وتنە جەبار فەرمان پاڵەوانی چاونەترس بــوو، پێویســتە ئەو ڕاســتییەش بگوترێت کە پێموایە مێــژوو مرۆڤی ئازاو قارەمانــی وەکو حســێنی ڕەزا ڕەزای بەخۆوە نەدیــوە، چونکە ئەو مرۆڤە مەزنە لەکاتی ئەشــکەنجەدان کە نینۆکەکانیــان هەڵدەکەند، بەڵام بۆ ئەوەی جەلــلادەکان بڕوخێنێــت ئەو پاڵەوانە هــاواری نەدەکرد خۆ ئــەو کاتانەی هاواریشــی دەکرد بــەدەم نەڕاندنەوە بەجەللادەکانی دەگوت ئێوە فاشــین، ئێوە کوردکوژن، بژی کوردستان.

## ئەشکەنجەدان بەردەوامبوو

ڕۆژانە دەیان بردین هەموو ڕۆژێک بەجۆرەها شێوەی لێدان و گۆڕینی پرسیار چەند بارە پرسیارکردنەوە، شتێکی ئەوتۆیان بۆ دەرنەکەوت ناچار پیاوێکی دینی ڕیش درێژ کە وایان نیشـان دەدا لەپارتی دەعوادا کاردەکات هێنایـان و خسـتیانە ژوورەکـەی کاک جەعفـەر و خاڵە و ئەوان، پاشـان لەگـەڵ کاک جەعفـەر خسـتیانە ژوورێکی تەنیـاو زۆر ورە ڕوخێنەر بوو کاک جەعفەر هاواری لێهەڵسـا وتی: "ئەم دڕندەیەیان ناردووە بمڕوخێنێت، لێیدەدەم"، خاڵە جوابی دایەوە شتێکی وەها نەکات و دان بەخۆیدا بگرێت و ئەوەندە گرنگی پێنەدا ئەوەندە گرنگییان دەدا بەکاک جەعفەر، چونکە لەکاتی لێکۆڵینەوە چەند ئەوان ئازاری جەعفەریان دەدا جەعفەریش ئەوەندە گاڵتەی پێدەکـردن و ئیهانـەی دەکردن هەر بۆیە کاتێک لە لێدانیـش دەیانهێنایەوە لەژوورەکەشدا ئەو مڵۆزمەیان بۆ دانابوو.

خاڵە شـەهابیان چەند ڕۆژێک بزرکرد لەسەریەک لەسەریەک دەیانبرد هیچ شتێکیان پێنەدەکرا مەسەلەی پەیوەندیکردنی لەکاتی چوونە دەرەوەی خاڵە بۆ شـام و ئەلبانیا، گوایە مام جەلالـی بینیوە، هەوڵیان دەدا ئەو خاڵە خاریجیەی لەسەر بکەن بەماڵ کە پەیوەندیکردووە بە بێگانەوە و بە تاوانی پەیوەندی خاریجی ئازاری بدەن و سزای بدەن.

لەبواری ناوەوە خاڵە بەئاشـکرا پێیدەووتن من لێپرسراوم بەرامبەر بە هاندانی خەڵکی کوردستان.

ڕۆژانە دەبراین هەر کەسەمان لەشوێنێکدا ئازار دەدراین و هەندێکجاریش جیاجیا دەیان هێنایەنەوە.

ڕۆژێکیان هەر حەوتمانیان بەیەکەوە برد، فەردە ئاسا هەر حەوتمانیان لـە (فۆکس ڤۆڵگن)ەکـەدا دامەزراند، ئێمەش دەسـتمانگەیاندەوە یەکتری و یەکتریمان وشیارکردەوە کە وورەمان بەرزتربێت.

لەقاتی سـەرەوەی بەشی لێدانی (شـعبەی دوو) لەبەر هەتاوەکە دایان نایـن، زۆرمان پێخۆشـبوو هەندێـک هەتاومـان لێبـدات نەماندەزانی چی ڕوویـداوە بۆ وەهـا هێناویانینەتە ئەو بەرهەتاوە، ئەگەر چی زسـتان بوو سـەرما هەرتینـی خۆی هەبوو، بـەڵام هەتاوەکە زۆر خۆشـبوو ئەمنەکان لەمسـەرو ئەوسەرمانەوە بەدارێکەوە وەسـتابوون پێیانڕادەبواردین بەدار دەیاندا لەسەرمان، لەدەستمان، لەقاچمان و جارجاریش پرسیاری بێمەعنایان دەکرد.

چۆن بەکاک ئاواتیان وت: "تۆ وەرزش دەکەیت"، ئەویش وتی: "تو شەرەفت ئەم لاشـــەیەی من هی وەرزشـــە؟"، یەکەیەکە پرســـیاری سەیروسەمەرەیان دەکرد خۆشمان ناچاردەبووین پێبکەنین، هاتە لای من و وتی: "سیت داون" هیـــچ گوێـــم پێنەدا، چونکە من دانیشـــتبووم لەپڕێکدا دارێکی دا بەســـەرما و وتی: "ســـتاند ئاب" هەر خۆم لێگێل کرد پاشـــان وتی: "ناوت چییە؟"، وتم: "عەلـــی"، "کارت چیبـــوو؟"، وتم: "معاون ســـائق"، وتی: "باشـــە ئۆتۆمۆبێل چەند تایەی هەیە"، وتم: "چوار"، دارێکی توندیدا بەســـەرمدا خێرا ئاوســـا، وتـــی: "هەی نەزان ئـــەی تایە ســـپێرەکەی"، تا توانینان گەمەیـــان پێکردین پاشـــان لەو ســـەرەوە یەکە یەکە بانگیان کردین بۆ ژووری لێدان، پرسیارو جوابەکانمـــان بەئاســـانی گـــوێ لێدەبوو، هـــاوار هاوارمان گـــوێ لێدەبوو، دڵمان بۆ هاوڕێکانمان دەئێشا، لەوەش ناخۆشتر ئەوەبوو درەنگ سەرەمان دەهاتەسەر هەر کەســـەمان ئارەزووی دەکرد یەکەم کەس بێت لەلێدانەکە، هـــەر چۆنێک بـــوو هەموومانیان بەنـــۆرە کوتایی پێهێناو پاشـــان بردیانینە چەنـــد ژوورێکەوە بە بەرزی پەنجەرەکاندا پـــاش ئەوەی ڕوتیان کردینەوە تەنیـــا دەرپـــێ کورتەکانمان لەپێدا مابـــوو، بەئەو هەموو لێـــدان و خوێن و خوڕەوە هەڵیانواسین بە ئاستەم نوکێ پێمان لەزەوی گیردەبوو پەنجەرەی ژوورەکەیان کردەوە دەرگاکەشـــیان خستنەســـەر پشـــت، شەپۆلی هەوایی لەژوورەکەدا دروستبوو، تەنیا یەک ئەمن لەبەر دەرگای ژوورەکە لەدەرەوە چاودێـــری دەکردیـــن، هەتا ئێوارە درەنـــگ بۆ خۆمـــان ڕوابووین دەماری کۆڵنجەکانمـــان هەڵســـابوو ڕەق ڕەق بووبووین، ئێـــوارە دنیا تاریک داهات کردیانینـــەوەو جلەکانمان لەبەرکردو دەســـتیان کەلەپچـــە کردین و بەرەو ژوورەکانی خۆمان بردیانینەوە لەســـەر ئەو هەموو لێدان و ئازاردانەشەوە هەموومـــان لەژوورەکانـــدا یـــاری شـــەترەنجمان بەکاغەزو دەنکەشـــقاتەو قنگەجگەرە دروستکردبوو، خۆمان کاتمان پێدەکوشت. لەژوورەکەی ئێمەدا کاک عومەرو کاک ئاوات زۆر حەزیان لەیاری دەکرد زۆرجاریش هەرایان دەبوو لەســـەر یاری، بۆیـــە هەردووکیان داوایاندەکرد مـــن یارییان لەگەڵ بکـــەم منیش خـــۆم زۆر ئارەزووی یاریم نەدەکرد، جـــا چۆن بتوانم لەگەڵ هەردووکیان یاری بکەم.

ڕۆژێکیـــان کاک ئاوات و کاک عومـــەر لەژوورەکەدابوون منیان برد بۆ لێکۆڵینـــەوە و لێدان کە هاتمەوە ســـەروچاوم ڕۆشـــنی تیا نەمابوو لەشـــم هەمووی لەخوێندا ســـوور بووبوو هەردووکیان لێم هاتنە پێشـــەوە تەنیاو تەنیا پرســـیاریان لێدەکردم بەدەموچاویانەوە دیاربوو قســـەیان پێیە منیش ئەوەنـــدەم ئاشـــتکردبوونەوە بێتاقـــەت بووبووم، ئاوات وتـــی: "کاک عەلی لێدانەکان زۆر دەئێشـــان؟" دەستەکانم لەپشتەوە خستەسەر زەوی و خۆم

بەپشتدا خست و وتم: "ئەریّ وەڵڵا ئەوەندە دەهێشێت تابڵێی، بەڵام مرۆڤ دەبێت ئازابێت و گوێی پێنەدات."

کاک عومەر و ئاوات شــەترەنجەکەیان نەدەکرد، ئێوارە سەرەی ئەوان هــات بانگیانکردن بۆ لێکۆڵینەوە تەنیا بووم لەژوورەکەدا زۆر بەدیار کونە بچووکەکەی دەرگاکەوە وەســتام پێیەکانم سڕبوون ناچار ڕادەکشام، کات نەدەڕۆیشــت ژیانی چاوەڕوانی ناخۆشــترین شــتە زۆرم بیردەکردەوە تۆ بڵێــی چییان لێبکەن؟ چەندیان ئازاربدەن؟ ئەمانــە چی دەڵێن؟ چی دەبێت؟ کەمێک هەڵاژام خەریکبوو خەوم لێبکەوێت زرەزری کلیلەکان هات هەڵسامە ســەرپێ، ڕوانیم کاک عومەرو کاک ئاوات لۆژە لۆژیانە، خۆیان پێناگیرێت بەپێوە، ســەروچاویان هەڵئاوساندبوون زۆریان لێدابوون دیاربوو وەڵامی پرسیارەکەی کاک ئاواتیان دابۆوە کە لەمنی پرسی "ئەریّ ئازاری هەیە؟."

پۆلیسەکە دەرگاکەی لێکردنەوە هاتنە ژوورەوە، خێرا خێرا ئاوات دەیگوت: عومەر وەها عومەر وەها، پێکەنیم وتم: "ئۆخەی بەشــەق ئاشــتیانکردنەوە، ماڵیان ئاوابێت."

ڕۆژێکیتر هەرسێکمان لەژوورەکەی خۆماندا بووین زرەزری کلیلەکان، هات ڕوانیمان دوو کوردیان هێناو خســتیاننە ئەو ژوورە تەنهایەی نێوانی ئێمــەو خاڵەو ئــەوان، ڕێکەوت وەهابوو لەنێوان ئاودەســتی ژووری ئێمەو ئەوان پەنجەرەیەکی هەواکێش هەبوو، من چووم بەخێرهاتنم کردن و هەواڵم پرسین کە کێن و خەڵکی کوێن؟ لەوەڵامدا بۆمان دەرکەوت، قاسم عەزیز و شاخەوان دوو هاوڕێی کۆمەڵەن، چەند ڕۆژێک دوای ئەوە کوڕێکیتریان هێنا ناوی عەلی بەگ بوو (برای ئەرسەلان بایز) لەو پەنجەرەیەوە چەندجارێک قسەمان گۆڕیەوەو ئاگادارمان کردن کە نەچنە ژێرباری هیچ، ئازاد دەکرێن، هەندێک پارەشمان لەو کونەوە دانێ زۆری نەخایاند ئەوان ئازادکران.

ئێوارەیــەک پۆلیســەکان هاتن بەدەنگی بــەرز بانگیــان کردین، عومەر محەمەد قادر زیندانی حەزیدەکرد ئازاد نەکرێت بەس پۆلیس بانگی نەکات، مــن دەمزانــی ئەو عومــەر محەمەد قادرە منم چرکەم لەخــۆم بڕی و وتم، ئەگەر قســەیکرد دەڵێم من عەلیم نەک عومەر، چەندجارێک پۆلیسەکە بانگی کــرد، مــن هەر دەنگــم نەکرد کەچــی کاک عومەر خــۆی پێنەگیرا و وتی: "بەڵێ" پۆلیســەکە زۆر بێشــەرمانە یەکڕێز قسەی ناشــیرینی کردو وتی: "خێرا خۆت لەبەربکە و وەرە دەرەوە". بەپاڵ کاک عومەری برد، شەو هەر چاوەڕوانــی بووین خاڵە و فەرەیدون و جەعفەر و عومەری ســەید عەلی و ئەرســەلانیان بردبــوو نەیانهێنانەوە، ئێمە زۆر دڵپەرێشــان بووین برایانی

ســالۆنە گەورەکەش وەهابوون. پرســیارمان لەیەکتری دەکرد "دەبێت چی ڕوویدابێــت؟ کــەس نەگیرابێــت و تازە هێنابیــان وا بــرادەران دواخران؟" کەسمان وەلاممان پێنەبوو.

ڕۆژی دوایــی کاتژمێــر (١٠) بــوو هێنایاننــەوە، کاک عومەریــان زۆر پەرێشان کردبوو، کاتێک هاتە ژوورەوە یەکسەر هەردوو دەستی بۆ دواوە بــردو قاچەکانــی درێژکرد، من و ئــاوات دەورمان لێداو کەوتینە پرســیار "چــی ڕوویداوە؟ بۆچی وەها دواخران؟ زۆریان لێــدان؟"، لە وەلامدا وتی: "برا گیان من ئەمشەو هەتا بەیانی لەجیاتی تۆ لێدانم خواردووە هاتنەسەر کۆلــم بە بزمــار لەملیانــەوە دەژاندم، دەبوو لەســەر چــوار چنگۆلە بڕۆم بەسمارتە هەموو سەروچاویان هەلکەندووم"، کەوای وت ڕوانیمان هەموو ســەروچاوی ڕندراوەو لە زۆر شــوێنەوە چالیان کردبوو. وتی: "ئەو ئەمنە ڕەوشت نزمانە ســواری کۆلی خالە دەبوون و بێشەرمانە بزماریان لەملی هەلدەچەقاند."

ڕۆژێکیــان فەرەیدون پێیوتین کە تینی زۆریان بۆ خالە جەعفەر هێناوە، سەرەڕای ئەوەی شەوان لەڕێگای ئەو نۆکەرانەی دائیرەی ئەمن بۆیان دەنێرن بۆژەیان دەکەن بە پرســیاری بێسەروبەرە و قسەی زۆر ڕووخێنەرانەیان لەبەردەمــدا دەکەن. خالــە زۆر بێتاقەتەو دەلێت: ژیــان ئەوەندە ناهێنێت تا چۆکــی بــۆ دادەین لەپێناوی ئــەوەی بەدلنیاییەوە کۆمەلە بپارێزین، شــەو جامانییەکەی لە قورگی خۆی بەستووە و خۆی بەپەنجەرەکەدا هەلواسیوە، فریای کەوتین نەمانهێشت خۆی بخنکێنێت.

برایــان ئاگاداریــان کردین کــە ئەرســەلان زۆر ئازاردەدرێــت و هەر بەتەنیــاش لەژوورێکدایــە، بــەلام هەرچەنــد دەچین بۆ نووســینی بازاڕی زۆر بەورەیــە و تەنیــا داوای ئەوەیــە لەخالــە و ئــەوان بێبەشــی نەکــەن لەئامۆژگاری و ڕووداوی نوێ.

برادەرانــی ســالۆنەکە دەورێکــی زۆر گرنگیــان دەبینــی لــەوەی ئێمە بتوانیــن ڕابەری مەســەلەکە لەدەســت نەدەین، ئەو بەرنامەیــەی دامانناوە ســەرکەوتووانە جێبەجێــی بکەین، چونکە وەکو یەک شــانەی ڕێکخســتن تێکڕایــان گوێگرمــان بوون و هــەر بڕیارێکمــان دەدا جێبەجێیان دەکرد و دەنگــی ئێمەیان دەگەیاندە ئەوانیتری دوورن لێمان و خۆشــیان ئامادەبیان نیشــاندا سەرلەنوێ ئیفادەکان بگۆڕن و لەگەل قسەکانی ئێمەدا بیگونجێنن، کەســیان نەهاتە ڕوومان بەپێچەوانەی ئێمە قســەبکات، بەڕاســتی کۆمەلە بوون و پالپشــتی هەلوێستەکەمان بوون ناوبەناو لێیان دەبردن بۆ لێدان و

زۆریان ئازاردەدان، پرسـیاری زۆریان لەسەر ئێمە لێدەکردن زۆر ئازایانە جوابیان دەدایەوە.

جارێک دکتۆر جەمیل عەلی ڕەشیدیان بانگکرد، زۆریان لێداو نینۆکەکانیان هەڵکێشا تەنیا بۆ ئەوەی شتێک بڵێ لەسەر ئێمە ئامادەنەبوو، خۆگرییەکەی وەهای لێکرد لەئەنجامدا ئازادبکرێت و هیچ شـتێکی لەسـەر نەسەپێندرێت. جارێکیتر سەعدون یەدوڵڵایان بانگکرد کە زۆر منداڵ بوو زۆریان ئازاردا، هەوڵیاندا شـتێک بدرکێنێت، ئامادەیی تێدانەبوو ئەمن کۆششێکی زۆریکرد هەموویـان بەشـبەش بکات، بـەڵام پاڵەوانێتـی هاوڕێکانی پێش ئێمە کە گیرابوون ئەو هەلەی بۆ دوژمن نەڕەخساند.

ڕۆژێـک لاوێکی باڵابـەرزی عەرەبیان هێنـا خەڵکی ناوەڕاسـتی عێراق بو و سـەربە پارتی کۆمۆنیسـتی عێـراق بوو، خسـتیانە ژوورەکەی ئێمە، ئێمە وامان هەسـتکرد کـە چۆن ئەوانەیان ناردۆتـە لای خاڵە و جەعفەر، لەوانەشـە ئـەم لاوەیـان بـۆ ئێمـە ناردبێت، چونکـە هەر کە هـات زۆر بێورەبـوو خۆیدا بەزەویـدا و ڕەنگی زەرد هەڵهاتبـوو، داوای ئاوی کرد، پەرداخێک ئاومان دایە، پاشـان ویسـتی خۆی بڕواتە سەر ئاوەکە لوژەلۆژ ویسـتی هەڵبستێت دەستمانگرت لەسەر دەستشـۆرەکەی ناو ئاودەستەکە هەر قوڕگی پاکدەکردەوە، پێدەچوو ئێسـکی ماسـی لەقوڕگیدا گیربووبێت، چارەکە سـەعاتێک بەپاککردنەوەی قوڕگییەوە خەریکبوو پاشـان ویسـتی بگەڕێتەوە لامان بنهەنگڵیمان گرت و هێنامانەوە و دامانیشـاند. پرسی ئێوە خەڵکـی کوێن؟ وتمان: کوردین. سـەرنجێکی زۆری داین وەکو ئەوەی بڵێی دووچاری چ ڕۆژەڕەشێک بووبم، پێدەچوو قسەی خراپیان لەسەر کورد بۆ کردبێـت، هەندە بێدەنگ بوو ئەوجا ئێمە پرسـیارمان کرد "ئەی تۆ خەڵکی کوێیت؟". وتی: "دەورووبەری شـاری بەغدام و لەسـەر پارتی کۆمۆنیست گیراوم زۆریان لێدام، منیش ناچار هەندێک شـتم وتووە و بڕیارە سـبەی بمبـەن لەشـارەکەی خۆمان ماڵی و نـاوی ئەوانەیان پێ نیشـان بدەم کە لەگەڵیان کارمکردووە".

ئـەو قسـەیەی زۆر سـەرنجی ڕاکیشـاین، هەرسـێکمان سـەرنجی یەکترمان دا، بەڵام لەسـادەیی و دەمودوی کـوڕە لاوەکە ئەوە دەزانرا کە ئـەم لاوە لەپێشـی ئـەوەی بکەوێتە زینـدان زۆر لەخۆبایی بـووە، گاڵتەی بەزیندان هاتووە، سەرچڵانە کاریکردووە باش خۆی بۆ خەباتی ژێرزەمینی پـەروەردە نەکـردووەو وایزانیوە گەمـە دەکات، ڕەنگـە لەکۆبوونەوەکاندا بەسێ چوار کەس پێی نەوەستابن و زانیمان ڕووخاوە، بۆیە وردەوردە ئێمە قسەمان بۆ کرد، زۆر سەرکۆنەمان کردو هانماندەدا کە هاوڕێکانی بەگرت

نەدات، چونکە شەرمەزارییەو هەتاماوە لەدنیادا سەرشۆڕ دەبێت، پاشان لێمان پرسی چی وەهای کرد تۆ ئەوها بڕوخێیت؟ ئەی باشە ئێوە لەڕێکخراوەکەی خۆتانــدا بۆیان باس نەکردوون کە ڕێگای خەبات هەموو جۆرە ئازاردان و ئەشکەنجەی تێدایە، هەر لەگرتن، ڕاونان، برسێتی، زامداری، ئیعدامکردن؟" وتی: "نەخێــر، من وامدەزانی ســەیرانە کە لەکۆبوونەوەکان دادەنیشــتین، باسمان لەناکۆکییەکان دەکرد، خۆمان هێندە بە بەهێز دەزانی بڕوام نەبوو دووچاری ئەم بەڵایە دەبم، بەڵام ئێوە نازانن ئەمان چییان لەمن کردووە."

پرســیمان، چییــان لێکردوویــت؟، وتــی: "هەڵیانواســیوم، نینۆکەکانیان دەرهێنام، فەلاقەیانکردم، زۆر زۆریان لێدام هەمووی لام شــتێکی ئاســایی بــوو، چونکە کە کەوتمە زیندان ئەوســا زانیم ئــەوەی ئێمە خەریکی بووین گەمە نەبوو، بەڵکو سیاسەت بوو، سیاسەتیش پێگەیەکی سەخت و دژوارە، بــەڵام پاش لێدانێکی زۆر، زۆرم تینوو بــوو، داوای ئاوم کرد، وتیان ئاوت نادەینــێ تا ڕاســتیمان پێنەڵێیــت، توونێتی تینــی بۆ هێنــام بەڵێنمدا چییان دەوێت دەیکەم و دەیڵێم با بمخنکێنن، بەڵام بە مەرجێک هەندێ ئاوم بدەنێ، دەســتیانکردمەوە پەرداخێک ئاویان دامێ هەتا خواردمەوە هەســتم نەکرد، چونکــە کەمێــک فێنکبــوو، بەڵام کــە خواردمەوە تا ماوەیەک شــێتی کردم بۆمدەرکەوت ئەم پەرداخە ئاو نەبوو و شــەربەتیش نەبوو، بەڵکو پیســایی مــرۆڤ بوو شــلکرابۆوە و دەرخواردیان دام، هەرســەری بادەدا و چاوی دەنوقاند، هێڵنجی دەدا."

وتی: "براینە کێ دیوێتی پەرداخێک پیسایی بخواتەوە، بۆیە شێت بووم هۆشم لەدەستداوەو بەجارێک ڕووخام، جا ئێوە دەڵێن چی؟."

بــرادەران کاک عومــەرو کاک ئــاوات و مــن بێئەوەی بترســین بۆمان شــیکردەوە ئەوەی تۆ چۆکدادانە نەک تەنیا خۆت، بەڵکو ماڵی خەڵکیتریش وێراندەکەیت جا باشترین چارە ئەوەیە پاشگەزبەوە و سبەی کە بردیانیتەوە بڵێ ئێوە پیساییتان دەرخوارد داوم و لەترسان من قسەم وتووە، نە سەربە هیچ پارتێکی سیاسیم و نەهیچ کەس دەناسم، ئەگەر خۆم دەکوژن بمکوژن، ئەگینا کەس ناناسم. هەوڵەکەمان سەریگرت و ئەو لاوە بەهیمەتێکی نوێوە چووە بەردەمی لێکۆڵینەوەو لەقسەکانی پێشووی پاشگەزبۆوەو ئینجا پاش مانگێک ئازاردان، ئازادکرا.

ئــەو ماوەیــەی لەئەمنی عامــدا بوویــن هەوڵێکی زۆرمــان دا ئەوانەی تازە دەهێنران دەممان بیانگاتێ و هانیان بدەین شت نەدرکێنن، بەڕاســتی گەڕاندنــەوەی ئێمــە بــۆ عێــراق و کەوتنە زیندانــەوە ئەگەرچــی زیانێکی

گەورەبــوو لەكۆمەڵــە كــەوت و بەهۆی گیرانـــی ئێمەوە كۆمەڵـــە هەندێک گیروگرفتــی ناوخۆی بۆ دروســـتبوو، بەڵام لەلایەكیتــرەوە قوتابخانەیەكی نــوێ بــوو داهات بۆ خۆگرتــن و بەگژداچوونەوەی شــێوەی جۆر بەجۆر دژی زیندانی بەهۆی ئەوەی كۆمەڵەوە وانەی خۆگرتن فێری هاوڕێكانی و خەڵكی بكات لەڕۆژگاری خەباتدا.

حســێن ڕەزا ڕەزا یەكێک بوو لەو هاوڕێیانەی ئێمە لەئەمنی ســلێمانی ئازاریاندابــوو لەســاڵۆنێكی درێژدا بــە ڕووتوقوتی ڕاویــان نابوو لەداوەو لەپێشەوە بەسۆندە لێیاندابوو هەڵیان واسیبوو نینۆكەكانیان دەرهێنابوو هەر دوو گونی خرابووە نێوانی دوو دارەوە و زەختیان لێكردبوو بۆی بتەقێنن، بــەڵام ئەوەندە بڕوای بەكۆمەڵە و بیروباوەڕەكەی هەبوو بەهیچ شــێوەیەک چۆكی بۆ دوژمن نەدا، ئەوەی بەحســێن ڕەزا كرابوو لەمێژووی ئازاردانی زیندانی فاشیەتدا بێوێنە بووە، بەڵام گاڵتەی بە خوێڕێتی ئەمنەكان هاتبوو، لەئەمنــی بەغداش بۆیان نوێكردەوە هەرچی شــێوەی لێدان و هەڵواســین، نینــۆک دەرهێنان، فەلاقە، شــەڕی دەروونی هەیە لەگەڵیانكــرد بێ كۆڵدان بەسەری بەرزەوە ڕزگاری بوو.

شــەوێک هەمــوو هاوڕێكانــی من بران، واتە ئەو شــەش بــرادەرەی كە لەگەڵمدا گیرابوون، نەیانهێنانەوە هەتا ســبەینێ بەتەنیا وەكو مار گینگڵم دا، نەمدەزانی چی ڕوویداوە كات خۆی دابوو لەهەشــتی بەیانی زرەزرِی كلیل ڕایپەڕاندم هەڵســامە ســەرپێ بەدزیی پۆلیســەكانەوە ســەرنجم دەدا دیتم هەموویــان هێندرانەوە پێكەنینەكانیان زۆر لەجاران زیاتر و ڕوو خۆشــتر بوون، ســەرنجی هاوڕێیانی ناو هۆڵەكەشیان ڕاكێشابوو، كاتێک پۆلیسەكە هــات دەرگای لای ئێمــە بكاتــەوە لەســەر جێگاكــەی خۆم دانیشــتم، كاک عومەرو كاک ئاوات هاتنە ژوورەوە، زۆر دڵخۆشــبوون خۆ ئاوات نۆرەی نەدەدا بە كاک عومەر قســەكان بگێڕێتەوەو ئەوەندە خۆشحاڵ بوو خەڵكی ڕزگاریشــی بێت هەر ئەوەندە خۆشــحاڵ دەبێت، پرسیم چی ڕوویداوە؟ وا ئەوەنــدە خۆشــحاڵن، وتیان كاكــە ئەمڕۆ هەموومانیان بــرد بۆلای (محقق عەدلــی) و تەحقیــق تەواو بوو دەماندەن بــەدادگا لێرە لامان دەبەن، ئەمەم لا خەبەرێكی زۆر خۆشــبوو بە نیسبەت گشتی، بەڵام بۆ من دڵتەنگی بوو دەترســام وتم: "ئــەی من؟"، وتیان: "تۆش بانگ دەكرێیــت". وتم: "كەی؟"، وتیــان: "هــەر دەمێک بێــت" بڕوا بكەن یەک شــەو و ڕۆژ مــن وەكو مار گینگڵــم دەداو نەمدەزانی چی بكەم، زۆر دەترســام من تەنیا لەتاقیكردنەوە مێژووییەكــەدا دەرنەچم و ڕووڕەشــی بەردەمی مێــژو و خەڵكی بم، كاک عومــەر و كاک ئــاوات زۆر دڵیان دەدامەوە، بــەڵام خۆم پێنەدەگیرا، كاتێک

سـەرەم هات و زرەی کلیل هات وەکو جاران لێی نەدەترسام، ئەمجارەیان ئارەزووم دەکرد زووتر بانگم بکەن، پۆلیسەکە هاتە پێشەوە و بانگی کردم "عەلـی محەمەد قـادر"، خێرا خۆم سـازکردو لەگەڵ کردنـەوەی دەرگاکە چوومە دەرێ و پێشـی کەوتم، بردمیان بۆ شـوێنێکیتر کە جاران بۆ ئەوێ نەبـوو، زانیـم منیش دەبەن بۆ (محقق عەدلـی) بردمیانە ژوورێک پیاوێکی بەتەمەن دانیشـتبوو بە زمانێکی خۆش وتی: "دانیشـە"، لەسەرخۆ پرسی: "تۆ لەگەڵ شەهاب نوری و ئاوات عەبدولغەفور کتێبت خوێندۆتەوە؟"، وتم: "نەخێر"، وتی: "نایانناسی؟"، وتم: "نەخێر، تەنیا لەزیندانەکانی ئێرە و ئێران ئاشنایەتیم لەگەڵیان هەیە".

وتی: "تۆ ناوت عومەر محەمەد قادر نییە؟"، وتم: "نەخێر". وتی: "باشـە ئـەم ئیفادەیە هـی تۆ نییە؟"، وتـم: "نەخێر، من نەهاتوومەتـە ئێرە". بانگی پۆلیسـەکەی کـرد بردمیان بۆ ژوورێکیتر، لەوێـش (محقق عەدل)ێکی تری لێبـوو، بەڵام ئەوەیـان لەجیاتی ئیبراهیـم عەلاوی داری بەدەسـتەوە بوو هەرچی وت دووبارە قسـەی کابرای پێشـوو بوو، منیش بە نەخێر جوابم دایـەوە، زۆر توورەبـوو وتی: "ئێمە غەشـیمین"، وتم: "مـن وانالێم، بەڵام ئەوە ئیفادەی من نییە"، وتی: "دەتنێرمەوە بۆ هەڵواسـین"، وتم: "چاکە من دەسـەڵاتم چییە"، زۆر بەتوورەیی بەئەمنەکانی وت، بردمیان بۆ شـوعبەی دوو لای ئیبراهیـم عـەلاوی، ئەو ڕۆژە عەلاوی خۆشـی لـەوێ بوو لێیان پرسـیم "ئەو ئیفادەیە هی تۆ نییە؟"، وتم: "نەخێر". هەمان قسەیانکردەوە و وتیان: "ئێمە غەشیمین؟"، وتم: "من وانالێم"، ئیبراهیم عەلاوی وتی: "ئێستا دەتڕژێنـم لەبـن داردا"، وتـم: "جا ئـەوە (٥٣) ڕۆژە ئێـوە هەموو ڕۆژێک هەڵمدەواسـن، لێم دەدەن، نینۆکـم دەردەهێنن، جـۆردۆ کاراتێ چی نەماوە نەیکـەن جا دەسـەڵاتی مـن چییە؟" بـە توورەییەوە ناردمـی بۆ ژوورێک مێزێک و ڕاخەرێکی پیس و خوێناوی و چەند پارچە سۆندەیەکی لێکەوتبوو، دوو جەلاد گرتیانم بەدەسـتەوە و زلەی یەکەم عەلاوی خۆی هاویشتی و ئەو سەگانەی بەردایە گیانم باش باشیان کوتام هەندێکیتر لەنینۆکەکانمیان ڕاکێشـایەوەو فەلاقەیەکی چاکیان کردم پاشـان وتی: "تۆش لەناو تەیاری مارکسـی- لینینی کوردستان دایت؟" وتم: "بەڵێ" خێرا پڕیانکردەوە مایەوە لەسـەر ئەوەی عیماد دەیوت حزبی مارکسی- لینینی منیش دەموت نەخێر تەیار زۆری وت و زۆرم ڕەتکردەوە و بۆم شـیکردەوە فەرق چییە، وتی: "باشە تۆ خۆت لەمن کردووە بە کەڕوڵاڵ ئەی بۆچی لەسەر تەیار و پارت ئەو هەموو مشتومڕە دەکەیت ئەگەر ئاگات لەهیچ نییە؟".

وتم: "ئەوە (٥٣) شەوە لەسەر ئەم تەیارو پارتە ئێوە شەقم تێهەڵدەدەن

ئـەی چـۆن فێری نەبـم بەرگری لەبێتاوانــی خۆم بکەم هــەر چۆنێک بوو ئـەوان ناردمیانەوە بـۆلای (محقق عەدلی) بێئابڕو کە ئیفادەکەی نووســی ئەویـش لەســەر پارت و تەیـار کێشــەیەکی زۆری لەگەڵ کـردم من هەر دەمســەلماند ئەویش هەر لەســەر پارتی مارکســی- لینینی قســەیدەکرد تا ڕزگارم بوو بە فەلاکەت ئەو ڕۆژەش (٥٣) شەو لێدان و هەڵواسین، نینۆک دەرهێنــان جۆرەها شــێوەی ئازاردان و شــەڕی دەروونی بەدڵی خۆش و ســەربەرز گەڕامــەوە لای هاوڕێکانم ئێمــە هەموومان ئەوەمــان لا گرنگ نەبوو کە دەمرین، بەڵکو ئەوەمان لا گرنگ بوو چۆن دەتوانین ســەربەرز، دەربازبین و نەبین بەهۆی بەگرتدان و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە.

کات خـۆی دابـوو لە یەکی نیـوەڕۆو پۆلیســەکان بردمیانــەوە منیش لاسایی هاوڕێکانم کردەوە و بەڕووی خۆش و خەندەوە گەڕامەوە، هەموو دڵنیابوون منیش ڕزگارم بوو، هەر ئەو ڕۆژە بوو شەو هەموومان واتە هەر حەوتمان کراینە ناو ســاڵۆنە گەورەکەوە بە هاوڕێ پاڵەوانەکانمان شــادو شــکوور بووینــەوە، ماوەیەک لــەوێ ماینەوە لەگەڵ ئەوانەی کە نەشــمان ناسی بوون ناسیاویمان پەیدا کرد، لەو ماوەیەی چاوەڕوانی گوێزانەوە بۆ شوێنێکیتر بۆ کات بەسەربردن خۆمان بە هەندێک شتەوە مەشغوڵ دەکرد وەکو دروســتکردنی شــەترەنج بەنــاوە هەویری ســەموون و بەوەرەقەی ڕەنگاوڕەنگــی کلینیکس و کەڵکی زۆریشــمان لەو پیاوە فەلەســتینییە ئەبو مــەروان بینی کە مامۆســتای فێرکردنــی شــەترەنجبوو هەروەها ئەندامی پارتی کۆمۆنیســتی عێراق بوو، کە لەو هۆڵەدا زیندانی کرابوو، شــارەزایی چاکــی لەشــەترەنج هەبوو دەورەی ململانێی شــەترەنج کرایەوەو هەندێک بــرادەر شــەهادەیان وەرگرت، لەوانە ئەنوەر حەســەن و جەبار فەرمان و کاک دارۆی شێخ نوری و سەعدون یەدوڵلام لەیادە.

ئەو ماوەیە تێکەڵاوی خەڵکی تری زیندانەکە بووین، هەر لەو سەردەمەدا لەشــەقامەکانی بەغداو شــارەکانیتر بەناوی پەلاماردانی کچان ژمارەیەکی یەکجار زۆریان هێنا، هەندێک خەڵکی شارە جیاجیاکان لەبەغدا بەرکەوتبوون. ئێمە توانیمان لەسەلامەتی خۆمان هەواڵ بنێرینەوە، چونکە ئەوانە یەک دوو شەو دەمانەوە و ئازاد دەکران.

لەیادی نەورۆزی ساڵی ١٩٧٦دا لەناو ئەو ساڵۆنەو ئەو هەموو خەڵکەدا شــیرینیمان کـڕی و جەژنــی نەورۆزمــان یادکـردەوەو کۆمەڵێک عەرەب گۆرانیان بەسەرماندا هەڵدا، بەو بۆنەیەوە تەوژم و خۆگری وەهای کردبوو بڕوامــان لەو زیندانــەدا زۆر بەهێزتر بوو، چونکە زۆر تەباو براو دڵپاک و سەرڕاست بووین لەگەڵ یەکتری.

## گوێزانەوەمان لە ئەمنی عامەوە بۆ فزەیلیە

پاش (١٥) ڕۆژێک مانەوەمان لەم سالۆنەو لەئەمنی عام دوای تەواوبوونی لێکۆڵینەوە بەرەو (فزەیلیە) بردیانین.

( فزەیلیـە)ی بەغـدا بریتیبـوو لەحەوشـێکی بچکۆلـەی (٤*١٢)م، ئـەم حەوشـەیە حەمامێک و دوو سـێ هۆدەی بچکۆلەی تێدابوو کە لەکاتی خۆی شـوێنی ئەسپەوانەکانی ڕایزی سـەردەمی (مەلیک فەیسەڵ و نوری سەعید) بـوو. ژمـارەی (٢٠٠ تـا ٢٥٠) بەنـدی تێدابـوو کـە بریتیبوون لە بەشـێکی زۆری پارتـی دەعـواو ژمارەیـەک پارتی بەعسـی سـەر بەسـوریاو چەند برایەکی حزبی شـیوعی عێـراق ل.م و هەندێک کوردی کوردسـتانی ئێران، حەوشەی دووەم حەوشەیەکی پانوپۆڕی زۆر گەورە کە شوێنی حەوانەوەی ئەسـپەکانی ڕایز بوو، ئەم حەوشەیە یەک (W.C) لەگەڵ ژوورێکی بچووکی (١ بـە ٢) دەبـوو هەتا سـەرنج بدەیت شـوێنێکی پیس و پەڵـۆس بوو کە بە کەڵکـی حەوانـەوەی ناچـاری مـرۆڤ نەدەهـات ژمـارەی زیاتر لـە (٤٠٠) بەنـدی هەمەجـۆرەی تێدابـوو کـە زۆربەیان کـوردی کوردسـتانی ئێران بـوون و لەدەسـت برسـێتی و دیکتاتۆریەتـی ڕژێمـی حەمـەڕەزا شـا هاتبوونـە عێراق بۆئەوەی بەڕەنجی شـانی خۆیان تیکەنانێـک پەیدابکەن و بەئاسـوودەیی و دوور لەڕاونانـی سـاواکی ئێرانـی بژیـن، هەندێـک کوردیشـی تێدابـوو کە ڕژێمی شـا بـۆ کاری تایبەتی خـۆی ناردبوونی و دەسـتگیرکرابوون و چەند کوردێکی کوردسـتانی باشووریشی تێدابوون کە پاش هەرەسـەکە بوختانـی جۆراوجۆریان بۆ دروسـتکردبوون و خرابوونە ئـەم گرتووخانەیـەوە بـۆ چاوەڕوانـی دادگایـی، بـاری ژیـان لەهـەردوو بەشـەکەی ئەم زیندانە کاتییەدا نائاسایی بوو، بەتایبەت ژیانی زیندانییەکانی حەوشـە گەورەکـە هـەر زۆر خراپتربـوو، چونکـە هێشـتا پاشـەڕۆی ئەسپەکان و ئاخوڕەکانیان شوێنەواریان دیاربوو سەرەڕای ئەوەش خەڵکەکەی، چونکە دووربوون لەکەسـوکارو دەرامەتیان نەبوو، ئەوەی پێی دەژیان تەنیا ئەو (کانەیە) ئازووقەیە بوو کە لەئیدارەی بەندیخانەکەوە پێیاندەدرا بیخۆن، کە ئەگەر نەیخۆن دەمرن، بۆ نموونە خواردنی هەردوو بەشـەکەی بەندیخانەکە یەک سـەرچاوەی هەبوو لەکاتێکدا بەندی قاپێکی دەبرد چێشـتی بۆ تێبکەن، چێشتچییەکە (عنقرچی) سـەری مەنجەڵەکەی لادەبرد، هەتا قاپێکی پڕدەکرد بەسەدان مێش خۆی تێدا سووردەکردەوە، سەرەڕای پیس و پەڵۆسی لەلێنان و تاموچێژدا لەبەرئەوەی ناچاربووین بەخواردنی دەبوو جارێکیکەش زەخیرەی ناو چێشتەکە بپاڵێون و بەشێوەیەکیتر سووربیکەنەوە، ئەوسا کەمێک بەکەڵکی خواردن دەهات کە ئەویش هەموو کەسێک بۆی هەڵنەدەسوڕا.

## ئامادەکردنمان بۆ دادگاییکردن

ئێمە هێشتا بەتەواوی شوێنەواری لێدان لەسەر لاشەمان ساڕێژ نەبووبوو، شوێنی پلایس و سۆندەو کارەباو پانکەو جۆدۆو کاراتێ لەسەر سەروچاو و دەست و قاچمان لا نەچووبوو هەرچەند ڕۆژگارێک وەکو مار چۆن کاژ فڕێدەدا ئێمەش ئاوها پێستی نوێمان هەڵدەدا، ئاگادارکراین کە ئامادەبین بۆ دادگاییکردن، بەڵام کە سەرنجی سەروچاو و لاشەیان دەداین شوێنی ئازاری پێوە دیارە چەند ڕۆژێکیتر دوایاندەخست، ئێمە زۆرمان ئارەزوو دەکرد زووتر بمانبەن بۆ دادگاییکردن، چونکە لەو ماوەیەی لە (فزەیلیە) بووین چەندجارێک خزم و براو کەسوکارو هاوڕێیانی کۆمەڵە سەریان لێدابووین و برایانی کۆمەڵە، ڕێکخراوی کەرکوک و بەغدا نەخشەیەکیان بەدەستەوەبوو کە کاتێک ئێمەیان برد بۆ دادگای بەناو شۆڕش (محكمة الثورة) هەوڵبدەن لەڕێگا لەدەست پۆلیس دەرمان بهێنن، ئێمەش زۆرمان لا چاکبوو، بۆیە هەموو هەستی خۆمان لەگەڵ نەخشەکەی ئەوان جووت کردبوو.

چەند جارێک بردیانیین بۆ دادگا بەڵام بێ هیچ لێپرسینەوەک دەیانگێڕاینەوە، ئەمەی باسی دەکەم دوا جارییانە، پاش ئەوەی زانیتیان زامەکانمان شوێنەواریان کەمبۆتەوە لەسەر دەموچاو و لەشمان، ڕۆژی بردنیان بۆ دیاریکردین و عەسرێک سەعات (٤)ی ئێوارە، دەرگای زیندانیان کردەوەو بەپێی لیستی دەستیان یەکەیەکە بانگیان کردین و یەک یەک و دوو دوو کەلەپچەیان کردین و خستیانینە ناو چەند ئۆتۆمۆبێلێکی پەنجەرەدارەوە و بەرەو دادگای بەناو (شۆڕش) کاروانەکەمان بەکۆڵان و شەقامی پێچاوپێچدا لەسەرخۆو بەهۆشیاری هەنگاوی دەنا. ئێمەش بە هەموو لایەکدا چاومان دەگێڕا بۆ ڕووداوێک، بەڵام کاتێکمان زانی لەکۆڵانە تەنگەبەرەکەی دەرگا بچکۆلەکەی خۆرئاوای دادگا خۆمان بەدیکرد، تا دەهات ئۆتۆمۆبێلەکان لەسەرخۆتر دەبوون و دەڕۆیشتن، ئێمە چونکە چاومان دەگێڕا خەڵکێکی زۆرمان زووتر بەدیکرد کە لەمبەرو ئەوبەری کۆڵانەکەو بەردەرگا وەستابوون و خێرا ناسیماننەوە کە خزم و براو کەسی خۆمان بوون و هەواڵی ڕۆژی دادگاییکردنی ئێمەیان زانیوە و هاتوون بۆ دیدار، پاشەڕۆژی ئێمە هەریەکێک لەخزم و براو کەس ئێمەیان بەدیکرد، پڵینگ ئاسا هەڵمەتیان هێناو هەریەک پریاسکەیەک خواردەمەنی جۆراوجۆریان بۆ خستینە ئۆتۆمۆبێلەکەوەو بەدەنگی نزم دەیانوت "بڕواتان بەهێزبێت" و هەر دەستی خۆیان دەگوشی، پۆلیسەکان نێوانیان کردین و ئێمەیان خێرا داگرت و فڕێیاندانیە حەوشەیەکی گەورەی دادگاوە و ئاگامان

لەخزمان برا، پاش چارەکێکیتر ناویان خوێندینەوە و سەرژمێریان کردین و بردیانین بۆ سالۆنێکی گەورە کە لە قاتی ژێرەوەی دادگابوو، هەندێکیش لەوێ ڕایانگرتین و کەلەپچەکانیان لەدەست کردینەوە و بردیانین بۆ ژێرزەمینێکی سەیروسەمەرە کە بۆ چاوەڕوانی بردنەپێش ئەندامانی دادگایە.

شوێنەکە هەرکەسێک دەیبینێت بڕواناکەم وەسفێکی پڕ بەپێستی خۆی بکات، هیوا دەخوازم هیچ مرۆڤێکی سەر گۆی زەوی بەدیلی ڕێگەی نەکەوێتە ئەو شوێنە کە تەنیا لەوە زیاتر بەیادتادێت نەفرەت لە فاشیەت بکەیت و هیچیتر.

ئەم ژێرزەمینە (کوشتارخانە)ی خەڵکە نەک شوێنی دادو دادپەروەری و لەزۆر کۆنەوە دروستکراوە بۆ قڕکردنی مرۆڤ بە تاک و بە کۆمەڵ. شوێنێکە وەها دامەزراوە پانی (٥ بە ٩)مەترەو بە کەوانەیی لەسەر شێوەی کۆن دامەزراوە و تەنیا دوو کلاوڕۆژنەی تێدایە، لەسەر تەختی حەوشەی سەرەوە کە شێوەی دروستکردنەکەی وەهایە نە لەخوارەوە سەرەوە دیارە و نە لەسەرەوە خوارەوە بەدیدەکرێت، بە پانی و بە درێژی و بە بەرزی ئەم دیوارە نەخشێندراوە بە مانشێتی دەستی مرۆڤی شۆڕشگێڕو بێتاوان، بەشێوەیەک نەخشێندراوە کە لە توانای مندا نییە وەکو خۆی بۆ خوێنەری بەڕێزی بگێڕمەوە کە چۆن شۆڕشگێڕان و بێتاوانانی کوردستان و عێراق و دەوڵەتانی دەوروبەر حوکمیان بەسەردا دراوەو بەناڕەوایی و هەریەکەیان بەشێوەی جۆراوجۆر و بەخەتی جۆراوجۆر و بە زمانی جۆراوجۆر نووسیبوویانن.

ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەو نووسراوانەی سەر دیوارەکە:

- من کوردم تەنیا لەبەرئەوەی نەبووم بە بەعسی بڕیاری خنکاندیان بەسەرمدا داوەو ماوەیەکی یەکجار زۆریشە بێسەروشوێن کراوم و ماڵ و منداڵ و کەسوکارم لێم بێخەبەرن.

- من تاوانم هەر ئەوەندەیە کە کوردم و خەڵکی کوردستانم و خائین نیم بەگەلەکەم، بۆیە بڕیاری مەرگیان بەسەردا داوم، کەسوکارم هیچ ئاگاداری دواڕۆژم نین، هەرلەو شەوەوە کە لەناو جێگاوە دەریان هێناوم تا ئەمڕۆ.

- من لاوێکی کوردی کوردستانی ئێرانم، لەدەست زەبروزەنگی ڕژێمی شا هەڵهاتووم و ڕوومکردە ئەم وڵاتە کاربکەم و بەئاسوودەیی بژیم، بەڵام

ئەمزانی لەدەست ڕژێمێکی دژ بەکورد هەڵهاتم و کەوتمە داوی ڕژێمێکی زۆر لەو خراپترو دژەکوردترو بڕیاری خنکاندیان داوە بەسەرمداو هیچ کەس نییە هەواڵی مەرگم بگەیەنێت بەکەسوکارم.

– من شۆڕشگێڕێکی عەرەب بووم و لەبەرەی زەفار زۆر بەدڵسۆزانە بۆ ڕزگاری وڵاتەکەم کارم دەکرد، بەڵام نەخشەی گڵاوی دوژمنانمان شۆڕشەکەی لەباربردین و منیش عێراقم بەدەوڵەتێکی شۆڕشگێڕی عەرەب دەزانی و هاتم لێرە درێژە بەخەبات بدەم، بەڵام کەوتمە بەندیخانەو پاش جۆرەها ئازاری نامرۆڤانە بڕیاریاندا کۆتایی بەژیانم بهێنن، گوایە کار بۆ دەرەوەی عەرەب دەکەم کە ئەمەیان دوورە لەڕاستی و بۆمدەرکەوت ئەم وڵاتە زیندانێکە بۆ خەڵکی شۆڕشگێڕ کە تێیدا کۆتایی بەژیانی بهێنێت و دوورن لەوەی لە خزمەتی عەرەب و مرۆڤایەتیدا بن.

– من عەرەبم، خەڵکی یەمەنم ویستم ئەوەبوو لەگەڵ برایانیتری عەرەب خەبات بکەم بۆ یەکگرتنەوەی هەردوو یەمەن و ڕزگارکردنی کۆمەڵگاکەمان لەدەست داگیرکردن و ژێردەستەیی، بەڵام ئەم ڕژێمە عەرەبە بەتاوانی نارەواو سیخوڕیکردن بۆ بێگانە تاوانباریان کردووم و ئازارێکی زۆریانداوم و هیچ حورمەتم ناگرن و ئیهانەی زۆرم دەکەن و داوای ئەوەم لێدەکەن ببم بەنۆکەری ئەوان و بچمە ناو ڕیزی تێکۆشەرانی فەلەستین و لەبەرژەوەندی ئەمان کاربکەم، منیش بەهیچ شێوەیەک کاری ناپاکیم پێ قەبووڵ ناکرێت، هەر بۆیە ئەوانیش بڕیاریانداوە چەند ساڵێکیتر بەمشێوەیە لەگرتووخانەی عێراق بمهێڵنەوە.

– ئێمە چەند تێکۆشەرێکی سەر بەڕێکخراوەکانی کوردستانی باشوورین و لەپێناوی ڕزگارکردنی گەلەکەمان کارمانکردووە، پاش کارەساتە دڵتەزێنەکەی هەرەس بەبیانووی جۆراوجۆرو بوختان شەو لەناو جێگا گرتوویانین و پاش ماوەیەکی زۆر ئازاردان و سەرنگونکردن وا ئێستا بڕیاریان دا بمانخنکێنن، هەر لەبەرئەوەی بڕوای تەواومان بەڕاستی و ڕەوایی کێشەی گەلەکەمان هەبووە.

– من خەڵکی ئەفغانستانم لەدەست باری سیاسی و ئابووری وڵاتەکەم سەری خۆم هەڵگرتووە، ناوی عێراقم بەدەوڵەتێکی دژی ئیمپریالیزم بیستبوو پێموابوو دەوڵەتی خەڵکەو دیموکراتین پاڵپشتی تێکۆشەرەکانی دنیادەکەن، بەڵام بەگەیشتنم بەعێراق خرامە ژێر قورسترین شێوەی ئازاردان و جۆرەها شێوە ئازاری نامرۆڤانەیان لەدژم بەکارهێنا، ئێستاش

بڕیاری (١٥) ســاڵ زیندانیان بەســەرمدا داوە بەتاوانی ســیخوڕی، خۆیان نیشاندام کە ئەمان ڕۆڵەی قوتابخانەی هیتلەرو مۆسۆلۆنین.

- مــن پیاوێکــی قەومی عەرەبم و بڕوام وایــە یەکێتی خاک و نەتەوەی عــەرەب دامەزرێــت و ڕێگــەم هەڵەکــردو هاتــم لەعێــراق وزەو توانــا وەربگــرم، بەڵام دوچاری بەندیخانەبووم و هاموشــۆی کەســوکاریان لێ قەدەغەکردووم و بڕیارە (٢٠) ساڵ زیندانی تەواو بکەم بە کاری گرانەوە.

ئەمانەی ســەرەوەو جۆرەها نووسینی سەیرو دڵتەزێن کە گێڕانەوەیان ئاسان نییە لەسەر دیواری ژوورەکەدا نووسرابوون.

پۆلیســەکان هاتنــە دەرگاو بەلیســت ناوەکانیــان خوێنــدەوە: "ئەنوەر زۆراب، جەعفــەر عەبدولواحیــد، شــەهاب نــوری ســاڵح، تــا گەیشــتە هەموومــان و بەپێپلیکانــە پێچاوپێچەکانــدا بــەرەو لای (جارولــڵا عەلاف) ســەرۆکی دادگای بەنــاو (شــۆڕش)، ســەریان خســتین، یەکــە یەکــە براینــە شــوێنی تاوانبــار واتە نــاو قەفەزەکە کــە (١٥) کەســێکی دەگرت، پاشــماوەی ئەوانیترمان لەنێوانی قەفەزی تاوانبــاران و قەفەزی دادوەران وەســتێندراین و چەنــد پۆلیســێک و یــەک معاونی ئەمن کە کــورد بوو بۆ گۆڕینــی قســەکان لەکوردییــەوە بــۆ عەرەبــی وەســتێندرابوون، جارولڵا عەلاف وەکو ترســنۆکێکی ئازا چەکوشەکەی دا بەمێزەکەیداو هاواری کرد "دادگا" و هەندێــک قســەی نابەجــێ و ناڕەواو هەڕەشەوگوڕەشــەی کرد، کردینی بە (٣) بەشەوە، شەهاب شێخ نوری ساڵح بڕیاری خنکاندن تا مردن، بەتاوانی پەیوەندی دەرەوەو هاندانی خەڵکی بۆ خۆڕێکخستن، ئەنوەر زۆراب بەبڕیاری خنکاندن تا مردن بەتاوانی ڕەئیس عەســابەو پەیوەندی دەرەوە، جەعفەر عەبدولواحید بەتاوانی سەردانی دەرەوەو بینینی جەلال تاڵەبانی و پەیوەندی دەرەوەو هاندانی خەڵکی بۆ خۆســازدان و خۆڕێکخستن بڕیاری مەرگ و خنکاندنی تا مردن.

(٢٢)کــەس بەتاوانــی کارکردن بــۆ خوێندنەوەو خۆســازدان و خەڵک هۆشــیارکردنەوە بــۆ خۆڕێکخســتن مــاوەی (٦) شــەش ســاڵ زیندانــی بەکارکردنی بەردەوام، (٨) کەس ئازاد کە بەڵگەی تەواو بەدەستەوە نەبوو، بێتاوانبــوون و ئازادکــران، ئێمــە ژمارەمان (٣٣) بەندی بووین کە لەســەر کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان گیرابووین.

خەڵکی زۆربەی شــارەکانی کوردســتانمان لەگەڵ بوو، جگە لەهەندێک برادەرمان کە لەبەغدا دادەنیشتن سەر بەڕێکخراوی ئەم شارە بوون.

## لیستی ناوەکان:

ناوی ئەو هاوڕێ تێکۆشەرانەی کە پێکەوە براینە بەردەمی مەحکەمەی بەناو شۆڕشی بەعسییەکان:

١. شەهاب شێخ نوری
٢. جەعفەر عەبدولواحید
٣. ئەنوەر زۆراب
٤. عومەر سەید عەلی
٥. دارا شێخ نوری
٦. دکتۆر ئەرسەلان بایز
٧. عەلی محەمەد قادر (عەلی بچکۆل)
٨. فەرەیدون عەبدولقادر
٩. ئاسۆ شێخ نوری
١٠. عوسمان ئەحمەد نەسروڵلا (نانەوا)
١١. ئاوات عەبدولغەفور
١٢. عەلی حەمە مراد (وەستا عەلی)
١٣. جەبار فەرمان
١٤. محەمەدی میرزا سەعید (کاکە حەمە)
١٥. سەعدون یەدوڵلا شەفی (سەعدون فەیلی)
١٦. سەلام محەمەد برزو
١٧. ئەنوەر حەسەن
١٨. عەبدوڵلا ڕەشید

١٩. حسێن ڕەزا ڕەزا، بۆجاری دووەمیش گیرایەوەو هەر بەقارەمانی شەهید بوو.

٢٠. فاروق ئەحمەد

٢١. حاکم ئیبراهیم حەسەن (بلەیخ)

٢٢. خدر عەبدولڕەحمان (سەوزە)

٢٣. کەمال عەلی

هەموو ئەمانەی سەرەوە لەڕێکەوتی ١٩٧٦/٧/١١ بە مادەی (١٧٥) فەقەرەی (٤٠٣)ی یاسای عێراقی دادگاییکران و حوکمدران.

(١٠) کەس ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەو (١٥) کادری سەرەکی و پێنج کەس لەسەر کۆمەڵە گیرابوون، دووانیان لەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا بوون و لەبەردەمی لێکۆڵینەوە خۆیانگرت و هەر بەبێلایەنی مانەوەو سێ کەسەکەیتریش هەر لەبنچینەدا سەر بەکۆمەڵە نەبوون، بۆیە هەروەها مانەوە لەبەرئەوەی هیچ بەڵگەیان لەسەر نەبوو پاش دادگاییکردن ئازادکران.

پاش بڕیاری دادگا پۆلیسەکانیان هاندا بمانبەنەوە خوارەوە بۆ هەمان ژێرزەمینی کە پێش دادگاییکردن لێی بووین، هێشتا بەشی زۆری هاوڕێکانمان لەنێوانی ژووری دادگاو پێپلیکانەکاندا بوون، جەعفەر عەبدولواحید شێرئاسا نەڕاندی وتی: "خۆیان عەسابەن، فاشیستن، پیاوکوژن، ئازادی زەوتکەرن، ئێستا سەروگوێی جارولڵا عەلاف و پاش تفکردنە سەروچاوی تێرتێر دەیشۆرمەوەو پاشان چی لەتوانایاندایە با دریغی نەکەن، سوور هەڵگەڕابوو دەموچاوی شەڕی لێدەباری، چاوە شینە جوانەکانی سامیان لێدەباری و سیمای بەتەواوەتی گۆڕابوو، چەند هەنگاوێک خۆی ڕاپسکاند بەرەو ژووری جارولڵا عەلاف بەنیازی ئەوەی چی لەدەستبێت بیکات و داخی دڵی خۆی پێبڕێژێت، بەڵام کاک عومەرو ئەنوەر زۆراب و خاڵە شەهاب پێشیان لێگرت و ڕێگایان پێنەدا کە بچێتە ژووری دادگاوە لەگەڵ خۆیان بەرەو پێپلیکانەکان هێنایان، کاتێک هەموو گەیشتینە ژێرزەمینەکە هەموو بڵاوەمان لێکردو ڕوومانکردە دیوارەکەو هەرکەسێک بەمانشێتێکی جیاجیا چەند وشەیەکی نووسیبوو بۆ مێژوو لەناویاندا ئەم چەند مانشێتە دەخوێندرایەوە:

١. (٣) پاڵەوانی مێژوو، (٣) کەڵەپیاوی هەڵکەوتووی گەلی کوردستان شەهاب شێخ نوری شێخ ساڵح و مامۆستای بلیمەت جەعفەر عەبدولواحیدو کرێکاری بازوو هەڵکردووی دلێر، ئەنوەر زۆراب بەتاوانی دڵسۆزی بۆ گەلی کوردستان ئالێرەدا بڕیاری مەرگیان تا مردن لەم کۆشکەدا بەسەردا سەپێنرا.

٢. ئەمرۆ (٢٣) کوردی تێکۆشەری هاوچەرخ دادگاییکران بەتاوانی بەشداری شۆڕشگێڕانەوە، خەباتی ڕەوای گەلی کوردستان و بڕیاری جۆراوجۆریان بەسەردا دایەن، ئەمرۆ جەلـلادە خوێنڕێژەکان بەنیازی کوژانەوەی چرای هیوای کوردستان، تاوانێکیتریان کردو خاڵە شەهاب و جەعفەر عەبدولواحید و ئەنوەر زۆرابیان بەمەرگ حوکمدا.

ئەم جارە نەمانتوانی وەکو سەرەتا نووسراوەکان بخوێنینەوە، چونکە مەترسی ئەوەمان هەبوو لەو برایانە دامانبڕن کە بڕیاری خنکاندیان بەسەردا دراوە، بۆیە پاش چەند وشەیەک نووسنین چوینە دەوری خاڵەو مامۆستا جەعفەرو ئەنوەر، داوامانکرد بێبەشمان نەکەن لەئامۆژگارییەکانیان و ئەوانیش وەکو ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت و لەسەرخۆ بەخەندەی دڵخۆشی و پەرۆشەوە بۆ دواڕۆژی کۆمەڵەو کوردستان قسەیان بۆ دەکردین و هانیان دەداین وابکەین خوێنی گەشی ئەوان کەڵکی لێوەربگرین بۆ باشتر هێنانە جۆش و خرۆشی بزووتنەوەی زیندوی ڕەوای گەلەکەمان و بەهێزکردنی ڕێکخستنی کۆمەڵە.

خاڵە شەهاب لەکونجێکدا دانیشتبوو لەسەرخۆ نانەبەرەیەکی لەسەر ئەژنۆکانی دانابوو بابۆڵەیەکی پڕکردبوو لەخەیارو تەماتەو وردەوردە نانی دەخوارد، هیچ بەوە نەدەچوو هەواڵی خنکاندنی خۆی بەرگوێ کەوتبێت.

ئەنوەر زۆراب و مامۆستا جەعفەر زۆر بەپەلە لەژوورەکەدا هاتوچۆیان دەکردو هەریەکەیان چەند هاوڕێیەکی لەملاو ئەولابوو قسەی بۆ دەکردن و ئامۆژگارییە بەنرخەکانی خۆیان دەبەخشی بۆ دواڕۆژی خەڵکی کوردستان و بۆ کۆمەڵە. هەندێک هاوڕێی زۆر هەست ناسک و بە بەزەیی سەریان لەسەر ئەژنۆیان دانابو و فرمێسکی نهێنیان بۆ خاڵەو هاوڕێکانی دەڕشت، بەڵام بەئاشکرا پێیانەوە دیاربوو دەلەرزن و دڵپەرێشانن، خاڵە شەهاب هەستی پێکردو بانگیکردین و وتی: "براینە ئێمە بەئارەزووی خۆمان ئەم ڕێگایەمان هەڵبژاردووە هەمووشمان چاک دەمانزانی ئەم ڕێگایە دووروودرێژو دژوارە، ڕاست و ڕەوایەتی خەباتی گەلەکەمان جۆرەها ئازارو زیندان و زامداری و ئاوارەیی و برسێتی و شەهیدبوونی تێدایەو

ئەوجاریـش بێباکانــە ڕێگامــان گرتوتەبەر لەهیچ کۆســپێکی ڕێگا چاومان نەترساوە."

خاڵە لەزاویەکەدا لەســەر چیچکان دانیشــتبوو بابۆڵەکەی بەدەستییەوە بوو لەسەرخۆ پاروی لێدەپچڕی و دەموچاوی هیچ شتێکی پێوە دیارنەبوو، خــۆ ئەوانــەی زۆر لەگــەڵ خاڵە ژیــاون دەیانبینــی ئەم مرۆڤــە کەڵەپیاوە لەئاخرین هەواڵی مەرگی خۆشــیدا بچووکترین گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، لەســەرخۆ وتی: "ئێوە ڕاســتییەکان فەرامۆش مەکەن ئێمــە (٣٣) کوردین ئەوا (٣)مان بڕیاری خنکاندن دراوین، هەشت ئازاد دەکرێت و (٢٢) زیندان دەبــن بــۆ ماوەی (٦) ســاڵ، بەڵام ئەوە چــاک بزانن زیندان و هەڕەشــەو گوڕەشەو خنکاندنی ئێمە نەک نابێتە هۆی ئەوەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلەکەمــان لەناوبچێت، بەڵکو خوێنی ئێمەو گرتنی ئێوە دەبێت بەبەنزین و دەکرێت بەســەر ئاگری خەباتی شۆڕشــگێڕانەی گەلەکەمــان و کۆمەڵەداو دوژمن دەســووتێنێت و کۆمەڵــەش بەلەناوچوونی ئێمەو شــەهیدکردنمان زۆر بەهێزتــر دەبێــت، جا مادام ئــەوە بزانین وەکو ڕاســتییەک بۆ دەبێت فرمێسک بۆ مەرگی خۆمان هەڵڕێژین؟"

وتی: "من بەشــبەحاڵی خۆم هیچ پەشــیمان نیم لەوەی کە پێیهەڵساوم، بەڵکــو زۆر بەڕاســت و ڕەوای دەزانــم و داواشــدەکەم ئێــوەش لەجیاتی فرمێســک هەڵڕشــتن بــۆ ئێمــە هەوڵبــدەن لەمــەولا کەڵــک لەڕابــوردوو وەربگــرن و هــاوکاری هاوڕێکانــی کۆمەڵــە بکــەن بــۆ ئــەوەی بتوانــن ڕێکخســتنەکەمان بەهێزتر بکەن تا گەلەکەمان و نیشــتمانەکەمان لەدەست سیاســەتی بەزۆر بەعەرەبکردن و بەبەعســیکردن و بــەزۆر کۆچ پێکردن لەکوردستانەوە بۆ عەرەبستان ڕزگاربکەن، ئێوە پێویستە بەهیمەتبن و بژین ژینێکــی کەم، بەڵام بەکەڵی بژیــن واتا کەم بژین، بەڵام کەڵ بژین، کە ئەوە خۆی لەخۆیدا دەبێت بەهۆی خزمەتکردن و ڕزگارکردنی گەلەکەمان."

وتــی: "ئێمە بەخەڵک و بەهاوڕێکانی خۆمان دەوت پێویســتە خۆگربن، ئــازاو چاونەترســبن، ژیانــی خۆتــان بکــەن بەقوربانی خەڵکــی و ئەی بۆ ئــەوە بــۆ خەڵکی و هاوڕێکانی خــوار خۆمان ڕەوابێــت، بۆچی بۆ خۆمان وانەبێت؟ بۆیە من شــانازی دەکەم خوێنی ئێمەو گرتنی ئێوە ببێت بەهۆی گەورەبوونی کۆمەڵەو کۆمەڵە بتوانێت میللەت لەم ڕۆژەڕەشە ڕزگاربکات". خاڵــە هەموومانی گەرمکردەوە وەهای لێکردین فرمێســەکەکانمان وشــک بــکات و ورەمان زۆر بەرزبێتەوەو بڕیاری خنکاندنی ئەوانمان لەبیربچێت، کاک ئەنــوەرو مامۆســتا جەعفەریــش بەخەنــدەوەو بەئامــۆژگاری بەهێــزەوە کــە بــۆ زۆربــەی هاوڕێکانمانیــان کردبــو و خێــرا خێــرا

دەهاتن و دەچوون هیچ بەوە نەدەچوو زیندان بین و بەتەمای ئەوەبین پۆلیس ڕاپێچمان بکات، هەر لەو ڕۆژەشەوە وشەی (کەم بژی و کەڵ بژی) بوو بەدروشمی هاوڕێکانمان و تێکڕای ڕۆڵەکانی گەلەکەمان.

پۆلیسەکان هاتن (٣) کەلەپچەیان بەدەستەوەبوو خاڵەو مامۆستا و کاک ئەنوەریان کەلەپچە کردو خستیاننە ئۆتۆمۆبێلێکی جیاوە، (٨) برادەریش ئازادبوون، (٢٢) کەسیش بەدوو ئۆتۆمۆبێل بەرەو گرتووخانەی (ئەبوغرێب) لەکاتژمێری یەکی شەوداو لەدەرگایەکیتری دادگاوە بردیانین.

لەکاتێکدا گەیشتین بە (ئەبو غرێب) خاڵە و جەعفەر و ئەنوەریش لەگەڵ ئێمە دابەزین، بەڵام لەساڵۆنێکی زۆر درێژی زیندانەکە هەردوو لامانیان ڕاگرت تا بڕیاریان وەرگرت چیمان لێبکەن، پاشان خاڵە و ئەنوەر و جەعفەریان بەرەو ژوورەکانی خنکاندن برد، ئێمەش بەپێچەوانەی ڕۆیشتنی ئەوان بۆ شوێنێکی چاوەڕوانی دابەشکردن براین، خاڵە و ئەنوەر و جەعفەر ڕێگاکەیان نەدەبڕی و هەر ئاوڕی ئاخرین دیداریان دەدایەوە لەئێمەو هەردوو دەستیان بەزنجیرەوە هەڵدەبڕی بۆمان، ئێمەش تێکڕا ڕوومان تێکردن و تا لەچاومان ونبوون دەستمان هەڵبڕی و بەچاو و دەم و دەست و هۆشەوە لەگەڵیان ڕێمان دەکرد، پۆلیس لەنێوانی هەردوو لامانەوە زۆریان هەوڵدا سۆزی نێوانمان بپچڕێنن، بەڵام نەیانتوانی تا ئەوان گەیشتنە ژوورەکانی چاوەڕوانی جێبەجێکردنی بڕیاری خنکاندن و ئێمەش براینە ژووری چاوەڕوانی دابەشکردن.

## دوای بڕیاری دادگای بەناو (شۆڕشی عێراقی)

دوابەدوای ئەوەی خالەو جەعفەرو ئەنوەریان لێدابڕین، ئێمەیان برد بۆ شوێنی دابەشکردن (استقبال)، ئەو شەوە ئێمەیان بردە ئیستقبال هەست نەدەکرا لەپۆلیس و ئێمە بەولاوە کەسی تری تێدابێت، بەڵام هەر کە ڕۆژ بۆوە وەکو شارەمێروولە جمەی دەهات.

بەیانی زوو خەڵکی زیندانی دەهاتن بۆ سەیرکردنمان و دەنگ بڵاوبۆوە بە هەموو زیندانی گەورە (ثقیلة)دا لە هەموو بەشەکانی (م.ق)ەوە خەڵک هاتن بۆ پێشوازی و کەوتنە کۆششی ئەوەی بمانبەنە بەشەکەی خۆیان، بەڵام ئیدارەی زیندان گوێی بەداوای کەس نەداو کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە دابەشیان کردین بەسەر (م.ق)دا سەرەتا شارەزاییمان نەبوو لەچۆنێتی هەڵسوکەوتی زیندان واماندەزانی ئەوەی حوکمدرا پاشان لەزینداندا ئازاد دەبێت لەهەڵسوکەوت، بەڵام وردەوردە بەیاساکانی هەڵسوکەوتی زیندان شارەزابووین، ئێمە بەر (م/۳) کەوتبووین واتە من و عەبدوڵڵا عەلی ڕەشیدی هونەرمەندو عوسمان ئەحمەد نەسروڵڵای نانەوا، سەرەتا هەندێک خەڵک کە لەدەرەوە ناویانم بیستبوو خۆیان زۆر لێم هێنایە پێشەوە بەناوی دۆستایەتی و هاوکاریکردن ئێمەش ڕاهاتبووین لەسەر ئەوەی لەسێبەری خۆشمان وشیاربین، چونکە حسابمان بۆ ماوەی پاش هەرەس و زوڵم و زۆری ڕژێم دەکرد ناوبەناویش هەندێک لەو خەڵکانەی خۆیان بەدۆستمان دەزانی و نەیاندەوێرا لێمان بێنە پێشەوە لەفرسەتەکاندا ئاگاداریان دەکردین لەهەندێک خەڵک خۆمان بپارێزین.

زیندانی قورس و سووکی ئەبوغرێب زۆر لەیەکتری جیاوازو دووربوون، جیاوازی ئەوەیە (خفیفە) لە (٥) ساڵ کەمتری تێدا زیندانی دەکرێت و ئەرکی ئیشکردنیان نییەو جۆرەها زیندانی تێدا کۆدەبێتەوە، (ثقیلة) گوایە تەنیا بۆ زیندانی لە (٥) ساڵ و مانگ بەرەو ژوورەو دەبێت زیاتر خەڵکی سیاسی تێدادەبێت، بەڵام وەها نەبوو دزو درۆزن و ڕەشوەخۆرو جۆرەها زیندانی تێدابوو، بەڕاستی کۆمەڵگایەکە نەک یاسای قوتابخانەی لێ بێبەشە، بەڵکو کۆمەڵگایەکی خراپکارانەیە و مرۆڤ لەوێدا دووچاری جۆرەها نەخۆشی و موشکیلە دەبێت.

ئەم زیندانە پێکهاتبوو لەڕیزە خانوویەکی زۆر کە لەڕەقەمی (م.ق) دەستی پێدەکرد شوێنێکی یەکجار گەورە و دوو قاتبوو هەیوانێکی یەکجار درێژ هەردوو بەری (م.ق)ەکانی بەیەکەوە بەستبۆوە و لەناویدا شوێنی چاوەڕوانی و (مەحجەر) چێشتخانەو شوێنی کارگەو قوتابخانەو شوێنی

دەوراتی تێدابوو، ساحەی گەورەی تێدابوو، هەموو (ق) یان (م)ێک حەوشێکی خۆی هەبوو، کە زۆربەی کات دەرگای لەسەر پشتبوو بۆ زیندانی، لە هەر بەشێکدا تەلەفزیۆن هەبوو بەشەکان سەرژمێری زیندانی تێدادەکران.

مــاوەی چەنــد مانگێک ئێمەیــان لەزیندانــی (الثقیلة)دا هێشــتەوە ڕۆژانە دەرۆیشــتین بــۆ نەخۆشــخانە بۆئــەوەی هاوڕێکانــی ژووری ئیعــدام کــە هێنــدران بــۆ نەخۆشــخانە بیــان بینیــن، زۆرجــار ڕێدەکــەوت چاومــان پێیاندەکەوت و کاتێک دەگەیشتینە یەکتری خێرا ڕوو ماندەکردە یەکتری و قسەمان دەکــرد بــۆ ئــەوەی خاڵــە و هاوڕێکانــی تێمان بگــەن، چونکە پۆلیســەکان نەیاندەهێشت کەس قسەیان لەگەڵدا بکات، وەها نەبوایە سوودمان لەیەکتری نەدەبینی هەر لەبەر خۆمانەوە قســەمان بۆ دەکردن و پاش هەواڵ پرســین داوامــان لێدەکــردن ڕۆژانە ئەگەر کــرا یەکێکیان بێت بۆ نەخۆشــخانە هەر چاکــە بۆئــەوەی ئاگاداری وەزعیان بین بەڕاســتی ڕۆژگارێکــی زۆر تاڵ و ناخۆش بوو، خۆشەویســترین هاوڕێ و برامان لێدابڕابوو و نەماندەزانی دوارۆژیــان چی بەســەردێت، جارجــار لەنێــوان خۆمان قســەماندەکردو دڵمان بەوە خۆشــدەکرد، خاڵە شــەهاب پیاوێکی تێکۆشــەرو شۆڕشگێڕی ناســراوە، لــەلای ڕێکخراوەکانی فەلەســتینی و ڕەنگە هەڵوێســتی ڕاســت بگــرن و داوا لەڕژێمــی عێراق بکــەن بۆ ئازادکردنیان، ســەرەڕای ئەوەش دڵمان بەمام جەلال و برایانی دەرەوە خۆشبوو کە هەرایەکی گەورەیان بۆ دروســتبکەن و ببێت بەهۆی ئازادکردنی برادەرەکانمان لەژووری خنکاندن، هەرلەو کاتانەشــدا خزمان و برادەرانی ڕێکخراوی کەرکوک و ســلێمانی و هەولێر خەریکی دۆزینەوەی خەڵکی نزیکی ڕژێم بوون کە هەوڵی ڕزگارکردنی بــرادەران بدەن لەژووری خنکاندن، پێشــووتریش بۆ ڕۆژی دادگاییکردنمان پارەیەکی زۆر لەلایەن خزمانەوە سەرفکراو (٣) پارێزەریان بۆ گرتین، بەڵام بەداخەوە نەیانتوانی ئەو (٣) هاوڕێیەمان ڕزگاربکەن.

ماوەیەکیــش ڕەفیــق پشــدەری هاتوچــۆی نێوانــی خاڵــە و جەعفەر و ئەنوەر و کۆشکی کۆماری کرد داوای کۆشکی کۆماری ئەوەبوو خاڵــە و هاوڕێکان نووســراوی پاشــگەزبوونەوە و داوای بــوردن بکەن ئەوسا حوکمەکەیان دادەبەزێنن، خاڵەش هەرچەندە پیاوێکی زۆر بەئەدەب بوو قەت قســەی ناشــیرینی لەدەم دەرنەدەهات، بەڵام ئەوان لەو داوایەی کۆشــکی کۆماری توڕەبووبــوون و بەڕەفیق پشــدەرییان وتبوو: "لەمەولا هاموشۆمان نەکەیت و ئێمە نەک هەڵەنین، بەڵکو دەبێت ڕژێم داوای بووردن لەئێمەو گەلەکەمان بکات."

بەهۆی چاودێری سیخوڕەکانەوە چیتر خاڵە و هاوڕێکانیان نەهێنان بۆ نەخۆشخانە، بەڵکو دکتۆریان دەبرد هەر لەشوێنەکانی خۆیان بیانبینین.

پاشـــان لە (ثقیلة)ەوە گوێزامانیانەوە بۆ زیندانی (الاحکام الخاصة) هەر لە ئەبوغرێب، بەحیســـاب ئـــەوێ تەنیا خەڵکی ڕامیاری تێدایە شانبەشـــانی ســـیخوڕی نێودەوڵەتانیش، وەزعمان زۆر چاکتربوو لەچاو زیندانی (ثقیلة). بەشـــەکانی چنین، حەیزەران، ئاسنگەری، دارتاشـــی، قوتابخانەی سانەوی بەشی قەلآچۆکردنی نەخوێندەواری تێدابوو.

لەم زیندانەدا ڕۆژانە جەریدەی بەناو (الثورة)ی شۆڕشـــی ڕژێم بەزۆر دەبـــوو هـــەر ڕۆژە یەکێـــک لەخوێندەوارەکانی ناو زینـــدان بیخوێنێتەوە و شەرحی بکات بۆ زیندانییەکان.

چاودێری توند لەســـەر زیندانی هەبوو دوو دوو ســـێ ســـێ بەیەکەوە ڕاوەســـتان و دانیشـــتن قســـەکردن قەدەغەبـــوو زۆرجـــار دووچـــاری دەردەســـەرییەکی زۆریان دەکردین، ئەمنـــەکان زۆر دڕندەو چڵێس بوون، سەرســـەری و داوێنپیـــس بـــوون، هەندێک خەڵکـــی دەروون نزم بووبوون بەداردەســـتی ئەمنەکان و لەناوماندا جاسوسییان بۆ ئیدارە دەکرد، ئەویش دەبـــوو بەهـــۆی ئـــەوەی زۆرجار زیندانی خـــاوەن بیروباوەڕو هەڵوێســـت دووچاری ئازاردان و لێکۆڵینەوەی نوێ ببێت و ناوبەناویش ببرێتە زیندانی (المحجـــر) و دووچـــاری زیانێکی ناخۆش و هەڕەشـــەو گوڕەشـــەی ئەمن ببێت.

کێشـــەکانی زینـــدان زۆرن، چونکە لەکاتی خۆیدا بـــۆم تۆمار نەکراوەو ماوەیەکـــی زۆر بەســـەریدا ڕۆیشـــتووە، بۆیـــە هەندێکی کەمـــم لەیاد ماون دەیخەمـــە بەرچاوی خوێنەرانـــی بەڕێز تا بتوانێت کەڵکـــی خۆی بگەیەنێت بەکۆمەڵگای کوردستان.

ئێمـــە وەهامان بەرگـــوێ کەوتبوو کە زیندان قوتابخانەیەو مامۆســـتای نەمـــر قانع باســـی ئـــەوە دەکات "کونجی زیندان قوتابی خانەیە" بەڕاســـتی ئەو ســـەردەمەی ئێمە زیندانمان بینی نەک هەر قوتابخانە نەبوو، بەڵکو ئەو ڕووداوانەی لەزینداندا ڕوودەدەن لەدەرەوە کەمتر ڕوودەدەن. پاشـــان ئەو ڕژێمانەی لەم بابەتەن نەک نایانەوێت مرۆڤ ڕاستبکەنەوە، بەڵکو هەمیشە خەریکـــی ئـــەوەن لەبەرژوەندی خۆیان مـــرۆڤ بەکاربهێنن کـــە لەزینداندا بەرژەوەندی ئەوان ئەوەیە زیندانی سەرسەری بێت، هەتیوباز بێت، درۆزن بێت، ڕەوشـــت نـــزم بێت، جا کەم و زۆر دژی ئەوەن خەڵکی شەخســـیەتی

هەبێت پیاوچاک و ڕاستگۆ و دۆست بەخەڵک بێت، بۆیە ئیدارەی زیندان لەڕێی هەندێک خەڵکی لاواز دەروونەوە خەریکی خراپەکاری و فێرکردنی ڕەوشت نزمی دەبن و سزای هەرکەسێک دەدەن خاوەنی هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەو ڕێزبێت لای خەڵکی.

سەرەتای چوونە (ثقیلة)مان بوو، کوڕێک ناوی عەبدوڵڵا قەشانی بوو لەکاتی خۆی پێشمەرگە بوو لەلای عەلی عەسکەری و دەیزانی منیش خەڵکی گوندی عەسکەرم، هاتە لام زۆر ڕێزی لێگرتم و داوایکرد کە ژەمێکی خواردن لەلای ئەوان بخۆین بەبۆنەی هاتنمانەوە بۆ ئەم زیندانە هەر لەوێ دانیشتبووین لاوێکی باڵابەرز کە تەمەنی لە دەوری (٣٠) ساڵدا دەبوو ڕەنگ زەرد سەریشۆڕ کردبو و هەنگاوەکانی دەنا، عەبدوڵڵا پەنجەیەکی لە ڕانم دا وتی: «سەیربکە ئەم زیندانییە ببینە دوایی قسەت بۆ دەکەم ڕوانیم دیمەنێکی زۆر دڵتەزێنی هەبوو لەجیاتی ئەوەی لەدانیشگادابێت خەریکی دیراسەی بابەتی نوێی بەسوودبێت بۆ گەشەی کۆمەڵگا، کەچی سەری خستبووە بەرخۆی و هەنگاوەکانی دەپێوا لەشوێنێکدا ڕێڕەوەکە (٥٠) سانتیمەتر دەبێت ئەملای دیواری دووەم قاتی کۆشکەکە بوو ئەولاشی دیوارەکانی سەرەوەبوو هەرچی ڕوانیم سەری هەڵنەبڕی و نەمتوانی جوان سەروچاوی ببینم.

عەبدوڵڵا هەندێک قسەوباسی خۆیانی بۆ گێڕامەوە منیش نەمدەویست پەلەبکەم لە پرسیارەکانم، بۆیە هەندێک بەڕووی خۆشەوە باسی خۆمم بۆ گێڕایەوە لەسەر زیندان.

ئەو (م)ەی ئێمەی تێیدابووین چەند ژوورێک لەخوارەوەو چەند ژوورێک لە سەرەوە بوو... ئەوەی زۆر کۆن و بەدەسەڵات یان سەر بەئیدارەی زیندان نەبوایە ژووری دەست نەدەکەوت و خەڵکەکەیتر لەڕێڕەوەکاندا ئەمبەرو ئەوبەر قەرەوێڵەی دادەناو هەر بەدوو کەس قەنینەیەک گازیان دادەنا بۆ چاو چێشت لێنان، من و عەبدوڵڵا و عوسمان بەیەکەوە نان و چێشتمان دەکرد زۆر ڕێک و تەباو برابووین، لەبەرئەوە ئەو زیندانیانەی وزەی شۆڕشگێڕێتییان تێدا مابوو ناوبەناو و تاکە تاکە لایان دەدایە لامان، هەرکەسە لەشتێکی زیندان ئاگاداری دەکردین، عەبەش فانۆسێکی سحری دروستکردبوو بۆ گەورەکردنی وێنەکێشان، ئەویش وەهایکرد زیندانییەکان بەبیانووی وێنەڕاکێشانەوە بوێرن بێنە لامان و بووبووین بەجێگای ڕاز و نیازی هەندێک خەڵکی زیندانی.

شــەوان خەڵکــی لەســـەر ئـەو قەرەویڵانـــەی دەوری تەلەفزیۆنەکـە کۆدەبوونـــەوە هەندێــک بە زەنگیانــە چنینەوە خەریک دەبــوون و هەندێک گرەویان لەسەر تیپی تۆپی پێ دەکرد لەسەر پارەیەکی زۆر دەبوون بەدوو بەشـــەوە، بەشێکی دەســـتەیەکیان هەڵدەبژاردو بەشەکەیتریش دەستەیەک، شـێری هەرکامیان بـراوە بوایە، ئەوە ئـەوەی هەڵیبــژاردووە دەیبردەوە، بەرنامەی قومارێکی خراپ دەســـازاو بە بەردەوامی ئەم قومارە هەر ڕۆژە بەناوی شتێکەوە و لەسەر شتێک هەندێک دەیبردەوەو هەندێکیش ماڵی کاول دەبوو، هەندێکجار لەشـــەواندا کارەبا دەکوژایەوە، هەندێک لەسەرسەری و قوماربـــازەکان تەماتەی ڕزیــوی زۆریان هەڵدەدا بۆ ســـەرجێگاوبانی ئەو خەڵکــە هەژارانەی لەســـەر جێگاکانی خۆیان نەدەجـــەولان، دەبوو بەهەراو جوێنــدان و کاتێــک چراش ڕۆشـــن دەبۆوە هەرکەســێک لەشــوێنی خۆی دادەنیشتەوە وەکو ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت.

ناو بەناویش سیخوڕەکان خەبەریان لەهەندێک زیندانی دەدا کە سەریان بەیەکەوە ناوە، خێرا ئەمن دەهاتن و دەیانبردن پاش هەڕەشەوگوڕەشـــە و لێدان و محجرکردنێکی زۆر دەیانهێنانەوەو خەڵکی زیندانیان وەها چاوشکێن دەکرد کە کەسێک نەوێرێت زۆر سەردانی کەسێکیتر بکات.

لەزیندانـــدا وردەوردە پیــاوە ڕامیارییە جیاجیــاکان هەندێک ئاڵوگۆڕی بیروباوەڕمـــان دەکــرد خـــۆ بەتایبـــەت لەســـەر پارێزگاریکردن لەدەســت پیاوەکانی ڕژێم یەکێک لەو برایانە پیاوێکی عەرەبی بەســراوی بوو ســـەر بەپارتی کۆمۆنیستی عێراق (ق.م)، لەزۆر ڕووەوە قسەمان دەکرد، ڕۆژێکیان باســێکی بــۆ گێڕاینەوە لەســـەر کوڕێکی زیندانــی کە تا ئـــەو ڕۆژەی ئەو نەهاتبووە لام نەمدەزانی ئاوا ئێمە هەرسێکمان و عەلی بەسرەیی بەلایەکیتر دەســـتێکی بــۆ زیندانییەک درێژ کــرد کە مەترێک باڵای دەبوو هەشـــت نۆ زیندانی باڵا بەرزی کەتەی بازۆڵە قەوی لەم لاولایەوە دەڕۆیشتن و ئەویش پــۆزی لێــدەدا دیمەنێکی زۆر نەگونجــاو بوو، ئەو بســـتەبالایە، ئەو مرۆڤە کەتانــە پارێـــزگاری لێدەکەن و ماســـتاوی لەبەردەمدا دەکـــەن، عەلی وتی: "ئەم باڵابســـتەیە دەبینن ناوی نەجاحە ماوەیەک زیندانیکراوە لەزیندانیشدا لاســـایی ســـەدام دەکاتەوە کاتێک لەڕێڕەوەکاندا تێدەپەڕێت ئـــەو زیندانییە ســمێڵ گەورە گەورانە ئـــەم لاو ئەولای دەگرن و ئیـــدارەی زیندان ڕێگای (ق.م)ە کانیــان لێناگرێت بۆ کوێ بیانەوێــت دەڕۆن، تەنیا ڕێگای دەرەوەی زیندانیان پێنادەن".

ئـــەم نەجاحە لەدەرەوە پیشـــەی دزیکـــردن و دوکان برین بوو، ڕۆژێک لەگـــەڵ ئەمانەی لەدەوریـــن دەڕۆن بۆ دوکانی ئاڵتونفرۆشـــی و جانتایەک

دەبەن کە ئەم نەجاحەی لەناودا دەبێت و قوفڵی دوکانەکە دەگۆڕن بەهەمان جۆر قەوارەو کلیلەکان دەخەنە گیرفانیان و قوفڵەکەی دوکاندارەکەش لەگەڵ خۆیـان دەبـەن و بەخاوەنـی دوکان دەڵێن با جانتاکەمـان لێرەبێت ئەگەر شـەو فریانەکەوتین سـبەی بۆی دێین و هەندێک ئاڵتونیشـی بۆ ڕێ ونی لێدەکـرن و دەیخەنە ناو جانتاکەوە، شـەو تـا دوکاندارەکە دوکان دادەخا، ئـەوان ناڕۆن بەلای نەجـاح و جانتاکەوە هەتا کابـرای دوکاندار دەڕوات، پـاش دوکان داخسـتن نەجـاح لەجانتـا دێتـە دەرەوەو هەرچـی ئاڵتـون هەیـە کۆیدەکاتـەوەو لەکاتـی دیاریکـراودا برادەرەکانـی دەڕۆنـە لای و نەجـاح و جانتـای ئاڵتون دەبـەن، دوکاندار کاتێک بەیانـی دەگەڕێتەوە بۆ دوکان دەڕوانێـت هیچی تێدا نەمـاوەو جانتاکەش نەماوە، خەبەر بەپۆلیس دەدات و دەستنیشانی برادەرەکانی نەجاح دەکات و پاش ماوەیەک گیراون ئەمانە دنیایان بەو شێوەیە تالانکردووە.

ئەم نەجاحـە لەڕۆژانی هاتنی خەڵکی بۆ دیدەنی زیندانییەکان و لەکاتی گەڕانەوەیانـدا دەخرایە مجەرەوە هەتا سـەرژمێری تەواو دەبوو خەڵکی دەگەڕانەوە، چونکە ئەوەندە بچکۆلە بوو دەتواندرا ژنێک وەکو منداڵی خۆی دەستی بگرێت و لەگەڵ خۆی بیباتە دەرەوە.

## سەرژمێری (مەستار)

یەکێـک لەو کارانەی ئیدارەی زیندان پێیهەڵدەسـتا لەڕۆژێکدا چەندجار سـەرژمێری (مەسـتار)ی زیندان دەکەن، بەیانیان لەخەوی شـیرین ڕایان دەپەڕاندین بەشـێوەیەکی زۆر ناشـیرین بە دار دەیاندا لەدەرگاو تەنەکەو دوو سـێ پۆلیـس قەرەوێڵـە بەقەرەوێڵـە دەگـەڕان و بەتانیـان لەسـەر لادەداین، ئەگەر زیندانییەک نەخۆش بوایە دەبوو لەژوورەکە بێتە دەرەوەو ئامادەی سـەرژمێری ببێـت، هەمووماندیان بەچیچکانەوە دادەنیشـاند، پێنج پێنـج لەم سـەر بۆ ئەو سـەر بەدارێکـەوە دەگـەڕان و دەیـان ژماردین، جارجار بۆ ئیهانەکردن دارێکی بەسـەری یەکێکـدا دەدا، ڕۆژێکیان لەکاتی هاتنی کەسـوکاردابوو کاتێک مەستار دواخراو خەڵکەکەی هاتبوون هەموو برانە سالۆنی ئیستقبال لامان سەیر بوو نەماندەزانی چی ڕوویداوە زۆری نەخایانـد قەرەباڵغیەکـی زۆر لەبەردەمـی (ق.م)کان کۆبوونـەوە، دیمـان ژنێک بەدەموچاوی سـورکراوە (مکیاج) و لەبـەر دەرگاکان هەڵدەپەڕێندرا بـەرەو لای ئێمـەش هێنایان بانگیانکردینە پێشـەوە بۆیان باسـکردین ئەو بەندیە تاوانبارە ویسـتویەتی ڕابکات بە بەرگی ژنانەوە سـیخوڕەکانی ناو زینـدان ئەمنیـان ئاگادارکردبـۆوە و لەبـەر دەرگای دەربازبوونی دەرەوە گیرابوویانەوەو دەموچاویان بەرەشیی مەنجەڵ ڕەشکردبوو لەبەر دەرگای هەموو بەشێکدا هەڵیاندەپەڕاند، پاشگێڕان و ئیهانەکردنێکی زۆر بردیان بۆ مەحجەرو ئەوسا خەڵکەکەیان ئازادکردو سەرژمێری ئێمەشیان کرد.

## سیاسەت ئامانی نییە

کاکـە حەمـەی میـرزا سـەعید یەکێـک بـوو لەهاوڕێکانـی کۆمیتـەی سـەرکردایەتی کۆمەڵـە، پیاوێکـی بەتەمـەن بـوو ئەندامـی کۆنـی پارتی کۆمۆنیسـتی عێراقیش بوو، پاش دامەزراندنـی کۆمەڵە بووبوو بەکۆمەڵەو کاتی خۆشـی پیاوێکی ئەندازیار بوو زۆر خۆردەو بە قسـەبوو، لەکاتێکدا ئێمە بەرەو ئێران ڕۆیشـتین ئەو لەناوەڕاستی عێراق کاریدەکردو ماوەیەک بـوو ئیشـوکاری کۆمەڵـەی لێوەرگیرابـۆوە، کاتێـک ئەنـوەر زۆراب و سـەلام محەمـەد بـرزۆ و بلەبیخ و ڕێکخـراوی بەغدا دووچاری شکسـت دەبێـت و دەگیرێـن، کاکـە حەمەش لێـی دەربازنابێـت و دەگیرێت، کاتێک دەبرێتە ئەمنی عام لەگەڵ عەلی حەمە مرادو ئاسۆی شێخ نوریدا خۆیان بە بەرپرسیاری ڕێکخستنەوەی هاوڕێکان دەزانن بەتایبەت کاکە حەمە لەسەر نەگەیشـتنەیەکی هەندێک بیروڕای چۆنێتی خـۆ دەربازکردن لەداوی ئەمن ناخۆشـییان دەبێت، کاکە حەمە ویسـتی لەڕێگای مسـاوەمەیەکی کاتییەوە قسـە لەگـەڵ ڕژێم بکات و ئاسـۆ و عەلـی حەمە مرادو جەبـار فەرمان و ئەنوەر حەسـەن و هاوڕێکانی دەوروبەری لێیان دەبێت بەناخۆشی، ئەوان بەوە ڕازی نابن هیچ قسە لەگەڵ دەوڵەت بکرێت، کاکە حەمەش خۆی بەوە دەزانێت لەهەموویـان تەجروبەی زۆرترەو دەیەوێـت پلانی دەربازبوونی دابنێـت، بەخەیاڵی خۆی خاڵە و هاوڕێکانی دەربازبوون و لەوڵات نەماون، ئەو خۆی بەوە زانی بوو لەسـەر دواڕۆژی کۆمەڵە لەزینداندا قسـە بکات دووچـاری هەڵەیەکی گەورەی کردبوو، بەڵام کەسـی لەگەڵ نەبوو کاتێک ئێمـەش گەڕاینەوە لەئێرانـەوە برایان ئەو قسـەیەیان گێڕایەوە هەموومان سـەرکۆنەمان کرد، بەڵام بارودۆخی زیندان ئەوە بوو ئەو بەوشـیارییەوە ڕەخنـەی لێبگریـن ئەویـش زانیتـی هەڵـەی کـردووە لەپێنـاوی ڕزگاری هاوڕێکاندا هەرچەندە ئەگەر کاکە حەمە خراپەی بوایە دەیتوانی ئەو هەموو سـەربەرزی و ئازایەتییـەی ئێمە بگۆڕێت بەجۆرێکیتر، چونکە شـارەزایی لەسـەر هەموو ڕێکخستن هەبوو، بەڵام تا ئەوکاتەی لەزیندان ئازاد بووین، هیچ کەموکورتییەکی نەبوو، وەکو ئەندامی شـانەیەک گوێگری بڕیارەکانی کۆمەڵە بوو.

ڕۆژێکیان لەبەشـی خەیاتی زیندان کارمدەکـرد، کاکە عەبە بەهەڵەداوان هـات ئاگاداریکردم کە بـاری دەروونی کاکە حەمە زۆر خراپەو لەفەرەیدون دڵگرانە وتوویەتی با عەلی بێت هەندێک قسەی بۆ بکەم ئەگەر سنوورێک بۆ قسـەکردن دانەنرێت لەسەرم، منیش هەڵوێسـت وەردەگرم و قسە دەکەم، کاتێک چووم فرمێسـک لەسـەر گۆپە خڕە سـوور هەڵگەڕاوەکانیدا دەهاتە

خوارێ وتی: "بەڕیشــی ئێوە ڕەوایە پاش ئەم هەموو ماندویەتی و خەباتە پێم بووترێ.....؟"

زۆر بەشەرمەزارییەوە دەستمکردە ملی و دڵنیامکرد قسەی پێنەوتراوەو هەرکەســێک قسەشــی پێبڵێت ڕێگای پێنادەین، هەرچــی چۆنێک بوو کاکە حەمەم دڵنیاکردو کەمێک ئارامم کردەوەو خێرا گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم، ئێــوارە کاک فەرەیدونــم بینی هەندێــک گلەیم لێکرد لەســەر ئەوەی لەلای هاوڕێیەکیتر گازندەی لەکاکە حەمە کردووە، کاکە حەمەی خاوەنی زیاتر لە (٣٠) ساڵ خەباتی ژێرزەمینی، لەئەنجامدا بەدەستی بەتاڵ کۆڕی سیاسەتی بەجێهێشــت، بێ پاداشــتێک ئەو هەموو قوربانی و دڵســۆزیەی نواندبووی لەبەر هەڵەیەکی بچووک کە قابیلی چارەسەرکردن بوو، نایشارمەوە ئەگەر کاکە حەمە خراپەی بکردایە ئێمە ئەوها بەسەربەرزی نەدەماینەوە.

## هەواڵی گەیشتنی برایانی ڕێکخراوی ڕەنجدەران بۆ زیندان

کاتی ئێوارە بوو هەواڵێک خۆیکرد بەمیمەکانداو وایرادەگەیاند ژمارەیەکی زۆر خەڵکی مارکسی هێنراون و لە (استقبال)ن ئەو هەواڵە تێکرای هاوڕێکانی ئێمەی ورووژاند لەهەموو قاف و میمەکانەوە قوتەقوت دەستی پێکرد، هەندێک برادەرمان توانیان خۆیان بگەیەننە ئیستقبال پێیانڕاگەیاندبوون وشیاری خۆیان بن، چونکە لەزینداندا خەڵکی بودەڵە زۆرە کە لەگەڵ ئیدارەی زیندان ڕێککەوتوون لەسەر لاشەی خەڵکی شۆڕشگێڕ خراپەکاری بکەن هەر بۆئەوەی ڕێگای هاتوچۆی قاف و میمەکانیان پێبدرێت.

ئێمە لەهەموو بەشەکاندا هاوڕێمان هەبوو بەهۆی وشیاری و ئازایەتییانەوە لەزیندانەکەدا دەستپێشکەری کاری چاکەو خزمەتگوزاری وشیارکردنەوەو تەگبیرو ڕای زیندانیان بوون، هەر بۆیە بەپیر ئەم هەواڵەوەشەوە خێرا ڕۆیشتن و ئامۆژگاری پێویستی برادەرەکانیان کردبوو، زۆری نەخایاند هەواڵەکەیان بۆ هێنایەوە کە چەندن و چی ڕوویداوە.

وتیان ئەم برایانە سەر بەڕێکخراوی ڕەنجدەرانن، تازە لەکۆمەڵە جیابوونەتەوەو دەیانویست ببنە ڕێکخراوێکی سەربەخۆ، کۆمەڵێک لاوی وشیارو دڵسۆزی چاکن، بەڵام لێپرسراوی دووەمی ڕێکخراوەکەیان (.....) گیراوەو هیچ خۆی بەلێدان نەداوەو هەرچی بەڵگەی ڕێکخراوەکەو ناوی هاوڕێکانی خۆیان و ناوی هەندێک کەسی سەر بەڕێکخراو و پارتەکانیتریشی داوە بەدەستەوەو بووە بەهۆی ئەوەی هەموو ڕێکخراوەکە بگیرێن، کە بریتیبوون لە (٦٠) ئەندام و کۆمەڵێک کوڕی ئازاو دڵسۆزو چالاک، کە هی ئەوە نەبوون ئاوا بەناهەق و بەئاسانی بدرێنە دەست دوژمن و چۆکیان پێدابدرێت، ئەگەرچی لەم ڕێکخراوەدا پیاوی ئازای وەک وەستا ئەنوەری هەڵەبجەیی تێدا بوو کە نموونەی خۆڕاگری و ئازایەتی و دڵسۆزی بوو.

## دەربارەی هەندێک لێکۆڵینەوەی ڕێکخراوی (ڕەنجدەران)

## عوسمان حەمە کەریم بۆی گێڕامەوە:

عوسمان ئەندامی ڕێکخراوی ڕەنجدەران بوو پاش دادگاییکردن هێنایانن بۆ (م٣) بۆ لای ئێمەو بوو بەهاوڕێی سەر نانخواردنمان (سەفەرداش)، بۆی گێڕامەوە وتی: "لەکاتێکدا ئێمەیان برد بۆ هەیئەی کەرکوک بۆماندەرکەوت خەتێک جیابۆتەوە لەکۆمەڵە بەناوی (ڕەنجدەران) بەئەندام و سەرکردایەتییەوە هەموو گیراوین یەکێک لەهاوڕێکانمان ناوی وەستا ئەنوەر خەڵکی شاری هەڵەبجە بوو بانگیانکرد بۆ لێکۆڵینەوە زۆریان ئازاردا هاوڕێ جێگری سکرتێرەکەیان هێنا بووە بەردەمی بەوەستا ئەنوەری وتبوو تۆ بەخۆڕایی خۆت ماندوو مەکە ئەوە دەبینی من شتەکانم هەمووداوە بەدەستەوە ئەی بۆچی حاشا دەکەیت لەکاتێکدا چاکدەزانی من تۆم ڕاکێشاوەو ئێستاش من لێی پاشگەزبوومەتەوە وەرە تۆش واز بهێنە".

وتی: "وەستا ئەنوەر شێرئاسا نەڕاندنی بەسەر لێپرسراوەکەیانداو شالاوی بۆ بردو تفێکی کردە ناوچاوی برادەرە ڕووخاوەکەی خۆی و جێگری مودیری ئەمنی تەحقیق و پێیوتبوون چیتان لەدەستدێت درێغی مەکەن"، ئەوەی عوسمان لەوەستا ئەنوەری دەگێڕایەوە شایانی ئەوەیە پەیکەری ئاڵتونی بۆ بکەن.

هەر لەم بارەیەوە دۆستێکی نزیکی هەڵەبجەییم بۆی گێڕامەوە کە براکەی لەگەڵ وەستا ئەنوەردا زیندانی بووە دەڵێ لەکاتی لێکۆڵینەوەو لێداندا زۆر بێویژدانانە لەوەستا ئەنوەریان دەداو ئەویش زۆر چاونەترسانە گاڵتەی پێدەکردن، باسی ئەوەی بۆ کردم کە وەستا ئەنوەر بڕوای وەهابوو کە مرۆڤ دەبێت بڕوای بەخۆی و بەخەڵکی هەبێت کاتێک دەستەبەری خەباتی خەڵکی دەبێت، نابێت لەتەنگانەدا ئەو بڕیارەی لەیاد بچێت و سەری شۆڕ بکات بۆ ویستەکانی دوژمن، چونکە مرۆڤ چاک دەزانێت لەکاتێکدا شت بدرکێنێت و ناوی خەڵکی بڵێت لەوە زیاتر ئێسکی خۆی قورس دەکات و ڕووڕەشی مێژو و خەڵک و هاوڕێ و بیروباوەڕی خۆی دەبێت و هیچی تری تێدا نییەو ئەنجامیش ئەوانە دەیدۆڕێنن و لەناویشدەچن، بەڵام مرۆڤی ئازاو پاڵەوان و خۆگر هەمیشە سەربەرزو شەهیدو بە لەیادنەچوو دەمێنێتەوە، ئەگەر شەهیدیش نەبوو جێگای ڕێزی خەڵک دەبێت.

دۆستکەم بۆی گێڕامەوە کە شێخ کەمال کە هاوڕێی بیروباوەڕی وەستا ئەنوەرو ئەحمەدی برای بووە بۆی گێڕامەوە "لەکاتێکدا وەستا ئەنوەریان

ئازاردەدا ڕووتوقوتیان کردۆتەوەو لەمســەر و لەوســەری هۆڵێکی درێژدا بەســۆندە هێناویانەو بردوویانە هــەر ورەی ئەنوەریــان پێنەڕوخێندراوە، ئەوجا کەواندوویانەو لەزمانیان خســتووە لەسەر ئەوەشەوە سەریان پاک پاک تاشــیوەو بەگوێـزان لەتلەتیان کردووە تا خوێن هەموو ســەروچاوی گرتۆتەوە، پاشان لوێچێک شەکرە وردەیان کردۆتەسەرو مشتێک مێرووولەی گەوەریان بۆ هێناوەو بەرەڵای ســەرخوێن و شــەکرو سەریان کردووە تا دەمیان تێژاندووە ئەوسا بە نایلۆنێکی گەورە پێچاویانە بۆ ئەوە مێرووولەکان ســەری بخــۆن و ببێت بەهۆی ورە بــەردان و ناوهێنان، بەڵام ئەنوەر هەر نەبەزی"، دۆســتەکەم وتی: شــێخ کەمال وتوویەتی لەکاتێکدا هەردووکمان لەنزیکــی یەکــەوە بووین خەریکبوو گیانی دەدا ســەریم کردە ســەر ڕانم هەتــا گیانی دەرچوو، بــەڵام نەموێرا نایلۆنەکەی لێبکەمــەوەو مێرووولەکان دەربکەم.

بەڵێ بەو پاڵەوانێتییە وەستا ئەنوەر گیانی بەخشی و خەڵکیتری بودەڵەش گیانی خۆیان پاراست.

## هاوڕێکەی خۆمم نەناسییەوە

لەحەوتەمی شەستەکاندا لەگەرمەی شەڕو بەیەکدادان ناکۆکی و نەگبەتی میللەتەکەماندا بوو من لەلادێوە چوومە شارو بووم بەپێشمەرگەی ناوشارو لە بنکەیەکی بەشی دووەمی پارتی کە ئەوسا بە پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان ناو دەبرا، زۆربەی کات لەبارەگاکەماندا کە لەحەمامی عەلی بەگ بوو دەکرام بەئیشکچی، چونکە زۆر لەبەردەرگا دەبووم زۆرم لەو کەسانە دەناسی لەدەرەوەی شاری کەرکوک دەهاتن، چەند جارێک لاوێک دەهات زۆر ڕووخۆش بوو بەزۆر خۆی لام خۆشەویست کردبوو، کە تۆزێک درەنگ دەهات دەکەوتمە هەواڵپرسینی. ئاشنایەتییەکەمان بوو بە برادەری بۆمدەرکەوت قوتابییەو لەشاری حاجی قادری نەمرە.

زۆرجار کە دەهات بەشی زۆری کاتمان بەیەکەوە دەبردەسەر، ڕازو نیازی سیاسییمان بەیەکەوە باسدەکرد، هەندێکجار ئەو چاکتر هۆنراوەکانی حاجی قادری کۆیی نەمری لەبەربوو بۆی دەخوێندمەوەو هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستم لەبەری کۆیە بوو، زۆری ئارەزووی هۆنراوە دانانی دەکرد ناوی مەلا مەحمود بوو.

ڕۆژگارهات و ئێمەش بەدوایدا خشاین پاش ئەوەی لەدادگای شۆڕش بڕیاری شەش ساڵ زیندانیمان بەسەردا دراو بردیانین بۆ زیندانی (الاحکام الخاصة) ڕۆژێکیان ئاوی میمەکان برا بوو، دنیاش گەرم بوو ویستمان هەندێک ئاو لەساڵۆنە گەورەکەی چاوەڕوانی بهێنین گەیشتینە بەردەرگای (ق٣) پیاوێکی باڵابەرزی سەرتاشراوی ناشیرین کرۆشکەی کردبوو بەوە دەچوو لەوڵاتێکدا بێت کەسی تێدا نەناسێت و نانی شەویشی نەبێت بیخوات، دەموچاوێکی لۆچ لۆچاوی ناشرین سەرنجی ڕاکێشاین وەها ڕێککەوتبوو ئەرسەلانیش هەست بکات کە کاتی خۆی ناسیویەتی تۆزێک لێیتێپەڕین من وتم: "ئەو پیاوەی دانیشتبوو زۆر بەبرادەرێکم دەچێت"، خێرا ئەرسەلانیش وتی: "بەڕاستی خەریکبوو من وەها بڵێم دەزانی زۆر بەمامۆستا حەمیدی کەریم شانە دەچێت؟"

بەجووت ئاوڕێکمان لێدایەوە سەرنجمان دا ئەویش سەیرمان دەکات و وەکو بڵێ "ئای دنیا، براش لەبرا ناپرسێت؟" بەو ئاوڕدانەوەی ئێمە ئەو دڵنیا بوو ئێمە بەگومانین و نایناسین بۆیە ئەو زیاتر سەرنجی دەدا تا دوورکەوتینەوە، سێجار ئاوڕمان لێدایەوە پاشان چووینە سەرئاو سەتڵەکەمان پڕکردو بەنزیکی ئەودا گەڕینەوە، زۆر پێدەچوو مامۆستا حەمید بێت، لێمانپرسی "ئەرێ تۆ مامۆستا حەمید نیت؟" وتی: "بەڵێ برا بەرەوەڵڵا بۆچی نامناسن؟"

داوای لێبووردنمـــان لێکــرد ئاوەکانمــان برد بەتاڵمانکــردو داوامانکرد، ئەویش ســـەتڵێک هەڵگرێت و بەدواماندابێت، بەڵکو دوو ســێ قسەی لەگەڵ بکەین تا ئێمە گەڕاینەوە ئەویش ســـەتڵێکی گرتبوو بەدەستەوەو بەدواماندا هات، دوور بەدوور هەندێک پرسیارمان لێکرد وتی: "لەسەر کۆمەڵە گیراوم، لەهەئیەی کەرکوک هەر کوشــتوویانم، ئەوەی بەمن کراوە هەر منم ماوم"، لێمانپرســی: "باشــە وەزعــی مالیەت چۆنــە؟" وتی: "پــارەی جگەرەیەکەم پێنییە، بردمان بەدزییەوە شــتێکمان کــردە گیرفانی و ئاگادارمانکرد لەڕێی برادەرەکانــی (ق٣)وە ئــاگاداری وەزعی خۆیمان بکات هەرچەندە لەســـەر وەزعــی خۆی قســـەی بۆ کردیــن، بەڵام هەر دوو دڵ بووین کە مامۆســـتا حەمید بێت، ئاوا گوشرابوو هەر بەو مرۆڤەی جاران نەدەچوو ناسینەوەی ئاســـان نەبوو. ئەو تێکۆشـــەرە پێشـــمەرگەیەی ســـەر ئەنجام لەشاخ گیانی بەخاکی کوردستان سپارد.

## ئازاردانی بە کۆمەڵ

لەسـاڵی (١٩٧٩) کە نێوانـی ئێران و عێراق خراپ تێکچوو شـیعەکانی نەجەف و کەربەلاو باشوورو ناوەڕاست کەوتبوونە جموجۆڵ دژی عێراق، هەر بۆیە عێراقیش بەڕاست و بەچەپدا خەڵکی لێدەگرتن، پۆل پۆل سەرنگون دەکران، لەلای ئێمە (م١-) هەبوو پێشووتر زیندانیتری تێدابوو بەتاڵیانکردو بەلێشاو شیعەیان دەهێناو فڕێیان دەدانە (م ١-)ەوە زۆربەی ئەوانەی دەگیران لە (١٨) ساڵ بەرەو خواربوون زۆریان لێدەدان منداڵبوون هاواریان هەموو زیندانـی دەگرتـەوە جل لەبەریانـدا نەمابوو، تێیاندا هەبـوو ڕووت ڕووت ببۆوە و زۆرجار دیمەنی گورگم دەهاتە بەرچاو چۆن لەزسـتاندا شـالاوی برسێتی دەبردە ناو مێگەلە مەڕەوە، ئەو ئەمنانەش ئاوا شالاویان بۆ دەبردن بەکۆمەڵ دارکاریان دەکردن لێدانی وەها مرۆڤ خۆی پێناگیرێت لێی نەیەتە جواب، بەڵام ئێمەی بێدەسەلات هیچ شتێکمان لەدەست نەدەهات، لەوە زیاتر بەدزییەوە بیجامەو کراس و شـتی زیادەی خۆمان بۆ دەناردن و هاوکاری جێبەجێکردنی وردە پێویستیمان دەکردن و دیمەنی وامان هەر بەقەسابخانە دەهاتـە بەرچاو، خەڵکی تەڕو وشـک پێکەوە دەسـتووتا، خۆیان دەیانوت: "کارەبـا زۆر بەکاردەهێنین هەڵواسـینی پانکە، پەلاماردانی ناشـەریفانەی منـداڵ ئازاردان و لێدانی ئەم شـیعانە، چونکە زۆربـوون هەر بەکۆمەڵ و لەبەرچـاوی یەکتـری لێیاندەدان بۆ ئەوەی هەموویـان بروخێنن دیمەنێکی وەهایان هەبوو هیچ مرۆڤێکی خاوەن ویژدان خۆی پێڕانەدەگیرا.

دۆسـتێکی بەسـراویم هەبوو بەناوی عەواد، زۆرجار سەرگوزەشتەی خۆمـان و میللەتەکەمـان بـۆ یەکتـری دەگێڕایـەوە ئـەو وەکـو مرۆڤێکی شۆڕشگێڕی زوڵم لێکراوی عەرەب و منیش وەکو کوردێکی بێبەش لەژیانی مرۆڤایەتی.

جارێکیـان زۆر قـوڵ چووینـە نـاو کێشـەکانەوەو لە عەوادم پرسـی هەندێکـم بـۆ باس بکـە لەو شـێوە ئازاردانانـەی بینیووتـە، ئەویش وتی: "جۆرەها ئازاردانیان هەیە کە مرۆڤ بەخەیاڵیدا نایەت، وەکو ئەوەی ڕۆژێک بردمیـان بـۆ شـوێنێک بەکورسـییەکی جێگیرکـراوەوە تونـد تونـد شـەتەکیاندام و پـاک پاک سـەریان تاشـیم نەمدەزانی بۆچـی وەها ڕەپ دایانبەسـتووم ڕاسـتە توند بەسـتنەکە ئازاری هەبوو، بەڵام نەمزانی چی لەدواوەیە کاتێک مخابەراتەکە دایبەسـتم و ڕۆیی هەسـتمکرد دڵۆپ دڵۆپ ئـاو دەدات لەتەپڵی سـەرم زۆر بەهەندم نەزانی وتـم ئەگەر وەهابێت من مەمنونم.

ئـاو دڵـۆپ دڵـۆپ تـا دەهـات دەنگـی پەیـدا دەکـرد وەهـای لێهات سەرنجمڕاکێشـێت وردەوردە بوو بەشتێکی دەروونی دەنگی گەورە دەبوو هەر دەهات سـەدای گەورەتر دەبوو دووچاری نەخۆشـی دەروونی کردم سـەدای لەتۆپ گەورەتر دەبوو هارو شێتی کردم سەد خۆزیا گوللەیەکیان پێـوە دەنام و ڕزگارم دەبوو بڕوا بکە سـەدجار مردم و زیندوو بوومەوە هاوارم لێهەڵسـا پڕ بەدەم هاوار محەمەد هاوار محەمەد هاوار عەلی هاوار عەباس هاوار مرۆڤ، هیچی سوودی نەبوو هیچ کەسێک نەهات بەدەنگمەوە مێشکم تەقی، چاوەکانم دەردەپەڕی و وەختبوو بتەقێن، بەڵام هیچ نەدەکراو نەمدەتوانی تاکە جارێک لەو دڵۆپە ئاوە خۆم بپارێزم وەها دایان بەستبووم ڕاسـت لەناوەڕاستی سـەرمی دەدا هۆشم لەخۆم نەما کاتێک چاومکردەوە لەزیندانێکدا تەنها فڕێدراوم."

## ئێوارانێک لەبەردەمی تەلەفزیۆنەکە دانیشتبووم

ئێواران پاش نانخواردن لەسـەرەوەی (م٣) تەلەفزیۆن نەبوو بەناچاری دەڕۆیشـتم بـۆ قاتی ژێـرەوە بـۆ سـەیرکردنی تەلەفزیـۆن و زەنگیانەو نەخشـەکەم لەگەڵ خۆم دەبرد بۆئەوەی بەپاڵ سەیرکردنەوە هەندێک شت بچنم، چووبوومە ناو قوڵایی زنجیرەی حەلقەکانی شـانۆگەری (سـاری و ڕیمـە)ەوە دوو پۆلیـس بەتۆپەڵێک کلیلـەوە لەدەرگای (م٣)یـان داو ناوی منیـان بەدەسـتەوە بوو وتیان: "خۆت ئامادە بکـەو وەرە دەرەوە". هەموو خەڵکی شـڵەژان کات (١١)ی شـەو بوو خۆشـم هەسـتم نەدەکرد شـتێکم کردبێت لەوە زیاتر ناوبەناو بەخەیاڵمدا دەهات یەکێکی نوێ بگیرێت و خۆی پێنەگیرێـت و ناومـان بهێنێـت چەنـدی بیـرم لێکـردەوە، نەمزانـی چـی ڕوویداوە.

کاتێـک گەیاندمیانـە ژووری ئەمنـەکان (فـەلاح) کە لاسـارترین ئەمنی ئەبوغرێب بوو دانم لێدەکرۆشـت بۆ ڕۆژێک ئازادبم و دەسـتم لێبگیربێت، دانیشـتبوو دەسـتی لەچەکمەجەکەدا بوو پێدەچوو تەسـجیل سازبکات بۆ تۆمارکردنی قسـەکانم، چونکە لەگەڵ یەکەم پرسیاریدا چرکەی دادانەوەی دوگمەی تەسجیلەکە هات و دەستی دەرهێنا.

پ- ناوت چییە؟

و- عەلی.

پ- خەڵکی کوێی؟

و- سلێمانی.

پ-خوێندەواریت؟

و- نیمە.

پ- چەند نامەی جەلال تاڵەبانیت بۆ هاتووە؟

و- زۆر.

پ- لەکوێن؟

و- لای تۆ دامناون.

پ- ئەوە قەشمەری دەکەیت؟

و- بەڵێ، بۆ؟

ئـەی ئێـوە ناهێڵن بەئاسمانیشـدا هەوای سـاغمان بۆ بێـت جا ئەگەر نامـەی جـەلال تاڵەبانی بێت تۆ دەزانیت ئەگەر تـۆ نەمدەیتێ کێ دەتوانێت بۆمبهێنێت؟

پ- بۆ نوێژناکەیت؟

و- (هیچ لەسەری نەڕۆیشتم) ئەی تۆ بۆ نوێژناکەیت؟

نەیدەزانـی پرسـیارەکان چۆن بکات وتـی: "ئەگەر چوویـن جێگاکەت گەڕاین ڕۆژنامەو شتی نهێنی تێدابوو؟" وتم: "ئەوسا چی دەکەن بیکەن."

وتی: "چەقۆت لەکوێ شـاردۆتەوە؟" وتـم: "تەنها چەقۆلەیەکم هەیە بۆ پیازپاککردن ئەویش ژمارەتان گرتووە و نوکەکەشتان شکاندووە" .

وتی: "کێی ترتان زیندانە لەبراو کەست؟" وتم: "کوڕێکی برازام بەناوی عوسمان عەبدولڕەحمان (د.مارف)" وتی: "لەکوێیە؟" وتم: "لە موسڵ بەشی خنکاندن."

دیاربوو هەموو بانگکردنەکە بۆ ئەم خاڵەیان بوو، بەڵام بۆئەوەی هەستی پێنەکەم هەڕەشەی لێکردم و ناردمی بۆ ناو زیندانێکی تەنیایی کە پێیدەوترا (مەحجەر) لەو لاشەوە خۆشیان چوو بوون هەرچی قەرەوێڵەو جێگاوبانی خۆم و دراوسـێکانم گەڕابوون هیچ شتێکی ئەوتۆیان نەدۆزیبووە، هاتنەوە بەریاندام و گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم.

## سەرەخۆشی نهێنی

لەکارگــە دەگەڕامەوە بۆ شــوێنی خۆم لەڕێگا تووشــی برادەران بووم نزیکبوونەوەیان لەڕۆژان جیابوو زۆر نەرم دەدوان و دڵیاندەدامەوە، بەڵام نەیان دەدرکاند، چییەو چی بەرگوێیان کەوتووە.

کاک عومەری ســەید عەلی وتی: "ئەرێ کاک عەلی عوســمانی برازات هەر لەموســڵە؟" ئەم پرسیارە لەگەڵ ئەوەی لەئاخری لێکۆڵینەوەی شەوی ئیدارەی زیندان یەکدەگرنەوە بۆیە داوامکرد ڕاستی مەبەستم پێ بڵێن وتیان: "چی بشــارینەوە یەک تۆڕ مارفی بــرازات ئیعدام کراوە، خۆت خۆش ئەوە بەرهەمی خەبات و ماندویەتی ئێوەیەو قوربانی ڕزگاری گەلەکەمانە".

لەکاتێکــدا ئــەم هەواڵەیــان دامێ تــازە عومەری برا گــەورەی د.مارف لەزیندانی هەئیەی کەرکوک ئازادکرا بوو، چەند ساڵێک تێنەپەڕیبوو بەسەر شەهید بوونی کاکە عەبدولڕەحمان و غەریبی برازامدا.

وتم: "براینە ئێوە و تێکڕای تێکۆشــەرانی گەلەکەمان خۆش و ئەرکێکی پیرۆزەو لێیپەشیمان نین."

## کۆستێکی گەورەمان کەوت

یەکێتیی نیشتمانی لەدەرەوە جموجۆڵێکی زۆری کردبوو بۆئەوەی ئێمە لەزینداندا ئازاد بکات، یان لانیکەمی گیانمان بپارێزێت هەر بۆیەش هانایان بردبووەبەر زۆر ڕێکخراوی سیاسی و پیشەیی لەدەرەوە، داوایان لەزۆر سەرۆک وەزیران و سەرۆک کۆمار کردبوو ناوی هەموومانیان بڵاوکردەوە بۆ ئەوەی ئەو ڕێکخراوە سیاسی و پیشەییانە نامەی داوای ئازادکردنمان بۆ بەغدا بنێرن.

بەسەدان نامە ڕوویکردە بەندیخانەی ئەبوغرێب ئەگەرچی یەک گونیەی گەورە لەمەکتەبەی (أحكام خاصە)دا بوو تاکە دانەیەکیان کارپێنەکردو نیشانی خۆشمانیان نەدا.

هیواو بڕوایەکی زۆرمان بەهاتنی جۆرج حەبەش هەبوو بۆ عێراق بتوانێت شتێکمان بۆ بکات و هاوڕێکانی ژووری خنکاندنمان بۆ بهێنێتە دەرەوە، بەڵام ئەو هیوایەش پووکایەوەو خاڵە شەهاب ڕابەری لەسەرخۆی بەویژدانی جەماوەری خاوەن بیروبڕوای شۆڕشگێڕانەی کۆمەڵەو هاوڕێی وشیارو لێزان و زاناو پاراو بەهەموو ڕۆشنبیری سیاسی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی، چاونەترسی وەک جەعفەر عەبدولواحیدو کرێکاری بازوهەڵکراوی خۆنەویستی دەم بەخەندەی وشیاری وەکو ئەنوەر زۆراب لەچرکەو کاتی خنکاندندا بوو لەکوردستان و لەدەرەوە لەدڵی هاوڕێکانمان و لەدڵی جەماوەری کوردستاندا دەژیان، ڕژێم ئەم ڕاستیەی چاک دەزانی، بۆیە ویستی هەنگاوێک بهاوێت کە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلەکەمان بەوە لەناو ببات ئەویش ئەوە بوو پەلە بکات لەخنکاندنی خاڵە شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر.

ئێوارەی ٢٠\٢١/١١/١٩٧٦ لەحەوشەی (م٣) لەگەڵ کاکە عەبەی هونەرمەندو کاک عوسمانی نانەوا هاتوچۆمان دەکردو باسوخواسمان لەسەر ڕابوردووی خاڵە و جەعفەر و ئەنوەر بوو، چونکە بەیانی زوو ناردبوونیان دارای شێخ نوری و فەرەیدون چووبوون بۆ لایان کە ئەوە نیشانەی ئەوە بووو کاتی خنکاندن نزیکە بەپێی قسەی ئەو زیندانیانەی پێش ئێمەش لە (م٣)یە بوون کاتی خەڵک خنکاندن لەدنیا تاریکبوونی ئێواران و لە تاریک و ڕوونی بەیانیاندایە، ئێمە هەمیشە خۆمان بەزەنگیانە چنینەوە خەریکدەکرد، چونکە ڕێگای خوێندنەوەی شتی چاک کەم بوو، بەڵام ئەو ئێوارەیە دەستمان لەهیچ شتێک نەدا هەر هەستمان ڕادەگرت بۆ ئەوەی بزانین چی نوێ دەبیستین، چونکە وەکو دەیانگێڕایەوە ئێواران لەکاتژمێر

شەش و بەیانیانیش تاریک و ڕوون خەڵکی لەداردەدەن و سەدای ساجەکان دەگات لەکاتی بەیەکداداندا.

دنیـا تاریکبـوو بـوو خەڵکـی کـەم لەحەوشـەکەمان بـوون ئێمە هەر هاتوچۆمان دەکرد لەپڕێکدا زرمەی ساجەکە هات چەند چرکەیەکیتر وەستا جارێکیتر لێیدایەوە، ئێمەش وەستاین هەستمان ڕاگرت جارێکیتریش سەدای هات بەوەدا دڵنیابووین کە ئەو (٣) ڕۆڵە دڵسۆزە کەڵەپیاوانی مێژوو لەلایەن جەلادەکانەوە خنکێندران و دڵە مەزنە پڕ لەخۆشەویستییەکەی مرۆڤایەتییان لەلێدان خرا.

نەماندەزانـی پێـش خنکانـدن چییان ئامـۆژگاری بـۆ ناردووین، بەڵام دڵنیابوویـن زۆر بەورەو پاڵەوان و بێباک بوون لەبەردەمی کات و سـاتی ئاخرین کۆچیاندا.

بەیانـی فەرەیـدون و دارا گەڕانـەوە بـۆ ناومان و هەواڵـی خنکاندنی برادەرانیـان ڕاگەیانـدو ئامۆژگارییـە بەنرخەکانی ئەو سـێ کەڵەپیاوەیان هێنابـۆوە بۆ هاوڕێیـان، بەڵام لەبەرسـەختی بارودۆخی زینـدان بڵاویان نەکـردەوە، جێـگای داخـە دوای ئەو هەموو سـاڵەی تێپەڕی بەسـەر ئەو کۆسـتە کەوتووەماندا ئەو ئامۆژگارییە بەنرخانەو هەڵوێستی بێوێنەی ئەو سێ سـەرکردە مەزنەمان لەبەردەسـتدا نییە، تا تۆماری بکەین هەرچەندە نامەشـم بۆ کاک دارا نارد بۆم بنووسـێتەوە و بۆم بنێرێت، بەڵام تاکو ئەم کاتەش بەدەستم نەگەیشـت داوای بوردن دەکەم لەو بۆشاییە گەورەیەی ناو کتێبەکە.

زۆر بەداخـەوە کاکـە دارۆش پاشـبوونی بەلێپرسـراو و کارکردنێکی دڵسۆزانە ئەویش دڵە مەزنەکەی لەلێدان کەوت و ئێمەش تا ئەم ساتەوەختە شتێکمان دەستگیرنەبوو.

## پەیوەندی ئێمە و گروپە سیاسییەکانی ناو زیندان

ئەو گروپ و پارت و ڕێکخراوە سیاسییانەی هەبوون ئەمانەبوون:

١. پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق.

٢. کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانی عێراق.

٣. پارتی بەعسی سەر بەسوریا.

٤. بزووتنەوەی عەرەبی سۆشیالیست.

٥. قەومیە عەرەبیەکان.

٦. پارتی کۆمۆنیستی عێراق (ق.م)

٧. پارتی کۆمۆنیستی عێراق (ل.م)

٨. ماسۆنی.

٩. بەهائی.

١٠. دەعوەو پاسۆک.

لەکاتێکدا ئێمە کەوتینە زیندانی ئەبوغرێب وردەوردە چالاکی پێشمەرگانە دەردەکەوت، هاموشۆی خەڵکی لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستانەوە بۆ لای زیندانییەکان دەکراو هەواڵەکانی حەفتە دەگەیێە بەردەستی هاوەڵەکان و زۆربەی لای ئێمە کۆدەبوونەوە. بۆ ئێمە جێگای شانازییەکی زۆر بوو هاوڕێکانی دەستپێشکەربوون لەهەڵگیرسانەوەی شۆڕش لەکوردستان. ئێمە بەهۆی ئەوەی ژمارەمان زۆر بو و نوێ هاتبووین بۆ زیندان و زۆر ڕێک و تەبا بووین، سیخوڕەکانی سەر بەئیدارە، هەواڵەکانی ناو زیندانیان دەگەیاندە ئەمنەکان، وردەوردە ئیدارەی زیندان کەوتبوونە پاڵەپەستۆ دروستکردن لەسەر زیندان جارجار پرۆژەی ڕووخان و فۆرم پڕکردنەوەی بەدناوکردنیان دەهێنایە پێشەوە.

هەواڵی ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان چەند دەنگی زیاتر بوایە، لەزینداندا کاری پێچەوانەی دەکردە سەر ئێمە، هاوڕێیانی ئێمە زۆر چالاکانە دەچوونە ناو پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکان و هەوڵی دروستکردنی یەکێتی کاری زیندانیان دەدا، لەکاتێکدا ئەمنەکان پرۆژەیەکەی بەدناویان

دادەبەزاند برادەرانمان دەستپێشخەرییان دەکردو وەڵامی خێراو بەپەلەیان ڕووندەکـردەوە بۆ ئەوەی زیندانــی دووچاری هەڵە نەبێت لەوەڵامدانەوەی پرۆژەکەی ئیدارەو ئەمن.

لەئەنجامی چاک بیرکردنەوەو ڕەفتارکردن وەهای لێهاتبوو ئاسایی هەر هەواڵێـک لەئیـدارەی زیندانەوە بڵاوبکرایەتەوە، هەمــوو لایەنەکان پرس و ڕایان لەپێشــەوە بەهاوڕێیانــی ئێمە دەکردو بووبوویــن بەجێگای پرس و ڕایان و بڕوای تێکڕایان.

## هەندێ هەواڵی دڵتەزێن

جەمال شەریف یەکێک بوو لەزیندانییەکان کە ئیدارەی زیندان جارجارە بانگیان دەکردو قسـەیان بۆ دەکردو دەیانویست بیخەنە تۆڕی خۆیانەوەو بـەکاری بهێنن بـۆ کۆکردنەوەی هـەواڵ و دەنگوباس لەسـەر جموجۆڵی سیاسـییەکانی ناو زیندان، ئەویش بەهەمانشێوە دەیویست سوود لەزانینی هەواڵ وەربگرێت.

ئەوەندە بەئاشکرا هەواڵ و دەنگوباسی دەرەوەی زیندانی بڵاودەکردەوەو سـڵی لەئیـدارەی زینـدان نەدەکردەوە، بووبـوو بەهۆی ئـەوەی زیندانییە سیاسییەکان سڵ لەهاموشۆی بکەنەوە.

زۆر دەهاتە لای من لە دوو سەرەوە خۆی لە من بەنزیک دەزانی:

١. دۆسـت و ناسـیاوی کاک عەلـی عەسـکەری بـوو زۆری خۆشدەویست.

٢. مـن ماوەیەکی زۆر لەچەمچەماڵ و دەورووبـەری کاری ڕامیاریم کردبو و چاک دەیناسـیم و بڕوای تەواوی پێم هەبوو، هەر بۆیە هەمیشـە هەواڵەکانـی ڕۆژانـی هاتنـی کەسـوکاری زیندانییانی دەدامـێ و هیچ لێی ناپرسیم من چی دەزانم، چونکە سەرەتا هەندێک شتی لێپرسیم وەڵاممدایەوە کە من کەس نایەت بۆ لام و خۆشـم پرسـیار ناکەم و پەیوەندی و شـتم بەکەسەوە نییە بۆیە چاوەڕێی تۆ دەکەم کە هەواڵەکانم بۆ بهێنیت و لەهەموو کەس بۆ من چاکترو جێگای بڕوایت ئەوە وەهایکردبوو پاش مواجە جەمال خێرا دەهاتە لام و چی بیستبووی دەی گێڕایەوە بۆم.

زۆرجـار هەندێـک لەهاوڕێکانـم و هەندێـک زیندانیتریـش ئاگاداریان دەکـردم، کـە لەجەمـال وشـیاربم، چونکـە هاموشـۆی ئیـدارەی زیندان دەکات و ڕێزی لێدەگیرێت، ئەو ئامۆژگارییانەی خەڵک و هاوڕێیان وەهای کردبوو تەنیا قسـەم لێوەردەگرت و هەرگیز قسەیەک لەدەمم دەرنەدەچوو جێگای مەترسی بێت.

ڕۆژێکیـان دوای سـەرژمێری (مەسـتار) و ڕۆیشـتنەوەی کەسـوکار چوومـە حەوشـەکەو هەندێک هاموشـۆم کردو هـەر لەخۆمـەوە پەژارە دایگرتبـووم، سـەرنجم دا جەمال بەرەو لای من دێـت، بەڵام دەموچاوێکی زۆر گرژو ناشیرینی هەبوو، وەکو جاران نەبوو دەمبەخەندەو ڕووی گەش نەبـوو وەکو جاران کە دەهات بـۆ لام، هەر چەندە بیرمکردەوە مەتەڵەکەم

بـۆ هەڵنەهـات، سـڵاویکرد زۆر بێزاربـوو لام سـەیربوو دەمزانی جەمال پەژارە بۆ کورد ناخوات، بەڵام خۆ هیوایەتیشی ئەوە بوو هەواڵ کۆبکاتەوەو بڵاویبکاتەوە ئەی چی ڕوویداوە وەها بێدەنگە؟

نەیدەویسـت هیچ قسـە بکات قەدەرێک بوو بەیەکەوە پیاسەمان دەکرد دڵـی زۆر پڕبوو بوو، دەیویسـت بگری وامهەسـتکرد کەسـێکی مردبێت، ئـەوەی بـۆی نەدەچـووم ئەوە بوو بۆ کـورد بگری بۆیە پێمـوت: "بۆچی وەها دڵت پڕە هەرچی بووە بووە، تکایە بۆم باس بکە با منیش بەشـداری پەژارەت ببم؟"

بەدەنگێکـی بـاش دەرنەچـوەوە وتـی: "کـورد نەگبەتە هەرگیـز پەند لەڕابوردووی خـۆی وەرناگرێت هەربۆیە پاش بەفیڕۆدانی خوێنی چەندان ڕۆڵەی قارەمانی ڕەنج بەخەسار هیچ بەهیچ ناکات."

دڵی منیشـی سـەغڵەتتر کرد، تکامکـرد پەلە بـکات لەڕووداوەکەو بۆم بـاس بکات وتی: "بـرا هەواڵەکانی ئەمڕۆ ناخۆشـەو وادەگەیەنێت هێزێکی پێشـمەرگەی ناوچەی سـۆران ڕوویانکردۆتـە ناوچەی بادینـان بەنیازی هێنانی چەک لەسـنووری سـوریا بۆئـەوەی بیدەنە پێشـمەرگەو خەڵک تا بەرگـری بکەن لەڕاگوێزانی بەزۆری خەڵکی گوندەکانی کوردسـتان، بەڵام نەگەبەتییەکـە دیسـان کـوردی گردۆتـەوەو لەناوخۆیانـدا بووە بەشـەڕ لەناوچـەی هەکاری و لەنێوانی برایانـی پارتی و یەکێتیدا، کە بووە بەهۆی تێداچوونی زیاتر لە (٧٠٠) پێشـمەرگەی سـەر بەیەکێتی، شـەهیدبوون و بەدیلگیران و ڕووخان و تەسلیمبوونەوەی خەڵکێکی زۆر لەو هێزە بەڕژێمی عێراق و تاک و تەراش گەڕاونەتەوە ناوچەی سـۆران"، وتی: "دەنگ هەیە عەلی عەسکەری و دکتۆر خالیدو حسێن بابەشێخ و کۆمەڵێکی زۆری تری کادرو ئەندامانی سـەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانی لەوانە ئازاد هەورامی و ملازم عومەر و شـێخ عەلی (خولە کەشـکۆڵ) و حامدی حاجی غالی باس دەکەن کە گیراون."

ئـەم هەواڵـە لەو شـوێنەدا زۆر کاری تێکردم و کاتێـک بڵاویش بۆوە خۆڵ و دۆ بوو دەکرا بەسەر تێکڕای ئەو کوردانەی دڵیان بەکورد دەسوتاو تێکڕا نەفرەتیان لە شەڕی براکوژی دەکرد.

## هەواڵێکی درۆ

هەر لەزینداندا بووین هەموو کاتژمێر چواری ئێواران ڕادیۆکەم دەگرت بەدەستەوەو دەچوومە بن سێبەری حەوشەکەو لەندەنم دەگرت، زیاتر وێڵی ئەو هەواڵانە بووین پەیوەندییان بەبزووتنەوەی کوردەوە هەبوو.

وردەوردە خەریکی زەنگیانە چنین بووم، چاوەڕێی (عالەم زەهیرە) بووم لەپڕێکدا هەواڵێکی بڵاوکردەوە کە گوایە جەلال تاڵەبانی کوژراوەو ئەو سەردەمە بزووتنەوەی شۆڕشگێرانی کوردستان پاش هەرەسەکە خەریکبوو دەبوژایەوە، خەڵکانی چالاکی وەکو مام جەلالیش بەشتێکی زۆر پێویستی بزووتنەوەکە دەزانـدران، هەر بۆیە جێگای هیواو بڕوای گەورەی ئێمە بوو، پێمانوابوو ئەگەر ئەو کوژرابێت بۆ ماوەیەکی چاک بزووتنەوەکەمان ڕێکخستنی دوادەکەوێت، چونکە بەڕاستی و هەروەهاش بوو پاش هەرەس مام جەلال لەدەرەوە بەهاوکاری تێکۆشەرانیتری کورد بەگشتی دەوری چاکی دەگێڕاو تاکە کوردی بزۆزی ڕامیاری و دبلۆماسی ئەو دەمەی کورد بوو کە تێدەکۆشا بۆ هەڵسانەوەو نوێکردنەوەی شۆڕش لەناو کاری ڕێکخراوەکەی و لەناو جەماوەریشدا پاش هەرەس خەڵکیان بەوە بەهێز دەکردەوە کە مام جەلال دەگەڕێتەوەو شۆڕش دەستپێدەکەینەوە.

لەهەمانکاتدا لەزیندانیش خەڵێکی زۆر بڕوایان وەها بوو مادام مام جەلال وەکو سەرکردەیەکی دنیادیدەی کورد ماوە لەدەرەوە دەتوانێت ڕۆڵی چاک بگێڕێت لەگەشەپێدانەوەی شۆڕشی نوێ، بۆیە ئەو هەواڵەی ڕادیۆی لەندەن کاری دەروونی زۆری کردە سەر ئێمە بەتایبەتی و خەڵکی بەگشتی، بەڵام شەو و ڕۆژێک دوای هەواڵەکە کە هەرچی ڕادیۆی عەرەبی و فارسی و تورکی هەبوو گرتمان تا بۆمان دەرکەوت هەواڵێکی ناڕاست و پڕوپاگەندەی ناحەزان بوو.

## هەواڵی کۆچی دوایی (ماوتسی تۆنگ)

لـەو ماوەیەدا چەندان هەواڵی یەک لەدوای یەکی ناخۆش ناخۆشـمان بەرگـوێ دەکـەوت، کاری گـەوەری دەکردە سـەر بـاری دەروونیمان و ماوەیەکی چاک پەژارەمان دەچێژت، لەهەمان سـێبەری دیواری حەوشەی (م ٣)دا بووین کە هەواڵی کۆچی دوایی سەرکردەی شۆڕشگێڕی گەلی چینی (ماوتسـی تۆنگ)مان بەرگوێ کەوت، ئەم هەواڵەش هەرچەندە کارەسـاتی گەلی چینی بوو پەژارەکەشـی تایبەتە بەخۆیان، بەڵام وەکو مامۆستایەکی تێکۆشەری شۆڕشـی جیهانی کاری خۆشی هەبوو لەسەر ئێمەو پەژارەی بەئێمەش بەخشی.

## هیوا و هەواڵێکی پوکاوە

ڕادیـۆکان باسـیان دەکرد کـە سـەرکردەی ڕێکخراوی بـەرەی گەلی فەلەستینی جۆرج حەبەش سەردانی بەغدا دەکات، هاوڕێکان زۆر خۆشحاڵ بـوون، چونکـە نێوانـی ڕێکخـراوی فەلەسـتینی و سـەرکردەکانی لەگـەڵ سـەرکردەو بزووتنـەوەی کورد پەیوەندییەکی مێژوویـی خۆی هەبوو ئێمە لەهەمـوو کۆبوونـەوەو نووسـین و باسـێکدا کێشـەی فەلەسـتین و گەلی عەرەبـی و ڕێکخـراوی فەلەسـتینیمان پێـش کێشـەی خۆمـان دەهێنایـە گۆڕێ و وەکو کێشـەی خۆمان سەیرمان دەکرد پێشمانوابوو عەرەبەکانیش وەها سەیری کێشەی شۆڕشگێڕانی گەلی کوردستان دەکەن، هەربۆیە پێمان وەهابوو کە جۆرج حەبەش ڕەنگە هاتنەکەی بەشی زۆری بۆ ڕزگارکردنی خاڵـە و جەعفـەر و ئەنـوەر بێـت، چەنـد ڕۆژێـک لەخۆشـی ئازادکردنی هاوڕێکانمان لەژووری خنکاندن شـوێنمان بەخۆمـان نەدەگرت، بەڵام ئەو هەواڵە و ئەو هیوایە پوکایەوە.

## هەندێک دەمەتەقەی زیندان

خەڵکێکی یەکجار زۆر لەپاش نەمانی هێزی پێشـمەرگە، پاش هەرەسی بزووتنـەوەی گەلەکەمـان بەبیانـووی جۆراوجـۆر گیرابـوون، ئەگەرچی زۆربەی ئەو خەڵکانە کورد پەروەربوون، بەڵام بەڵگەی بوونی ڕێکخسـتن یـان چەکداریـان بەدەسـتەوە نەدابـوو، تەنیـا بەگومـان و لەبەرئـەوەی نەبووبوون بە بەعسی و ناوی خۆیان نەنووسی بوو بەعەرەب و ڕازینەبوون لەلیسـتی نەتەوەیی عەرەبدا ناویان بنووسـن، بۆیـە هەریەکەیان بەکۆمەڵ بڕیاری هەتاهەتاییان بەسـەردا دابوون، ئەوەندە ترساندبوویانن بەئاسانی قسەیان نەدەکرد لەسەر وەزعی خۆشیان، لەوە زیاتر پاکانەیان بۆ پاکی و بێگوناهی خۆیان دەکرد.

ئێمـە لەگەڵ ئەوەی دووچاری زیندان بووین کێشەکەشـمان بەئاشـکرا دیاربوو لەسـەر کێشەی ڕزگاری نیشتمانە، خەڵکی زیندان چاک دەیانزانی ئیـدارەی زیندان چـۆن تەنگمان پێهەڵدەچنێت، هەندێکیشـمان لەشۆڕشـی پێشـووش ناسـراوبووین، لەگـەڵ ئەوەشـدا نەیاندەوێـرا ڕازی دەروونی خۆیانمـان بـۆ باس بکـەن، ئاسـانیش نەبوو بتوانێت سـەرنجی کەسـێک ڕاکێشیت کە بتوانێت دڵی خۆیت بۆ بکاتەوە.

## سەعدوڵڵا دووشیوانی

خەڵکی گوندی دووشیوانی ناو قوڵایی شێوەسووری بناری خاڵخاڵانەو هەر بەبنەماڵەش ژیانیان لەلادێدا بەکاری کشتوکاڵەوە بردۆتەسەر، خۆشی فێری کەژی سەربەرزی خاڵخاڵان و شەوشەوێنی مەڕ و شەونخونی بوو، جگە لەوەی هەر لەمنداڵییەوە دووچاری ناکۆکی و دوژمنکاری عەشایەری بوو بوو، ئەوەش ئەوەندەیتر وتووریای کردبوو، بەهۆی ئەوەی من ماوەیەکی چاک بەرپرسیارێتی پێشمەرگەم لەناوچەکەیاندا پێسپێردرابوو، ئەویش ناسیاوی کۆنی هەبوو لەدەرەوەو منیش گوندیم وەکو خۆی، بەلاشییەوە وەهابوو کوڕی لادێیەکان درەنگتر شیاوی گۆڕانن، بەبارێکیتردا لەڕووی بیروباوەڕەوە بەهۆی ئەوەی ئاستی خوێندەواریان نزمە هەر ئەوەش دەبێت بەهۆی ئەوەی زیاتر بتوانێت بڕوای پێبکرێت.

ئەو منیشی بەلادێیی دەزانی بۆیە زۆرجار دەرگای هەمانەکەی بۆ دەکردمەوەو هەرچی کێشە تایبەتییەکانی خۆشیان هەبوو بۆی دەگێڕامەوە وەکو ڕووداو.

ڕۆژێکیان پرسیاری ئەوەم لێکرد کە لەسەرچی گیراویت و چەند حوکمدراویت؟ وتی: "براگیان گوندەکەی ئێمە لەسەرووی شەقامی ڕێدار تەقتەقدایە، شوێنێکە لەشۆڕشی پێشوودا دەیان داستانی قارەمانانەی هێزی پێشمەرگەی تێدا تۆمارکراوە هەر لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە پێشمەرگەمان هەبووەو کوڕی ئازاو تێکۆشەری چاکی تێدا هەڵکەوتووەو شەهیدی زۆر ئازاو دڵسۆزمان بوون بەفیدای ڕزگاری گەل و نیشتمانەکەمان، ئەگەرچی شانبەشانی ئەوەش خەڵکی خراپ و خۆفرۆش و دوژمن بەشۆڕشیشمان هەن.

لەگوندەکەماندا ناکۆکی عەشایەری تێدایە لەوانە ئێمەشی گرتۆتەوە کە زۆر بەداخەوە هەندێکی ناپاک بۆ بردنەوەی گرەوی عەشایەری خۆیان کەڵکیان لەبەرگ و چەکی پێشمەرگایەتی وەرگرتووە، هەندێکجار دەستی دوژمنکارانەیان وەشاندووە هەر لەو ڕێگایەوە باوکی منیان بەردەسترێژی گولله داوە، بەپەلەکروزێ ڕزگاری بووە، هەموو جارێک لەڕێگای دەزگاکانی شۆڕشەوە پینەوپەڕۆی کێشەکە دەکرا، بەلام قەت چارەسەری بنەڕەتی بۆ دانەرا، ئەوە بوو لەئەنجامی ڕێککەوتنەکەی جەزائیر گەلەکەمان بەچۆکدا هات، ئەو سەردەمەش بەسەردەمی ترس و بێویژدانی ناودەبرا، ئەوانەی کاتی خۆی لەژێر سێبەری پێشمەرگایەتیداو بەچەکی پێشمەرگەوە ئێمەیان دەکوشت هەڵگەڕانەوە سەرخەتی بنچینەیی خۆیان و لەگەڵ کوێخا

ســیخوڕەکان ڕاوی کوردیــان دەکرد، ئەوەبوو بەهــۆی تیاچوونی باوکم و ئەوەی من بگیرێم و (٢٠) ســاڵ بڕیاری زیندانی بدرێت بەســەرمداو دایکم و چوار براو خوشکم بێسەرپەرشت و سەرگەردان ماونەتەوەو زیاتر لەشەش مانگــە لێــرەم، چاوم بەکەســیان نەکەوتــووە، چونکە پــارەی ئەوەیان نییە پێیبگەنە لام.

## مام ڕەمەزان

مام ڕەمەزان تەمەنی خۆی دابوو لە (٣٥) ساڵ خەڵکی گوندی مەلەکان لەناوچەی خۆشناوەتی بوو مرۆڤێکی دڵپاکی نەخوێندەواری گوندی بوو.

پێیوەهابوو پانی و خڕی و درێژی زەوی و ئاسمان تەنیا ئەو بۆشاییەی دەوروبەری مەلەکانەو بەس.

مام ڕەمەزان ڕۆژ تا ئێوارە و شەویش تا کاتی نووستن بەناو ژووری میمەکەدا دەسوڕایەوەو گوێی بۆ ئەوە هەڵدەخست بزانێت کێ باسی مەلەکان و دەوروبەری دەکات زۆرمان دەمانزانی مام ڕەمەزان زۆری پێخۆشە کە باسی مەلەکانی بۆ بکەیت لەوەش پێی خۆشتربوو یەکێک باسی ژیانەوەی پێشمەرگەی بۆ بکردایە.

دیاربوو مام ڕەمەزان پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەبوو بەپێشمەرگەوە، هەرچەندە زۆرجاریش دەیدرکاند کە پێشمەرگایەتی نەکردووە، بەڵام جارجار دەیوت: "تۆ بڵێی ئەمجارەش کورد بتوانێت پێشمەرگە دروستبکاتەوەو جارێکیتر ئەشکەوت و لوتەو دۆڵ و دەشت پاسەوانی کوردستانی تیدابێت؟ "

هەناسەی هەڵدەکێشاو دەیوت: "ئێمەی کورد ناتوانین بێ بوونی پێشمەرگە شەرەفمان پارێزگاری بکەین لەدەست دوژمنانی گەلەکەمان، ئەگەر پێشمەرگە نەبێت دوژمن بەسووک و ئاسانی وڵاتەکەمان لەدەست دەردەهێنێت و هەموومان تەفروتونا دەکات، ئاخ بڵێم چی ڕۆژگار وەها خراپ هاتۆتە پێشەوە لەشانسی ئێمە شۆڕشەکەمان کۆتایی پێهات و ئەوەی من لێیدەترسام ئاخری هاتەدی و ئەو پێشمەرگە جوانانە باڵای وڵاتیان ڕازاندبۆوە بەجوانی و ئازایەتی و فریشتەی هیواهێنەربوون و لەبەرچاو ونبوون، دوژمن و سەربازەکانی کەوتنە ویزەمان و زۆر بەئاشکرا بیانوویان پێدەگرتین و ئاوها لەماڵ و منداڵ دایانبڕین، ئەوەتا یەکێکی وەکو من خاوەنی هەشت کچ و تەنیا یەک کوڕم هەیە، ئەویش شەو تا بەیانی دەستی لەملی مندا نەبوایە خەوی لێنەدەکەوت کە جێگای هیوای دوارۆژی من و دایکی و هەشت خوشکەکەی بوو. "

مام ڕەمەزان ئەوەندە بەسادەیی قسەی بۆ دەکردم بەزۆر ناچار دەبووم پرسیاری لێبکەم و بڵێم: "لەسەرچی گیراویت؟"، هەر کە دەمی هەڵهێنایەوە دووکەڵی بۆنکڕوزی جگەرەی لەگەڵ دەهاتە دەرەوەو بڕوامکرد کە پیاوێکی زۆر بێتاوانە.

ســادەییەکەی وەهابوو کاتێک هەرکەسـێک لێی بپرسیایە مام ڕەمەزان لەســەر چی گیراویت؟ یەکســەر ڕوویتێدەکردو دەیوت: "ئەرێ براگیان تۆ بۆم باس بکە لەسەرچی منیان گرتووە؟«

زۆرجــار دەهاتە لام و منیش ســەرم لێدەدا دەیویســت فێری زەنگیانە چنین بێت بۆئەوەی بتوانێت پارەی پێ پەیدابکات و بۆ منداڵەکانی بنێرێتەوە، بەڵام هەرچەندی دەکرد ســەری لەنەخشــەو چنین دەرنەدەچوو، بۆیە من زۆر هاوکاریم دەکــردو بوو بوو بەهۆی ئەوەی نێوانمان توندوتۆڵتر ببێت لەهەندێک خەڵکیتر.

ڕۆژێکیــان باســی شۆڕشــی پێشــوومان کــردو جارێکیتریش باســی ئازایەتی و چاونەترسی و بەخشندەیی کورد، هەروەها هاتینە سەر ئەوەی کە سەر لەنوێ پێشمەرگە پەیدابۆتەوە ئەمجارەیان پاش تاقیکردنەوەی زۆری ئەم شۆڕشەو بەکەڵک وەرگرتن لەهەڵەو کەموکوڕی زۆرو زەبەندی وڵاتی خۆمــان و گرتنەبەری ڕێگەی خەباتێکی ســەختی جەماوەری درێژەخایەن دەتواندرێت کوردستان ئازاد بکرێت.

مام ڕەمەزان جزدانێکی زەنگیانەی بەدەســتەوە بوو خێرا خستیە لاوەو دەمی داچەقاندو وتی: "ئەوە تۆ چی دەڵێی کاک عەلی؟.«

وتــم: "بەینــی خۆمــان بێــت ئێســتا پێشــمەرگە لەدەوروبــەری بەری مەلەکان هەیەو سلێمان بیرێژی خزمتان لەو ناوە دوژمن ڕاودەکات"، خێرا هەڵسایە سەرپێی و وتی: "کوڕە وانەڵێی"، وتم: "بەسەری خۆم بەڕاستمەو لەزۆر ناوچەیتریش دەســتەی سەرەتایی شــۆڕش پەیدابوون و کۆمەڵەش دەستپێشخەری کردووە.«

مام ڕەمەزان سوور هەڵگەڕابوو زۆر دڵخۆشبوو ترسام زیاتر لەسەری بڕۆم، هەردووکمان دووچاری ئــازاردان بکات، بۆیە خاوبوومەوە، تۆزێک نزیکتــر بوومەوە وتی: "کۆمەڵەکــەی چەمی ڕەزان کە مام جەلال بەمەکینە هەڵیدەهێنــان؟"، وتــم: "نەخێر، مام ڕەمــەزان ئەمە شــتێکی نوێیەو جارێ لێبگەڕێ من پرسیارێکم هەیە هەر بۆ ئەوەش ئەمڕۆ هاتووم کەمێک پەلە بکە قسەم بۆ بکە هەتا سیخوڕەکان نەهاتوون"، وتی: "کاک عەلی فەرموو". وتم: "مام ڕەمەزان دەمێکە دەمەوێت لێت پرســم لەســەرچی گیراویت و چۆن؟" قەوانەکــەی بۆ منیش لێدایەوە وتی: "ئەرێ کاکە عەلی تۆ بڵێی لەســەرچی گیرابــم؟" وتــم: "خۆت دەزانــی و حەزدەکەم بۆم باســبکەیت وەکو هەیە"، وتــی: "بــەو خودایەی بەســەرمانەوەیە تۆ چەند ئــاگاداری منیش ئەوەندە

ئـاگادارم بەیانییەک زوو کوێخـای گوندەکەمان لەگەڵ چەند ســەربازێکدا دەوریماڵمیـان گرت، کچەکانم کردیـان بە قاو و قیژ و هاوار هاوار بەوە دەچوو شتێکیان بەرگوێ کەوتبێت هەرچەندمکرد بۆم هێور نەدەبوونەوەو دڵیشم نەدەهات لێیان توورەبم، چونکە خۆم تاقانە بووم و خدری کوڕیشم تاقانەیەو ئەو کچانەشـم زۆر دڵیان بەخۆیان دەسـووتێ و زۆرجار دەڵێن کچی بێ برا دواڕۆژی خراپە". وردەوردە لەسەر قسەکەی دەڕۆیی و وتی: "ســەربازێکیان دوو ئەستێرەی لەسەرشـان بوو بانگیکردم و وتی: "ناوت چییـە؟"، وتـم: "قوربان ڕەمــەزان"، لێم توورەبوو وتی: "کەرە ناوی ســێ لایەنـی"، وتم: "ڕەمەزان عەبدوڵلا عەلی"، کارت چییە؟"، "جوتیار قوربان"، "چەند کوڕت هەیە؟"، "بەس خدرۆکە قوربان."

ئەفســەرەکە توورەتـر بـوو دەیویسـت بیانـووم پێبگێڕێـت و لێـم هاتــە پێشـــەوە دارێکـی بەلاڵوکـی بەدەسـتەوە بـوو کـە کوێخـا بەدیاری دابوویە بۆ لێدانی جوتیارانی گوندەکەمان تا توانیتی دارێکی بەپشـتمدا دا و وتی: "چەند کوڕت ڕێگرە؟"، وتم: "بەس خدرۆکەم هەیە"، وتی: "بڵێ خدرۆکە چییە؟"، هەر ئەوەندەمان خۆشبوو داریدا بەپشتمدا ژن و کچەکانم کردیان بە هەراو هاتوهاوار و جوێندان بەکوێخاو ســەربازەکان و بوو بەئاخرزەمان و نەیانهێشت من بۆی ڕوونبکەوە کە خدرۆکە مەبەستم خدری کوڕمە.

ئەفەســـەرە چاو چلێسەکە بەناوی توورەبوونەوە شالاوی دڕندانەی بۆ کچەکانم برد لاشانی یەکە یەکەیانی دەگرت، وەختبوو ڕۆحم دەربچێت بۆیە هاوارم لێکردن و داوامکرد کە کچەکانم لێیان دوورکەونەوە با من بکوژن، بەڵام شەرەفمان بپارێزن ئەفسەرە داخ لەدڵە داوێنپیسەکە دەیویست داخی دڵی خۆی بەکچەکانم بڕێژێت، کوێخا ڕاستکراوە خائینە خۆماڵییەکەش هیچ شوورەیی نەکردو هەوڵی نەدا ئەفسەرەکە لەکچەکان دووربخاتەوە.

هەتـا تینم تێدابوو هــاوارم کرد کچەکانم دووربکەونــەوە با ئەبڕومان نەڕوات، ڕوومکردە کوێخاو تکام لێکرد بزانێت جەنابی ئەفسەر چی دەوێت تا وەڵامی بدەمەوە کوێخای ترسنۆک خۆی نوشتاندەوەو ڕووی لەئاغاکەی کـرد "ڕەمەزان دەڵێـت جەناب چی دەوێت؟"، ئەفســـەرە بێئابڕووەکە وتی: "چەند یاخی بوو لەم ناوە هەیە هەر ئێســتا هەموو ناوەکانم بداتێ". کاتێک کوێخا بۆی تەرجومە کردم، ڕوومکردە خۆی و وتم: "جەنابی کوێخا لەئێمە شارەزاتری و سەرگەورەمانی من تەنیا خدرم هەیەو بە ئەفسەرەکە بگەیەنە ئەو منداڵەیە "خدرۆکە".

کوێخـا زۆر بەترسـەوە قسـەکەمی بۆ نەقڵکـرد دیاربوو ئەفسـەرەکە لەبیانووەکـەی خۆی دەگەڕاو کچەکانیش زۆرتر ڕقیان هەڵسـاندبوو بۆیە بەدارەکەی کە کوێخا دابووی پێی ئیشـارەتی بۆ گۆشەیەکی حەوشەکەمان کـرد و وتی: "با ڕەمەزان ئێرە هەڵبداتەوە کە خۆی چاک دەزانێت چی تێدا شـاردۆتەوە"، من چاک تێنەگەیشـتم کوێخا بـۆی دووبارەکردمەوە منیش پرسـیارم کـرد "ئاخر بۆچـی ئەو ئـەرزە هەڵبدرم؟". ئەفسـەرەکە تێگەیی مـن چی دەڵێـم زیاتر تووڕە بـوو وتـی: "دەی خێرابکە زووتـر زەویەکە هەڵبـدرە". ناچار پـاچ و خاکەنازم هێنـاو قوڵەکانم هەڵماڵی و دەسـتمکرد بەهەڵکەندن، ئەفسەرەکە خێرا خێرا دارەکەی هەڵ دەسووڕاندو هەڕەشەی دەکـردو جارجـارەش ئاوڕێکـی بـەلای ژن و کچەکاندا دەدایەوە هێشـتا ئەنگوسـتێکم هەڵنەکەندبوو کۆمەڵێک شـت هات بەنووکی پاچەکەوە ئەوان چاکدەیانزانی و خێرا ئەفسەرەکە وتی: "ئا کوێخا بزانە ئەو پریاسکەیە چییە، کوێخای نەحەلەتی داچەمییەوەو پریاسکەکەی هێنا کە کردیانەوە هەمووی فیشـەکی بڕنەو بوو زانیم ئەم نەخشـەیە دەستی کوێخای تێدایە بەدەستی خۆم نەبوو، ڕەنگم زەردهەڵگەڕاو نەمدەزانی چی بڵێم و هەر پرسیارێکیان دەکرد بۆم وەڵام نەدەدرایەوە، دارێکی ڕاکێشامێ وتی: "پێشمانکەوە تومەز تۆش ڕێگریت و هاوکاری یاخیبووەکان دەکەیت."

خدرۆکـەی کـوڕم لەتەنیشـتمەوە وەسـتابوو فرمێسـک لەچاوەکانیدا دەبـاری، بەبێدەنگی پێش خۆیاندام بۆ نزیکترین بنکەی سـەربازی زۆریان لێدام پاشـان داوای ناوی پێشـمەرگەیان لێکردم ناوی پێشەمەرگەم لا زۆر پیرۆزبوو دڵم پێی دەکرایەوە، چونکە هەر لەسەرەتاوە ڕام وابووە کە ئەگەر پێشمەرگە نەبێت ئەوەمان بەسەردەهێنن کە ئێستا بەسەر من هاتووە.

پـاش گێچـەڵ پێکردنێکـی زۆر ڕەوانەی هەیئـەی کەرکوکیـان کردم، لەژوورێکـی بچکۆلەی تاریکدا کە پڕی بـوو لەخەڵکی بێتاوانی کورد کەس لـەوێ نەیدەوێـرا باس لەچۆنێتـی گیرانی خۆی بکات، چونکە سـیخوڕیان لەناو ژوورەکەدا دروسـتکردبوو هەرکەسێک جگەرەیەکی بخواردایە ئەوە دنیایان بەسەردا دەڕووخاند.

ماوەیەکی زۆر لەسەر فیشەکەکان لێیاندام، هاوارمدەکرد خوا دەیزانێت کە من چەکم نییەو ئاگاشـم لەشـاردنەوەی ئەم فیشەکانە نییە، هەرچی من هاوارمکرد ئەوان نەیانبیست و ئاخری بڕیاری زیندانی کردنی ماوەی بیست ساڵیاندا بە تەنگەمدا بەتاوانی ئەوەی تەقەم لەدژی پیاوانی ڕژێم کردووە.

مام ڕەمەزان لەسەرخۆ، بەڵام گریان لەقوڕگیدا بوو دەیوت: "لەسەر هەندێک فیشەک کە خۆیان و نەخشەی کوێخابوو لەحەوشەکەمدا دایان نابوو هەشت کچ و خدرۆکەی کوڕم و ژیانیان سەرگەردان کردم، بڕوا بکە زادی حەلی لە ماڵمدا نییە، ئەگەر خەڵکی خێریان پێبکەن.«

تائێستا بە سێ چوار مانگ هاوکاری ئەم و ئەو شتێک پارە کۆدەکەمەوەو ئینجا دەینێرم بۆ دایکی خدر کە سەرێکم لێهەڵبێنێت و لەگەڵ خۆی خدریش بهێنێت چاوم پێی بکەوێت، خۆ وەختە دڵم بتەقێت بۆ دیدەنی کچەکانم، بەڵام چونکە پارەمان نییە ناچار هەر داوای خدرو دایکی دەکەم سەبووری منداڵەکانم بەخدر دێت"، کە قسەکانی تەواوکرد فرمێسکەکانی بەرەبوونەوەو خێرا بە کیسە توتنەکەی سڕییەوە.

## مام ئۆمەر و ئەحمەدی کوڕی

گونـدی سـکتان لەناوچـەی بێتواتـە لەپشـتی گونـدی جیـوەی سـەرووەوەیە کـە دەکەوێتـە سـەر ئـەو شـاخەی نێوانـی کانیمـاران و سـەردۆڵەوە، سـکتان لەگوندە گەورەکانـی ناوچەکەیەو ژیانـی خەڵکەکەی بەکشتوکاڵ و مەڕومالآت بەخێوکردن دەڕوات بەڕێوە، پاش هەرەسەکە ئەم گونـدە دووچاری سـووتاندن و ئاوارەبوون هاتن. مـام ئۆمەر و ئەحمەدی کوڕی دووان بوون لەوانەی لەپاش نەمانی هێزی پێشمەرگە لەلایەن ڕژێمەوە گیرابـوون و پاش ئازادکردنێکی زۆر لە هەیئەی کەرکوک بەبڕیاری بیسـت ساڵ زیندانییەوە نێردرابوون بۆ ئەبوغرێب.

مام ئۆمەر و ئەحمەد بەجووتە لەسەر قەرەوێڵەکەی خۆیان دادەنیشتن تێکـەڵاوی کـەس نەدەبـوون لەبەرئـەوەی کـەس هاموشـۆی نەدەکردن لەخزمانیان، ناچار خۆراکی ئەوان تەنیا (کانە) بوو، هەر کە دەرۆیش کەمالی عەنقەرچی کانەی دەهێنا هێشتا سەتڵەکانی دانەدەنا ئەحمەد هەڵدەستا قاپی خۆی و باوکی دەبرد خێرا چێشتی وەردەگرت، ڕۆژێکیان بەناوی نەخشەی جانتـای زەنگیانـەوە چووم بـۆ لای و حەزمکرد هەندێک پـێ گران بکەن، نزیکی هاتنەوەی عەنقەرچی بوو دەمویست لەلایان بمێنمەوە بۆ ئەوەی مام ئۆمـەر هەندێک گرێ کوێرەی دڵی خۆیم بۆ بکاتەوە، مام ئۆمەر فەرمووی گەرمی لێکردم منیش لەخوام دەویست دانیشتم و سەرەباسێک بکەمەوە.

دەرویـش کەمـال عەنقەرچی بـرادەرم چێشـتی هێناو ئەحمـەدی مام ئۆمەریـش خێرا ڕۆیشـت مام ئۆمـەر وتی: "ئەحمەد، کـوڕم هەندێک زیاد وەربگـرە بـا کاک عەلی ئەم ژەمەمـان لەگەڵ بخوات"، ئەم قسـەیەی مام ئۆمەر بەدڵی من بوو هیچ چرکەم نەکردو چێشـتمان بۆ هات. دەڵێ: "دۆم بـێ و کلاش بـۆ خۆی بکات"، دەرویش کەمالی هاوڕێـم خێرا قاپەکانی بۆ پڕکرد لەگۆشت و سپیناخ و برنج کە زانیتی من لایان دەمێنمەوەڕ."

وتـم: "مـام ئۆمـەر بەیـادی باوکمەوە لای تـۆ ناندەخۆم، بـەڵام یەک پرسیاریشـم هەیە ئەگـەر پێت ناخۆش نەبێت"، وتـی: "دەک بەخێرهاتی و بەسـەرچاوان بفەرمـوو"، وتم: "زەحمەت نییە بۆم باسـبکەی ئێوە خەڵکی سەرچاوەی بێتواتەن یان گوندی سکتان؟ لەسەر چی جەنابت گیراویت؟"

مام ئۆمەر وتی: "ئێمە خەڵکی گوندی سکتانین گوندەکەمان زۆر خۆشبوو خەڵکەکەی سەردەمی زوو زۆر تەبابوون هەر ئەوەندە شۆڕش دووچاری نوشسـتی هات، دوژمن ناکۆکی خستە ناومانەوەو بووین بەچەند بەشێک،

هەندێک بوون بەجاش و هەندێکیتری خەڵکی لەیەکتری کوشت و بەناچاری سـەری خـۆی هەڵگرت بەملاو ئـەولا، ئێمە ماینەوە، بـەڵام چ مانەوەیەک؟ هەر شـەوەو بەزمێک لەگوندەکەمان دروستدەبوو، هەر شەوە چەند ماڵێک دەسـووتێندران سـەرەڕای هەمـوو ئەمانـە تەقوتۆقێکـی زۆر ڕوویدەداو ئێمـە نەماندەزانی ئەمە بۆ ڕوودەدات؟ ناو بەناویش گەلە جاشـێک خۆیان پێدادەکردو دەکەوتنە پشکنینی ماڵوحاڵمان."

ئێمە سەری خۆمان کزکردبوو دەمانویست بەرەنجی شانی خۆمان بژین، بەڵام وازیان لێنەهێنایین، ڕۆژێک هەلیکۆپتەرێک هاتە دامێنی گوندەکەمان و لەسەرەوەش هەندێک جاش و سەرباز هاتن بەرەو ناو گوندو دەستیانکرد بەکۆکردنـەوەی خەڵکـی گوندەکەمان لەبن دیـواری مزگەوتەکەدا هەرچی دەسـتیداری دەگرت گرتیـان و تا کەرکوک ڕاپیاننەگرتیـن و پاش مانەوەو ئازاردانێکـی زۆر لەهەیئەی کەرکوک بڕیاری بیسـت سـاڵ زیندانی دراوە بەسـەرماندا‌و هەر لـەو ڕۆژەوە بێتاوان ئالێرەداین، ئێسـتاش نازانم ئێمە بۆچی گیراوین، نازام لەسـەر چی ژن و منداڵمان سـەرگەردان و بێکەسن، (سـکتان) تەختکراو ئەوەی سووتا سووتاو پشتاو و بەراوی زەوییەکانمان بوون بەدێمەکارو ڕەز و باخەکانمان وشکبوون."

مـام ئۆمـەر زۆر بەرەزیلی و کڵۆڵی بۆی گێڕامـەوە وردەوردە تەڕایی لێواری پێڵوی چاوەکانی تەڕکرد، منیشـی ناچارکرد فرمێسـکی هاوبەشـی لەگەڵدا بڕێژم.

باسـی ئەوەی بۆ کردم چۆن دووچاری مشـکیلەیەکی گەورە هاتووەو لەم زیندانەشـدا بۆی چارەسـەر ناکرێت و بۆتە گەورەترین گرێ کوێرە و ناشتوانێت لای خەڵکی باسی بکات.

وتـی: "تۆ زۆر چوویتـە دڵمەوە بۆیە بۆت باسـدەکەم و مام خالیدیش بـۆی باسـکردووم کـە لەشۆڕشـی پێشـوودا دەوری زۆرت بینیـوەو پیاوێکی دڵسـۆزی کوردیـت"، وتی: "چاکت کرد بەخێربێیـت با داخی دڵی خۆمت بۆ هەڵڕێژم"، مام ئۆمەر فرمێسکەکانی زیاتر هاتنەخوارەوەو دەستی برد لەسـەر قۆڵەکانی سـڕینی و ئەحمـەدی نارد چایـەک لەمەنجەڵەکانی دەروێش کەمال بهێنێت وتی: "حەز ناکەم ئەحمەد لێرە بێت بۆیە تا دێتەوە بۆت باسدەکەم."

مام ئۆمەر وتی: "پێش ئەوەی زیندان بکرێین ژنەکەم دووچاری نەخۆشی بوو چاری نەکراو نەمانتوانی زوو بیگەیەنینە دکتۆر، ئەنجام ئێوەخۆش."

لــەم یــەک دوو مانگەدا خێزانــی ئەحمەدی کــورِم جارێکی کەش خۆی هات داوای لێکردین کە ناتوانێت بیســت ســاڵ چاوەڕوانــی ئەحمەد بکات، بۆیە دەبێت ئەحمەد دەستی لێهەڵبگرێت و تەڵاقی بدات، ئەحمەدیش دەستی لێبەرنابێــت و چووەتــە ســەر داری عینــادی و دەڵێ من تەڵاقــی نادەم و هەردەمێک ئازادبم هەر کەسێک بیخوازێت دەیکوژم، منیش تێدا ماوم نازام چــۆن قەناعەت بــە ئەحمەد بکەم کــە واز لەو ئافرەتە بهێنێت" لەســەرخۆ دەیوت: "یاخوا نەگبەتی کەس نەگرێت بە واروبێخیدا دەچێتە خوارەوە."

لەم قســانەدا بووین ئەحمــەد هاتەوەو مام ئۆمەر باســەکەی هێنایەوە سەر زەنگیانەکاری و چایەکمان خواردو منیش بەجێمهێشتن.

## مام خالید هەرمکی

مام خالید خەڵکی بناری چیای کەژۆستە لەگوندی "هەرمک"ی ناوچەی بێتواتـە لـەوێ هاتۆتە دنیاوە، لەگـەڵ کۆمەڵێک خەڵکی ناوچەی بالیسـاندا گیرابوون و بەکۆمەڵ بڕیاری گرتنیان بەسەردا دابوون.

مام خالید لە (م٣) بوو زۆر خۆی لێمنزیک دەکردەوەو ڕێزی لێدەگرتم، جارجـار هەواڵی جموجۆڵی ناوچەی خۆیانی دەدامێ و منیش هەر شـتێک بمزانیبایە دەشێت بۆم باسدەکرد.

مام خالید وتی: "ئێمە لەسـەردەمی شۆڕشـدا ژیانمان زۆر خۆش بوو، توتنی چاک و کارە کۆڕپەو بەرخی دابەستەی چاک و دوو ماڵ و دوو ژنم هەبوو، بەرەی هەردوو ژن کاریاندەکردو خۆش و ئاسوودە دەژیاین.

ڕۆژێکیان یەکێک لەو پێشمەرگانەی خۆی پێنەگیرا بوو، خۆی تەسلیمی بێتواتـە کردبـوو، بەدوژمنـی ڕاگەیاندبوو کە لای ئێمـە دەحەوێنەوە، ئێمە بەمەمـان نەزانیبوو، چونکە چەند شـەوێک بوو پێشـمەرگەکان نەهاتبوون تەواو بیرمان دەکردن.

شـەوێک سـەگەکان گەمـارۆی دەوری دێیەکەیاندابـوو، بەپەلە بەرەو دەوری دێ ڕۆیشـتین دەسـتی پێشـمەرگەکانمان گـرت و هێنامانەوە بۆ ماڵەوە، چەند ڕۆژێکیتری بەسەردا تێپەڕی هێزێکی زۆری جاش و سەرباز بەپاڵپشـتی چەند هەلیکۆپتەرێک هاتنە سەرمان و ئابلۆقەی گوندەکەمانیان داو نەیانهێشـت کـەس دەربازببێـت و هەموومانیـان گـرت و ئازارێکـی زۆریـان دایـن و بردیانین بۆ هەیئەی کەرکوک ئەوەی ناشـێت پێیانکردین لەسـەر ئەوەی نانمان داوە بە پێشـمەرگەو بڕیاری بیست ساڵ زیندانییان بەسـەرماندااو گونـدی هەرمکیان ڕاگوێزا بەناوی ئـەوەی کە ئۆردوگای نوێمان بۆ دەکەنەوەو ماڵ و منداڵیان ئاوارەو سەرگەردانی ئۆردوگا زۆرە ملێکان کرد."

مام خالد لەسەر ئەو کارەساتە ناخۆشەی بەسەریان هاتبوو زۆر ئاسایی بوو لای هەمیشـە دەم بەخەندەو بەهیواو گەشـبین بـوو دەیوت: "ڕۆژێک هەردێت کوردسـتان ئازاد بکرێت، ئەوسـا ئێمەش تۆڵـەی ئەم ماندویەتییە دەکەینەوە."

## مامۆستا مەلا ڕەشید بۆی گێڕامەوە

جارجار بەیەکەوە دادەنیشتین زۆرجار هەناسەی هەڵدەکێشاو پەژارەی لەوە دەخوارد کە کورد بێ دۆست و پشتیوانە، لەهەموو شت ناخۆشتر ئەوەیە کە میللەتەکەمان کەڵک لەو هەموو تاقیکردنەوە زۆرو زەبەندەی ڕابوردووی خۆی وەرناگرێت.

ڕۆژ بەڕۆژ زیاترو ئاسانتر دەکەوێتە داوی دوژمنەکانی، بۆ نموونە ئەو ڕەشبگیرییەی ناوچەی جەباری کە چۆن بەهۆی بوونی لیستی جوتیاران لەڕۆژژمێرێکی کادرێکی ساواى لایەنێکی کوردستاندا، لەڕۆژانی گەڕان و چوونە ناو ماڵە جووتیارەکاندا نانی خواردووە و ناوەکانیشی لای خۆی نووسیوە لەجیاتی بنووسێت ئەمانە نانیانداومەتێ و چاوساغیان کردووم، نووسیبووی ئەمانە ئەندام و لایەنگری ئێمەن، کاتێک ئەم کادرە کەم تەجروبەیە دەکەوێتە دەست دوژمن ڕۆژژمێرەکەی و دەیان جووتیار دەگیرێن.

لەبەرکەم تەجروبەیی و بۆ خۆپێشخستن و وەرگرتنی پلەوپایە لای تەنزیمەکەی خۆی لیستی جووتیارانی بەناوی ئەندام و لایەنگرانی خۆیەوە تۆمارکردبوو ئەوەی لەیاد نەبوو کە ڕۆژێک لەڕۆژان کە کەوتە داوی دوژمن خەڵکی دووچاری تێداچوون دەکات و خۆشی لێی دەرباز نابێت هەر لەبەرخۆشییەوە دەیوت: "باشە ئەوا وتمان کادرەکە خۆی کەم تەجروبەیە ئەی بۆچی لێپرسراوەکانی سەرووی هیچ ئامۆژگارییان نەکردووە؟"

دەیوت: "باشە خۆ دەوڵەت زانیاری ئەوەی هەیە، ئەم هەموو جوتیارە هەژارە هەمووی هی تەنزیم نیین، بۆچی ئاوا (شەلم کوێرم ناپارێزم) هەموو داپڵۆسین و تێکڕامانیان دارژمێرکردو لەیەکەوە بۆ (٢٠) بڕیاری (١٠) ساڵ زیندانی درا بەسەرمانداو لە (٣٠تا٤٠) پانزە ساڵ بڕیاری گرتن دراین لە (٤٠تا٦٠) بڕیاری تا ئەبەد زیندان درا بەسەرمانداو لەوەش بەرەو سەر بۆ خنکاندن، بەبێئەوەی دادگاییمان بکەن، تا ئەوها بەجارێک بڕیاری کوێرانەو زاڵمانەیان دا بەسەرمانداو ئاوا دووچاری زیندان کراین بەبێئەوەی هیچ دەستمان هەبێت لەناو ڕێکخستندا یان پەیوەندییمان هەبووبێت بەکەسەوە، بەڵام ببێت بەمیوان ناتواندرێت چاوپۆشی لەباشترین شێوەی پێشوازی بکەیت و ڕێزی لێنەگریت و لەسەرو خوتەوە دای نەنێیت."

دەیوت: "خۆ زۆرجاریش بووە جاش و جەیش بوون بەمیوان و پاش نانخواردن دەستیانکردووە بەگرتن و کوشتن، کەچی هەرکە هاتنەوە

جارێکیتریش ڕێزیان لێگیراوە، هەموو تاوانی ئێمەش کە گیراوین ئەوەندەیە لەماڵەکانی خۆماندا نانمان داونەتێ و ڕێزمان لێگرتوون وەکو میوان."

وتم: "مامۆستا باشە تۆ بۆ گیراویت بەحیساب تۆ مەلای گوندی و ئەهلی قورئانیت ئەم دەوڵەتەش خۆیان بەموسڵمان دەزانن و کاری تۆش ئامۆژگاری ئایینییە ئەوانەی ئێوەیانگرت نەیاندەزانی کە تۆ مەلای گوندەکەیت؟"

مەلا ڕەشـید وتـی: "کاکە ئاوایی (خان) کە دەکەوێتە سـەر ئاوەسـپی لـە (٤٠-٥٠)، ماڵێـک پێکهاتـووە گوندێکـە خەریکـی کاری ئاژەڵـداری و کشتوکاڵن."

ئـەو ڕۆژەی ئێمەیانگـرت دایانبەسـەرماندا کۆپتەرێکـی زۆر کەپـری کردبوو لەئاسـمانی ناوچەکەماندا سـەربازو جاشـەکان هـەر لەخۆیانەوە مەترسـی زۆریان هەبوو ئەگەرچی هێشـتا جموجوڵی پێشمەرگە نوێنەبوو بـۆوە لەناوچەکەمانـدا تەنیا جارجـارە کادرێک سـەردانی دەکرد، ئەویش تەنیا شـەوان و زۆر بەنهێنی و ڕێگای دەکەوتە کەم ماڵ، خەڵکی بەگشـتی هەسـتیان پێنەدەکـرد کە کادر جارێکیتر بۆ وشـیارکردنەوەو ڕاپەڕاندن و سازدان و ڕێکخستنی خەڵک سەر لەنوێ بۆ شۆڕش دەکەوێتە ناوچەکە.

ئـەو ڕۆژە خەڵکـی زۆر مەترسـیان هەبوو نەشـیاندەزانی ئەو هەموو کۆپتەرە بۆچی هەڵسـاوەو دەسووڕێتەوە بەسەر ناوچەکەدا. بارودۆخێکی وەها دروستکرابوو بۆنی خوێنی لێدەهات بێئەوەی شەڕ دەستی پێکردبێت، ئەوساش وەهابوو تاکە شوێن بۆ دڵدانەوەو ورە بەرزکردنەوەو فەرامۆشی، هاتنـی خەڵـک بوو بۆ مزگەوت و پـاڵ دیواری مەزگەوتـەکان، وردەوردە خەڵکی دەهاتن بۆ بەربەڕۆچکەی مزگەوتەکەو زۆربەی منداڵە وردەکانیش دەوریـان دابووین هەر بەو ڕۆژانە دەچوو مەولـود دەخوێندراو منداڵ بۆ شیرینی خواردن دەهاتن.

ڕۆژ گەیشتبووە ناوەند وردەوردە خەڵکی بۆ دەستنوێژ شۆرین دەچوونە سەر ئاوەکە لەپڕێکدا منداڵ هاواریان لێهەڵسا "هات.. هات.. هات" تا دەهات سەدای بەرزدەبۆوە، وای لێهات پیاوەکانیش کەوتنە ملەقوتێ هەر ئەوەندەی تۆزێک لەم قسەو باسەی هات هاتە ئۆتۆمبێلێکی خاکی تۆزی گەردەلوولی لـەدەوری گوندەکەمان بەرزکـردەوە، زۆر بەپەلە ئۆتۆمۆبێلێکی زۆر هاتنە نـاو گونـدو بـە هەرچـوادەوری ماڵەکانـدا بڵاوبوونەوە، پاشـان هەندێک جاش و هەندێک ئەفسـەرو سەرباز هاتنە دەورمان یەکێک لەئەفسەرەکان بانگـی منـی کـرد کـە لەپـاڵ محرابەکـە لەدیـوی دەرەوە دانیشـتبووم

حەدیسم بۆ خەڵکی دەخوێندەوە بۆ ئەوەی بیانخافڵێنم و کەمێک ئارامیان بکەمەوە، منیش قورئانەکەم ماچکردو پێچامەوەو خستمە سەر دەستم و بەرەو لای ئەفسەرەکە ڕۆیشتم، هێشتا یەک دوو هەنگاوم مابوو بگەمە بەردەمی ئەفسەرەکە وتی: "مەلا؟"، وتم: "بەڵێ"، وتی: "چەند پرسیارت لێدەکەم ئەگەر ڕاست نەڕۆیت بەو مێزەرە سپییەی خۆت دەتخەمە دوای ئۆتۆمۆبێلەکەو پارچە پارچەت دەکەم"، وتم: "بەڵێ، هەرشتێک بزانم وەڵامت دەدەمەوە تۆ بفەرموو."

هەندێک نزیکتر بوومەوە قورئانەکەم بەرزتر کردەوە بۆئەوەی ئەگەر لەبەر لەخۆبایی و لوتبەرزی نەیبینێت بەڵکو باشتر ببینێت و کەمێک سڵ بکاتەوەو بەزەیی بەو خەڵکەدا بێتەوە کە هەموویان وەکو لاشەی بێگیان وەستابوون.

وتی: "ئەم شەو چەند (ڕێگر) واتە پێشمەرگە هاتوونەتە گوندەکەتان و ناوەکانیان بڵێ چوونەتە ماڵی کێ و کێ و چیان داواکردووەو خەڵکی چییان وەڵام داونەتەوە، لەم گوندەی ئێوە کێ سەر بەو ڕێگرانەیەو لەبەرژەوەندی ئەوان کاردەکات ناوی هەر هەموویانم دەوێت هەر ئێستا."

لەقسەکانی نەبووبۆوەو وتی: "ڕاپۆرتێکی زۆر بەوێژدانانەمان لەخەڵکی گوندەکەوە بۆ هاتووە کە تێیدا نووسراوە کە ڕێگرەکان چەند بوون و چوونەتە چەند ماڵ و چۆن خزمەتکراون و شەویش لەمەزگەوتدا کۆبوونەوەیان پێکردوون دژی دەوڵەتی شۆڕش قسەیانکردووە."

پرسیارو قسەکانی وەکو با وابوو لەم گوێیەمەوە دەڕۆیی و لەوی ترەوە دەهاتنە دەرێ، چونکە نە ئەو پرسیارانە بەمن وەڵامدەدرانەوەو نە منیش ئاگاداری ئەو شتانەم کە ئەو دەیڵێت.

من پێموەهابوو ڕێز لەقورئان دەگرێت، چونکە زۆرجار بۆ چاوبەستەکی لەئێزگەو مزگەوتە گەورەکانی شارەکاندا باسی موسوڵمانی دەوڵەت دەکراو لۆمەی دەوڵەتانی دەوروبەریان دەکرد کە موسوڵمان نین، جا دەوڵەتێک وەهابێت دەبێت ڕێز بۆ قورئان دابنێت؟ هەندێک تینم بەخۆم داو وتم: "جەناب بیکە بەخاتری ئەم قورئانە بە هەقمان لەگەڵ بکەن و گوێ لەدرۆو دەلەسەی ئەم و ئەو مەگرن، چونکە ئەو شتانەی بەڕێزت لای من نییە داوای بوردن دەکەم". وتم: "سوێند لەسەر ئەوە ناخۆم کە خەڵکی گوندێکی دراوسێمان جارجارە بێت بۆ سەردان، ئەگینا من بەچاوی خۆم پێشمەرگەم نەبینیوە ڕووبکاتە ئێرە، جا جەناب کوا پێشمەرگە ماوە؟!!".

هــەر ئەوەنــدەم خۆشــبوو نــاوی پێشــمەرگەم هێنا تا تینــی تێدا بوو شەقێکی دا لەو دەستەم کە قورئانەکەی لەسەربوو، هەتا توانی قورئانەکەی بــە شــەقەکە دوورخســتەوە لەدەســتم و دەســتمی زۆر ئازاردا ویســتم پەلامــاری قورئانەکــە بدەم و هەڵیبگرمەوە بەدارە حەیزەرانەکەی دەســتی دایگرتــم و چەند دارێکی بەهێزی لێدام، هەرچۆنێک بوو لەژێر دەســتیەوە قورئانەکــەم هەڵگرتــەوەو نام بەســنگمەوە، ئەفســەرەکە زۆر تووڕەبوو لەسنگی ڕاپسکاندم و دوو سێ زلەی مزری لەملاو لەولای سەروچاومداو قورئانەکەی خســتە ژێر پێیەکانییەوە، کاتێــک خەڵکی گوندەکەمان ئەوەیان بینی ئەوەندەیتر زەندەقیان چوو، ئەفســەرەکە مێزەرە سپییەکەی لەملمەوە بەست و خستمیە دوای ئۆتۆمۆبێلەکەی خۆی و هانی سەربازەکانیدا هەموو خەڵکەکەیان کۆکردەوەو ڕاپێچیانکردن و بانگی دوو جاشی کرد تەنەکەیەک نەوتیان بۆ هێناو ئاگریان لەمزگەوت و قورئان بەرداو ئێمەشــیان بەدووی ئۆتۆمۆبیلەکەدا ڕاکێشــا تا ماوەیەک و پاشــان لەگەڵ تێکڕای خەڵکەکەیان هێنایــن بــۆ ئەمنی عــام و پاش لێدان و ئازاردانێکی زۆر و بڕیاری بیســت ســاڵ زیندانی ئەوە چەند ســاڵە لێرەم و هێشتا (١٦) ساڵیترم ماوە زیندانی تــەواو بکــەم، نازانم هەتاکــەی خوا ئەم زاڵمە ڕادەگرێــت و خوێنی خەڵکی پێدەڕێژرێت؟"

## عەلی عەبدولڕەحمان کە بە (عەلی زلە) ناو دەبرا

تەمەنی لە (٦٠) ساڵ تێدەپەڕی و خەڵکی شاری هەڵەبجە بوو، باڵایەکی یەکجار بەرزی چوارشانەی سەرسپی، دەموچاوپانی کەمێک لۆچ لۆچ بوو بوو، تەنیا یەک کوڕی هەبوو ژنەکەشی کۆچی دوایی کردبوو بەبێوەپیاوی مابـۆوە

ژیانی زۆر بەکولەمەرگی بردبووەسەر، مرۆڤێکی بێزیان و دەم بەخەندە و پیاوچاک بوو لەناو میمەکەماندا دەسـووڕایەوەو لەهەر شـوێنێک تاوێک دادەنیشت، ئەمنەکانی زیندانیش چاودێریان نەدەکردو حیسابیان بۆ قسەی نەدەکرد، تابڵێی نەفسـی بەرزبوو سـەری بۆ کەس شـۆڕ نەدەکردو زۆر باری ژیانیشـی خراپبوو کەس هاموشـۆی نەدەکرد بـۆ لای و بەکانەکەی گشتی دەرویش کەمال دەژیا.

کاتێـک دەچوو بۆ سـەر ئاودەسـت بێئەوەی خەڵکی ئەویـان لەبیربێت دەسـتی دەکرد بەپێکەنیـن بەدەنگی زۆر بەرزو خەڵکـی ناچاردەکرد بۆی پێبکەنـن، وەهـای لێهاتبوو هەمووومان تێگەیشـتبووین نیـازی ئەوەیە کە دەچێتە سـەرئاو و تەقەی لێدێنێت، ئەو جارانەی لەسـەر ئاودەست دەنگی تەقەکەی ئەم سەرو ئەو سەری میمەکە نەڕۆیشتایە دەهاتە دەرێ مرومۆچ خـۆی نیشـاندەدا، بـەڵام ئەگەر تەقەی بـاش بهاتایە دەیزانـی خەڵکی پێی پێدەکەنن ئەویش "قاقا" پێدەکەنی.

عەلـە زلـە لەشـارەکەی خۆیـدا دووچـاری ناکۆکـی بـوو بـوو، بۆیـە لەسـەفەرێکیدا بـۆ کڕینـی مەڕومـاڵات و جامبـازی لەهەڵەبجـە دەردەچێت و دەڕوات بۆ گوندێک لەڕێگا تووشی هەندێک خەڵک دەبێت کە هەواڵی تێپەڕبوونی لێدەپرسن بۆ دەربەندیخان وەکو دەیگێڕایەوە لە بناری شاهۆوە ڕێبوارەکان هاتبوون بۆ دەوروبەری شار، لەوێ عەلە زلە دەبینن زۆر بەوردی لێی دەپرسـن لەکوێوە بڕۆن نەکەونە داوی جاش و سەرباز، ئەویش لەدەروونی خۆیدا کوردی خۆش ویستووە وتبووی ڕەنگە لەخۆیان بترسن جوان جوان ڕێگاکەی بۆ دەست نیشانکردبوون.

ڕۆژی دوایـی عەلـە زلە لەسـەفەرەکەی دەگەڕێتـەوەو دائیرەی ئەمن دەیگرن و ماوەیەکی زۆر بێسەروشـوێنی دەکەن و پاشـانیش بیست ساڵ بڕیاری زیندانی بەسەردا درابوو بەتاوانی جاسوسی.

لێمان دەپرسی: "کاک عەلی جاسوسی خۆشە؟"

پـڕ بە دەم تفـی دەکرد لەهەموو جاسوسـی بەوەشـەوە بۆ کوردیش جاسوسی دەکات.

## عەلی حەمە مراد بۆی گێڕامەوە

وتی: "من و ئاسـۆی شێخ نوری گیرابووین و پاش ماوەیەکیش سەلاح مەجید کەرکوکی و شێخ مەحمود بەرزنجی و حەمەسەعیدیان هێنا کە ئەم سێ برایە تەنیا تاوانەکەیان ئەوەبوو لەگەڵ ئاسۆی شێخ نوری لەشارەوانی سلێمانی کاریاندەکرد.

هەموومانیـان خسـتەژێر لێکۆڵینـەوە، بـەلام کـە پرسـیارەکانیان دەکرد چەند سـەرێکی کۆمەلایەتـی هەبوو پێدەچوو شـتێکی بەڵگەداریان لەسـەر ئێمـە نەبێـت بـەوە زۆر خۆشـحاڵ بوویـن ئـاگاداری دەرەوەی زیندانمانکـرد کە ئێمە لەسـەر شـتێکی کۆمەلایەتی گیراویـن، دڵیان لامان نەبێت و نزیکە ئازادمان بکەن."

وتـی: "وردەوردە ژمارەی ڕۆژی مانەوەمان زیادیدەکرد هیچ گۆڕانێک لەکێشەکەماندا ڕووی نەدەدا."

حەمەسەعید و سەلاح و شێخ مەحمود زۆر پەرێشان بووبوون، چونکە ئەوان هیچ شـتێکیان لەخۆیاندا شـک نەدەبرد هەسـتیان بەوەش نەدەکرد کۆمەڵـە هەبێـت و ئێمەش لەسـەر کۆمەڵـە گیراوین، بۆیە زۆر سـەریان دەکردە سەر ئەمنەکان بۆ ئەوەی ئازادیان بکەن بەڕاستیش زۆری نەمابوو ئازادمـان بکەن، بەلام لەپڕێکـداو پاش مانگێک هەندێک خەڵکیتریان گرت و هێنایانن بۆ لای ئێمەو لەسـالۆنە گەورەکـەی لێدان ڕووتیانکردنەوەو تەنیا یەکی بەدەرپێیەکی کورتەوە لەسالۆنەکەدا ڕاویاندەنان و بەسۆندە لەدواوەو لەپێشـەوە لێیان دەدان هەموو پشـتیان قەف قەفە هەڵسـابوو ئێمەشـیان ڕاگرتبوو بەوە دەچوو دەورە بێت و بۆ ئێمە کرابێتەوە."

وتی: "من و ئاسـۆ یەکێک لەو زیندانییانەمان دەناسـی زۆر برادەرمان بوو ئاسۆش لێپرسراوی ڕێکخستنی ئەو بوو، کاتێک ئاسۆ چاوی پێیکەوت زەندەقـی چوو وتی: "عەلی بەخوا کارمـان خراپبووە ئەو برایە گیراوە من شـارەزاییم و بڕواناکـەم خـۆی پێبگیرێـت و ناو نەدرکێنێـت، خۆ ناویش بدرکێنێت من لەهەموو کەسێک چاکتر دەناسێت، من تائێستا شەرەفی خۆم پاراسـتووە دەترسـم هێندەم ئازار بدەن کە خۆم پێنەگیرێت و ڕووڕەشی هاوڕێکانمـان و خەڵـک و مێژووبیـن، چونکـە لەلێدانـی یەکەمجاریدا هەر دوو هێلەکـەی گونیان تەقاندو زۆریـان ماندوو کرد، هەربۆیە لەوە زراوی چووبـوو بەڵگەی لەسـەر پەیدا بکـەن و ئەمجارەیان خـۆی پێنەگیرێت و هەربۆیـەش خێـرا خێـرا دەیـوت: "عەلـی نەخشـەمان چۆن بێـت و چی

بکەیـن بۆ ئـەوەی دەممان بیگاتێ ئامۆژگاری بکەیـن خۆی نەدۆڕێنێت؟"، وتی: "چاومان تێبڕیبوون دیمەنیان بەتیپێکی وەرزشی دەچو و ئێمەش وەکو خەڵکی سەیرکەر دەمانڕوانی بۆ ئەنجامی سەرکەوتن. زۆریان لەپێیەکانیان دەدا، قاچەکانیان شین کردبوونەوە، پاشان خستنیانە سەرسنگ و هێندەیان لەسـەروچاویان دان هەتا خستیانن بەزەویدا خۆشـیان ماندوو بووبوون، بـەڵام هاوڕێکەی ئێمە ورتـەی لەخۆی بڕیبوو، زیاتـر دەینەڕاندو دەیوت: فاشیەکان، خوێنمژینە، بڕوخێن، بمرن، ڕووڕەشبن. لەوەندە زیاتر هیچیتری نەدەزانی بیڵێت و زۆر بەکەڕولاڵ دەچوو.

من و ئاسـۆ زۆرمان خۆشدەویسـت ئارەزوومان دەکرد لەئێمە بدرێت لەجیاتـی ئـەو پیاوە مـەردو ئازایـە، هەندێک لەلێدانیان وەسـتان پاشـان هەڵیانبڕی و هەردوو دەسـتیان لەپشـتەوە بەسـت و کردیان بەپانکەکەداو چەند سووڕێک سووڕاندنیانەوەو پاشان وەکو مریشکی سەربڕاوی لێهات و هیچ هەستی نەما وامانزانی شەهیدبووە زۆر بۆی پەرۆش بووین.

وازیـان لێنەهێنـا، هەندێ ئاوپرژێنیان کرد هەتـا هاتەوە هۆش خۆی و وەرزشیان پێکرد. پاش هۆشهاتنەوەی، ناچاریانکرد کە ڕابکات دوای ئەوەی هەندێک ڕاویانناو لێیاندا ڕایانگرت (لەواشە)یەکیان هێناو توند توند هەردوو گونیان خسـتەبەری و توندیانکـرد تا ڕادەی تەقاندن، ئەوجا دەسـتیانکرد بەسـۆندەکاری هەرچـی هەوڵیاندەدا ئـەو پیاوە ئازاو چاونەترسـەیان بۆ نەڕوخا، جارێکیتر کاک حسێن ڕەزا ڕەزا هاواریکرد. بڕوخێ فاشیەت، بژی کوردستان، بژی خەباتی ڕەوای گەلی کوردستان.

## دروستبوونی پەیوەندی نێوان پۆلەکانی زیندان

هەرکەسێک ڕێی دەکەوێتەوە زیندان لەکۆمەڵگەی دەرەوە دادەبڕێت و یەکسەر وەکو خەڵکی ناو زیندانی لێدێت، ڕەوشت و خووی خەڵکی ناو زیندان دەگرێت و خێرا دەیدۆزێتەوە لەگەڵ کێ هەڵسوکەوت بکات، زۆر ئاسایی دەبێت ئەگەرچی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئیدارەی زیندان و نۆکەرەکانی بەشتێکی نەفرەتلێکراو دەزاندرێت، بەڵام خەڵکی ڕەوشتبەرز سەر بەلای هەرکەسێکیتردا بکات جێگەی ڕێزلێنانەو شتێکی تیا بەسەر نییە، بەڵام هەڵسوکەوت لەگەڵ نەفرەتلێکراوان مرۆڤ زۆر ناشیرین دەکات و خەڵک خۆی لێدەپارێزێت. هەرچەندە ئەو مرۆڤانەی دووچاری هەندێک کێشەی کۆمەڵایەتی بوون خۆیان لەخەڵکی سیاسی دەپارێزن، لەبەرئەوەی ئیدارەی زیندان بانگیان نەکات و ئازاریان نەدات، هەرچەندە ناشیانەوێت دۆستایەتی خەڵکی سەربە ئەمن و ئیدارەی زیندان بکەن.

پیاوەکانی نۆکەری ئیدارەی زیندانیش کێشە دروستدەکەن و خەڵکی دووچاری لێدان و سەرلەنوێ دادگاییکردن دەکەنەوە.

مرۆڤ لەزینداندا دەردەکەوێت تا چەند توانای بەسەر خۆیدا هەیە، جار هەیە لەدەرەوە ناو و ناوبانگی گەورەو چاکی هەیە، کەچی هەمان مرۆڤ لەبەردەمی بارودۆخی زینداندا دەگۆڕێت و وەکو منداڵی لێدێت و لەسەر پلێک گۆشت دەستدەخاتە یەخەی خەڵک و هاوڕێکەی خۆی، بەڵام واشڕێدەکەوێت مرۆڤی وەها هەیە لەدەرەوە هیچ ناوبانگی نییە، بەڵام لەزینداندا دەردەکەوێت و ناوبانگی ئازایەتی دەردەکات.

زۆر مرۆڤ لەزینداندا دووچاری کێشەی کۆمەڵایەتی وەها دەبێت کەسایەتی خۆی لەدەستدەداو وەها سەرشۆڕدەبێت ڕووی دەرەوەی زیندانی نامێنێت، بۆ نموونە جارێکیان عەبدوڵلا قەشانی بۆی گێڕامەوە وتی: "ئەو لاوەی نیشانم دایت سەری هەڵنابڕێت لەدەرەوە هەستی بەوەکردووە دایکی و خوشکی پەیوەندییەکانی خراپیان هەبووەو گومانی داوێنپیسی لێکردون، هەستاوە هەردووکیانی کوشتووەو خۆی داوەتە دەست پۆلیس و دادگا، بڕیاری زیندانی بەسەردا دراوەو هێناویانە بۆ زیندان لە (استقبال) هەندێک سەرسەری و پیاوانی ئیدارەی زیندان چوون دەریانهێناوە بەناوی ئەوەی دۆستی ئەون و دەیبەنە لای خۆیان و هەر یەکەم پەرداخ شەربەتی میوانداری ڤالیۆمێکی زۆری بۆ تێدەکەن و خەوی لێدەکەوێت. پاش شەو و ڕۆژێک دێتەوە هۆش لافاوی شەهوەتی لەپاش دەڕوات دەیەوێت بڕوات شکات بکات، چەقۆوەشێن و نۆکەرانی ئەمن هەڕەشەی لێدەکەن دەنگ

بــكات دادگايــی بۆ نوێدەكەنەوەو شــتی لەســەر دەڵێن بۆئــەوەی ئیعدامی بكەن خۆشــی منداڵ و بێ تەجروبە دەبێت، سەرشــۆڕدەكات و ئەوەتا هەتا ئێستاش وەكو ژنی خۆیان بە كۆمەڵ بەكاریدەهێنن و ڕووی ناو كۆمەڵگایان پێنەهێشتۆتەوە."

## بووک و زاوا

برادەرێکم بۆی گێڕامەوە وتی ئەمڕۆ دوو زیندانی بەیەکەوە لەسەر جێگاکەیان گیراون پاشان خەڵکەکە کۆمەڵەیان لەسەرکردوون و ویستویانە لێیان بدەن. یەکێک لەزیندانیەکان دەنگی زۆر هەڵدەبڕێت و قسەی پێوتوون و هەوڵیداوە دەستی بگاتە یەکێکیان و لێی بدات. لێمان پرسی ئەرێ چی ڕوویداوە، وتی: "سنگی خۆی کردەوەو دەیدا بەسەری خۆیداو دەیوت: ئەوەی زیندانی نەدیبێت وادەزانێت قوتابخانەی فێربوونی زانین و پاڵەوانێتییە، بەڵام نازانێت لەزینداندا چی ڕوودەدات و چۆن مرۆڤ لەڕێ لادەدرێت، بڕوانن بۆم باسبکەن لەکام کتێبدا نووسراوەو لەکوێ ڕوویداوە کوڕینە سەیرەسەیر، تا ئەو دەنگی هەڵدەبڕی خەڵکی زۆرتر کۆدەبوونەوە، سیخوڕەکانی ناو زیندانیش لێیان چوونە پێشەوە". وتی: "کاتێک دیمان سیخوڕەکان هاتنە ناومان ویستمان ئەو برادەرەمان کەمێک هێوربێتەوە، زۆر ئیشارەتمان دەدایە سوودی نەبوو هەر دەینەڕاند، ویژدانی ڕێگەی پێنەدەدا هێوربێتەوە". هەر لەخۆیەوە دەیوت: "ماشائەڵڵا لەم قوتابخانەیە پیاوی سیاسی زۆرگەورە لەسەر گرتکەگۆشتێک دەیکێشێت بەسەر مرۆڤێکی دراوسێداو پیاویش هەیە هەوێکەی خۆی لەنێرەوە دەگۆڕێت بۆ مێ".

وتی: "هەموومان لەم قسانەی سەرمان سوورمابوو نەماندەزانی مەبەستی چییە؟". وتی: "لێی چووینە پێشتر زۆرمان بۆ برد چی ڕوویداوە بۆمان باسبکات"، وتی: "پێمخۆشە هەمووتان چاک بزانن ماوەیەکی زۆرە هەستم بەهەندێک شتی نارێککردووە، بەڵام هیچ دەنگم نەکردووە، چونکە بەڵگەم بەدەستەوە نەبوو، شەو و ڕۆژ ئێشکگرت بەنهێنی تا ئەمشەو هەلم بۆ ڕەخسا ئەم دووانەم لەئاودەستەکەدا گرت، کردم بەهاتوهاوارو خەڵکم لەسەر کۆکردنەوە، بەڵام باجی وەرەقەی دەرهێنا کە فلان زیندانی خۆی لەوەیتر مارەکردووەو بەشێوەی ڕەزامەندی نووسراوی داوە بەکەڵەگاکەی کە دەبێت بە ژنی، تووخوا خەڵکینە کێ شتی وەهای دیوە کوڕ شووبکات بەکوڕ". وتی: "هەرچەندە دڵنیام ئیدارەی زیندان لەپشتی ئەم کارەوەن، بەڵام هەر نابێت لەقاعەکەی ئێمە بمێنن."

*ئەم ڕووداوە لەساڵی (١٩٧٩)دا ڕوویداوە کە زۆر دەمێکە لە ئەوروپادا هەوڵی کاری لەو بابەتە دەدرێ، بەڵام تا ئەو کاتە هەرگیز لە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕووی نەدابوو، هەر بۆیە ئەو برادەرە ئەوەندە دڵتەنگ و توند بەگژ داروبەردا دەچو و ویژدانی جوڵاندبووی.

## گەڕپێکردن لەڕۆژی مواجهەو گرتنی ئەبو ئەحمەد

ڕۆژانی سەردانی کەسوکار وەکو باسمانکرد ڕۆژانی جەژنی زیندانییە. ڕۆژی تەراشکردن و خۆجوانکردن و دڵخۆشی و پێشوازی کەسوکارو دۆستە، زیندانی لەڕۆژی پێشووترەوە خۆی بۆ سازدەداو شەویش تا بەیانی خەوی پێوەدەبینێت و چاوەڕوانی گەیشتنی ڕاسپاردەی هەفتەکانی ڕابوردوویەتی بۆی بگات. کاتێک بایانیەکەی مەستار دەکراو سەرەتای خزمان دەردەکەوتن و هەر کەسە شوێنێکی دیاریدەکرد لەگەڵ میوانەکانی لەپەنایەکەوە دانیشێت و تێرتێر قسەبکات و پرسیارەکانی بەڕاشکاوی بکات، لەولاشەوە سیخورە بودەڵەکانی ناو زیندان دەگەڕان چاویان دەگێڕا بەدوای بینینی بەڵگەیەکدا بیگەیەنن و خۆیانی پێخۆشەویست بکەن و هەندێکجاریش جیهازێکی ڕیکۆرد (تەسجیل)ی بچکۆلەیان دەخستە بن قەرەوێڵەکانەوە بۆ گرتنی دەنگی زیندانی و میوانەکانی، پاشان بەنهێنی دەیاندزییەوەو ئەگەر شتێکی تیابوایە زیندانیان پێ ماڵوێران دەکرد. ڕۆژێکیان هەموومان لەحەوشەکەدا لەگەڵ میوانەکانمان دانیشتبووین هەندێک جموجوڵ هەبوو نەمانزانی چییە، پیاوێکی قەومی عەرەب بەناوی ئەبو ئەحمەد هەبوو هەموو زیندانی ڕێزیان لێدەگرت، چونکە خۆی ڕێزدارو بێ موشکیلە بوو، ئەو ڕۆژە لەحەوشەکەدا خێمەیەکی بچکۆلەی هەڵدابوو هەموو هەفتەیەک میوانی زۆردەهات ئەمجارەیان تەنیا ژنەکەی و منداڵێکی بچووک هاتبوون بۆلای، کاتێکمانزانی چەند ئەمنێک خۆیان بەبن خێمەکەیدا کردو ئەبو ئەحمەدو ژنەکەیان برد بۆ ئیدارەی زیندان و کردیان بەهەرا گوایە ئەبو ئەحمەدو ژنەکەی جووتبوون، بۆیەش ئەم پڕوپاگەندەیان بڵاوکردەوە تا کەسێک نەتوانێت لەبن خێمەدا دانیشێت، ئەم کێشەیەشیان بۆ ئەوە دروستکرد خۆشەویستی شەخسیەتی ئەبو ئەحمەد بشکێنن، چونکە سەری بۆ ڕژێم شۆڕ نەکردبوو.

## دەروێش کەماڵ (عەنقەرچی)

خەڵکی گونـدی مەلەکان بوو پیاوێکی وڕوکاس و نەخوێندەوار، بەڵام تا ئارەزوو بکەیت کوردی خۆشدەویسـت و دژی ڕژێم بوو، کەسـێکی وەهای نەبوو هاموشـۆی بکەن و دەستی نەدەڕۆیشـت، بۆیە بووبوو بەعەنقەرچی میمی (٣) لەبەر هەژاری و دەستپاکی و دەمپاکی هەموومان خۆشماندەویست، وەها ڕێککەوتبوو قەرەوێڵەکەی لەتەنیشـت منەوەبـوو ئەویش هەر بەناوی ناندان بە پێشمەرگە گیرابوو، بیست ساڵ زیندانی بەسەردا درابوو.

زۆر چاکـەی هەبـوو بەسـەرمەوە لەهەندێک جموجوڵـی خەڵکی خراپ ئاگاداری دەکردم، هەندێکجاریش نوسراو و شتی بۆ پەنادەدام لەناو تەنەکەی خۆڵەکانـدا، منیش دەمویسـت فێری خوێندەواری بکەم لەسـەر کتێبی پۆلی یەکی قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری و ئەویش بەڕۆژ دەیخوێند.

دانیشـتین لەسـەر قەرەوێڵەکە زۆرم پێوت فێربێت بڵێت حەسـەن عامل هەر دەیوت: عەسـەن حامل، دداتم بەخۆمداگرت دەروێش گیان بڵێ حەسەن عامل هەر دەیوت: عەسـەن حامل، تووڕەبووم وتم: "دەروێش بەسـە"، زانی تووڕەم وتی: "کاک حەلی بەڵین بێ ئیتر قەت نەڵێم عەسەن حامل". مەبەستی ئەوەبوو لەمەودوا بڵێ حەسەن عامل، هەرچی کردم و کۆشام دەروێشم بۆ فێری حەسەن عامل نەکرا.

## زیندانی و ئێشکگرتن

لەسەردەمێکدا هەندێک گومانیان لا دروستبووبوو کە گوایە زیندانی هەن بەتەمــان ڕابکــەن لەزیندان و ئیدارە کەوتەخۆی و پاســایەکی داهێنا خەڵکی زیندان خۆیان ئێشــک لەخۆیــان بگرن لەکاتی هاوینی ســاڵی (١٩٧٨)دا بوو سەپاندیان بەســەرماندا لەهەر بەشێکی میم یان قافدا هەر کاتژمێرێک چوار زیندانی ئێشــک بگرێــت لەوەکانیتر، ئەمە لەکاتێکدا لەســەر سەریانیشــەوە ئێشــکچی پۆلیس هەبوون (سەجان) سەرەڕای ئەوەی هەر سەرە سەعاتێک مەفرەزەیەک سەجان و ئەمنیش خۆیان دەکردە ناو بەشەکانی زینداندا.

نیاز لەم یاساو پلانەش کە دایانهێنا دروستکردنی ناکۆکی بوو، چونکە ســەرەتا پیاوە خۆفرۆشــەکانی ناو زیندانییەکانیان دادەنا پاشــان خەڵکی چاک و خۆشەویســتیان تێکەڵاوکردن بۆئەوەی هەموومان گومان لەیەکتری بکەین و کەس نەوێرێت لای کەس هیچ بڵێت و ڕێزمان نەمێنێت لای یەکتری پاشان زیندانییان بەنەخشەکەیان زانی و ئێشکیان نەگرت.

## سلفه (قەرز وەرگرتن)

سـالّی (١٩٧٢) تـازە بووبووم بەکرێکار لەبەلەدێی کەرکوک بەشـی ئاو بەمووچەیەکی زۆرکەم، ئەوەندە کەمبوو بەشی هیچی نەدەکرد، بەڵام شتێک بوو لەبێکاری باشتربوو هیواشم بەوە بوو ساڵانە شتێک زیاددەکات و کارەکە ڕەسمییەو بۆ دواڕۆژ چاکە.

هەرچەندە ئەو سەردەمە هەموو توانای خۆم بۆ کاری ڕێکخستنی کۆمەڵە سـەرفدەکرد، کارەکـەم هەفتانە بوو چەند ڕۆژێک لـە (٨ بۆ ٤)ی ئێوارە یان لـە (٤ بۆ ١٢)ی شـەو یان (١٢)ی شـەو بۆ (٨) بەیانـی بەنۆبە لەگەڵ چەند کرێکارێکیتـردا بەدیار پەمپێکی ئاوەوە بووین، کاتێک لەکار دەڕۆیشـتمەوە بەدوای خەڵکی وەهادا دەگەڕام بشێت بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵەو بزانم گوێم بۆ دەگرێت بیخەمە حەلقەی ڕۆشـنبیری کۆمەڵەوە، جگە لەوەش ڕۆژی جارێک سـەرم لەکتێبخانەی ئاسـۆ دەداو هـەر بابەتێکی نوێ بەتایبـەت ڕۆژنامەو گۆڤـاری کـوردی هەبووایە، دەمکڕی و هـەر ئـەو ڕۆژەش دەمخوێندەوە، هەر ئەو سـەردەمەش بڵاوکراوەی فەلەسـتینی دەهـات بەتایبەت کتێبەکانی مونیر شەفیق و گۆڤاری هەدەف ئەوانیش سەرگەرمی مشتومڕێکی زۆریان کردبووین لەبابەت لێکۆڵینەوە لەناکۆکی سەرەکی و سانەوی ئەو سەردەمە شەپۆلێکی چاک هەبوو کە زۆربەیان لاوبوون و دەگەڕان بەدوای دۆزینەوەی ڕێبازێکی نوێ بۆ چارەسەرکردنی گشت کێشەی نەتەوایەتی و چینایەتی.

شـوێنی کارەکـەم لەقلکەی (نـازم تەبەقچەلی) بـوو لەدائیـرەی ئەمنی ناوچـەی کوردسـتانەوە نزیکبـوو، هەندێـک لەوانـەی کـۆن دەمناسـین و لەپارتیـدا کارمـان بەیەکـەوە کردبـوو، هەڵگەڕابوونـەوە بەنـاوی (لەفیف) لەپـاڵ حکومەتدا دەیانویسـت ڕێکخسـتنێک بۆخۆیان دروسـتبکەن، بیریان لـەوە کردبۆوە من بخەنـە تۆڕەکەیانەوە زۆردەهاتن سـەرم لێبدەن، منیش زۆرم پێناخـۆش بوو، بۆیە عاجزم دەکردن بۆ ئەوەی وازم لێبهێنن، ڕۆژێک هەسـتمکرد ئەمـن چاودێریـم دەکات منیـش زۆرم گەورەکردبـوو لەخۆم زۆردەترسام شەو ڕۆیشتمەوە بەنیازی ئەوەی سەر لە ئیحسان نەجم بدەم کە ئەوسـا هەردووکمان لەکۆمیتەی شـاری کەرکـوک کارماندەکرد لەگەڵ عەبدولڕەزاق محەمەدو فەرەیدوندا لەکۆلانەکەی ماڵی ئیحسـان ئەمن ڕێگای پێگرتم، دەسـتمبرد بۆ باخەڵم ترسـان دەمانچەم پێبێـت ڕایانکرد بۆ پەنای خانووەیەکو منیش بەلایەکیتردا ڕامکردو خۆم ڕزگارکردو ئاگاداری برادەرانم کرد چارەسـەرێکم بۆ بدۆزنـەوە بەتایبـەت فەرەیدون لەزاتیـەی بەلەدیات بوو لەکەرکـوک دەسـتی دەڕۆیشـت هەوڵـی بـۆدام نقلـی شـاری چەمچەماڵ بکرێم و سـەریگرت، کە چووشمە چەمچەماڵ ئەوسا عومەر جۆلا کە پارتی

بوو مدیـری بەلەدێ بوو لێمچوو بەرقـداو وەرینەدەگرتم، چووم بۆ (لقی۳) لەسەنگاو، وەرەقەشم بۆ ئەو هێنا ئەوسا وەریانگرتم لەبەلەدێی چەمچەماڵ. وەزعـی ئەوسـای کۆمەڵە زۆرخراپ بـوو هیچ دەرامەتێکـی تایبەت نەبوو ژمارەی ئەندامەکانی کۆمەڵە لەشـاری کەرکوک و دەوروبەری پەنجا کەس دەبـوون کـە من ئەوسـا هەموویم بەناوی نهێنیشـەوە دەناسـی دەرامەتی مانگانەمـان زۆر لاوازبوو بەشـی ئەرکی سـەفەرو خوێندنـەوە و یارمەتی هەندێـک هاورێی هەژارمـان و کرێنی وەرەقەی تایـپ و بڵاوکراوەکانمانی نەدەکرد، ئەگەرچی ئیحسـان نەجم لەکارگەی نەوت کاریدەکردو هەندێکجار سـەرفی لەکۆمەڵەدا دەکرد، بـەڵام هەر کەموکورتی داراییمان بۆ دروسـت بووبوو.

ڕۆژێکیـان لەکۆبوونەوەدا پێشـنیاریانکرد کە من سـلفەیەک بکەم بیدەم بەکۆمەڵـە بۆئـەوەی وەزعـی خۆی پـێ چاکبـکات و منیش پێشـنیارەکەم پەسـەندکرد، بەڵام داوامکرد فەرەیدون هەوڵم بۆ بدات زوو نووسـراوم بۆ بکەن کە سلفەم بدەنێ.

نووسراوی سلفەم تەواوبوو، ڕۆژی وەرگرتن ئەبوشەهابیان نارد لەگەڵم لەبانکـی ڕافیدەین لەکەرکوک پارەکەم وەرگرت کە بریتی بوو لە (٦٠) دینار و (٥٠٠) فلس، ئەبوشەهاب خێرا (٦٠) دینارەکەی لێوەرگرتم (٥٠٠) فلسەکەی دامێ بگەڕێمەوە بۆ چەمچەماڵ. بۆ کەفالەت کوڕێک کە کارمەندبوو لەبەلەدیات فەرەیدون داوای لێکردبوو ببێت بەکەفیلم.

پاش ئەوەی گیرام بەچەند مانگێک کاکە عەبدوڵڵا هات سەری لێدام وتی: "برام پیاوێک هاتووە داوای ئەوەدەکات پارەی بدەینێ کە کاتی خۆی کەفیلی تۆ بووە سلفەت وەرگرتووە، دەڵێت ئەگەر پارەکەم بۆ نەنێریتەوە کە (٦٠,٥٠٠) دینارە ئەوە شکاتی لێدەکەم لەئیدارەی سجنی ئەبوغرێب."

منیـش وەزعـی ئابووریـم زۆرخـراپ بـوو کەسـم نەبوو هاموشـۆم بـکات و دەسـتی یارمەتیـم بـۆ درێژبـکات، تەنیا کاکـە عەبدوڵـڵام نەبێت ئەویـش بەعەرەبانە ڕاکێشـان هەرئەوەندەی دەتوانی مانگی جارێک سـەر لەمـن بدات بـۆ ئەبوغرێب و جارێکیش بڕوات بۆ لای عوسـمانی برازام بۆ موسـڵ کە لـەژووری ئیعدامدا بوو. ناچـار دەسـتمکرد بەزەنگیانە چنین و فرۆشتنەوەی و هەندێک پارەشم لابوو کە جارجارە دۆستێک، برادەرێک بۆ لای کەسـی خۆیـان دەهاتن یارمەتییان دەدام، لەوانـە خاڵە بەکری هاوڕێم، دام بەکاکم پێشەکی بۆی بەرێت و ئەوەی مابوو بەکرێی فرۆشتنی زەنگیانە بژاردمەوە هەر لەزینداندا.

## قوتابخانەی قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری

ئیدارەی زینـدان دەیانەویسـت زۆر سـەرقاڵمان بکـەن بـەدەورەو وەرزش و کاری ڕۆژانەی قورس و بەجەریدە بۆ خوێندنەوەو سـەرەڕای ئـەوە قوتابخانەیـان کردبۆوە بـۆ ئەوانـەی ڕادەی خوێندەوارییان نەبوو، منیـش یەکێـک بـووم لەوانـە، چونکـە لەبەردەمـی لێکۆڵینـەوەی ئەمنـدا وتبـووم خوێندەواریـم نییـە بـۆ سـەرگرتنی نەخشـەکەم و بەهێزکردنی خوێندەوارییەکەم بۆ ئەوەی بەو بیانووە ڕۆژانە هەندێک لەمیمەکان بڕۆمە دەرێ و لەگـەڵ خەڵکانـی میـم و قافەکانیتـر یەکتری ببینیـن، ناوی خۆم نووسـی و ڕۆژانە دەچووم بۆ قوتابخانە. مامۆسـتاکەمان پیاوێکی زیندانی فەلەسـتینی بـوو زۆر بووبوو بەدۆسـتم، بۆیە ڕێـزی زۆری لێدەگرتم و زۆربەی جار وانەکانی بەجێدەهێشت من پێیان بڵێمەوە.

بەڕاسـتی کاتـی چاکمـان پـێ دەبردەسـەرو لەگـەڵ قوتابییەکانیـش هەواڵ و دەنگوباسـمان ئاڵوگۆڕ دەکرد. لەسـەری ساڵداو لەتاقیکردنەوەی کۆتایـی بەیەکەمی قوتابخانە دەرچووم، لەکاتێکدا دەگەڕامەوە بۆ میمەکان، عەبدوڵڵا عەلی ڕەشـید کە هاوڕێیەکی هونەرمەندەو خۆشەویستی من بوو هەواڵی زانی سەرکەوتوو بووم ئەو بەپێچەوانەوە وێنەیەکی کاریکاتێری بۆ کردم و پیاوێک لەقوتابخانە دەگەڕێتەوە سەرکەوتوو نەبووە لەوانەکانیداو جانتایەکی بەدەسـتەوەیە فرمێسک هۆن هۆن لەچاوی بەردەبێتەوە هەر بۆ خۆشی و یادگاری ڕۆژانی زیندان ئەم یادەم نووسیوە.

## حاجی حەمە سوورە

حاجی تەمەنی لە (٤٥) ساڵ تێنەدەپەڕی، بەڵام بەدەموچاودا بە (٧٠) ساڵ دەچوو، جارجارە بەحاجی محەمەد سوورەش ناودەبرا. پیاوێکی باڵابەرزی دەموچاو سووری پەڵەپەڵە لێوی سەرەوەی هەڵچرچابوو بەکارەساتی ڕۆژگار دەستەکانی هێشتا قلیشەکانی ڕەزەوانی گوندەکەی خۆیانی پێوەدیار بوو لەسەر قەرەوێڵەکەی دادەنیشت و دارجگەرە درێژەکەی دەنا بەلێویەوەو مژی لەسەریەک لێدەدا، ئێمەو ئەویش لەڕێڕەوەکەی سەرووی پلەکانی قاتی سەرەوەی میم(٣)دا بووین ڕووبەڕووی ئاودەستەکان تەنها بۆ نوێژەکانی جێگاکەی بەجێدەهێشت و لەکاتی مەستار یان تاوەتاوێک بۆ هاتوچۆو سڕی قاچی بچوایە حەوشەکەوە بەتەنیا هاتوچۆی دەکرد خۆی زۆر چەپەک دەگرت و بەزۆر قسەت پێنەکردایە هیچ قسەی نەدەکرد زۆر لەپێش ئێمەوە گیرابوو هێشتا بەباشی نەیدەتوانی زەنگیانەکاری بکات و شت بچنێت کە زۆر پەژارەی لێدەخوارد.

ماوەیەک بوو ئارەزووم دەکرد لەگەڵیدا بکەومە قسەکردن و لەبابەت چۆنێتی گرتنی خۆیەوە پرسیاری لێبکەم و هەندێک زانیاریش پەیدابکەم لە بابەت گۆشەگیری ئەم پیاوەوە.

دیمەنێکی ئەوەندە جوانی هەبوو کاتێک کیسەکەی دەردەهێناو فەلەمەکەی دەردەکردو سیغارەکەی دەپێچایەوەو بەئەستێوبەردەکەی جگەرەکەی دادەگیرساند، مرۆڤ وای هەستدەکرد لەپاڵ گوندێکدا دانیشتووەو دەڕوانێتە پیاوە بەساڵاچووەکان.

چەندجارێک چووم بۆ لای و هەندێکجار زەنگیانەم دەدایە، بەڵام هەر نەمدەتوانی بەتەواوەتی سەرنجی ڕاکێشم و بتوانم پرسیارەکانم بکەم.

تازە عوسمانی برازام هەواڵی خنکاندنی هاتبوو ڕۆژانە برادەرەکان بەدزییەوە دەهاتن و سەرەخۆشیان لێدەکردم، حاجیش چاوی لێبوو نەیدەزانی چییە؟ ئێوارەیەکیان هاتە لام و وتی: "براگیان خۆتان خۆشبن و بەشداری خەمتانین خۆ بەناشکوری ناڵێم هەر ئێوە خاوەن شەهید نین، بڕوابکەن خێزانی کورد نییە قوربانی نەدابێت، جا مادام بۆ کورد شەهیدبووە بەزایە ناچێت و خوا حەوێجەی بکاتەوە خۆ ئەم بەعسە زاڵمە دەستناپارێزێت تەڕو وشک بەیەکەوە دەسووتێنێت، جا چاک نییە برازاکەی تۆ پێشمەرگە بووە؟ بڕوابکە تەنها یەک بنەماڵەی منیان قڕکرد، بڕوام پێ بکە منداڵێکی ناو لانکەم لەژوورەکەماندا بوو کە جاش و سەربازەکان ئاگریان تێبەرداو

خۆمیان گرت، ژنەکەم شالاوی برد دەریبهێنێت ئەویشیان سووتاند، ئەوەی بەسـەر ئێمەیان هێنا هەر ئەوەیە گوایە پێشـمەرگە هاتۆتە ماڵمان و نانمان داونەتێ". ئەمەی وت و خواحافیزی لێکردم.

پاشـان زۆر پەشـیمان بووم لەوەی خۆم لەحاجی نزیککردەوە، چونکە ئازارەکانی حاجی بوون بەسوژن و نران بەجگەرمەوە، چونکە بنەماڵەکەی عەبدولڕەحمانی برامی بیرهێنامەوە.

## ڕۆژی ئازادکردنمان لە زیندانی ئەبوغرێب

پاش پیلانی بەزۆر لابردنی (ئەحمەد حەسەن بەکر) لەلایەن (سەدام حسێن)ەوە لەساڵی (١٩٧٩) و بوونە سەرکۆماری (سەدام) هەر لەسەرەتای بوونی بە (سەرکۆماری عێراق) دەستیکرد بەهەندێک کاری سەرنجڕاکێشەر بۆ ڕسواکردن و لەبیربردنەوەی سەرۆکی پێشو و خۆشەویستکردنی خۆی لەلای گەلی عێراق.

یەکێک لەو کارانەی، بڕیاری ئازادکردنی هەموو زیندانییە سیاسیەکانی عێراق بوو لەسەرەتای مانگی ئابی (١٩٧٩)دا.

نوێنەرێکی کۆشکی کۆماری هات بۆ (زیندانی ئەبوغرێب) و نزیکەی (١٠٠)، کەسێک لەزیندانییانی چەپی (مارکسی)یان کۆکردەوەو لەشوێنێکدا کە پێیدەوترا (هۆڵی ئیستقبال) ماوەی نیو کاتژمێرێک قسەی بۆ کردین و داوای لێکردین کە پاکانە بکەین و جوێن بەخۆمان و بیروباوەڕو ڕێبازی شۆڕشگێڕیمان بدەین ئەو کاتە بڕیاری ئازادکردنمان دەدەن.

عومەری سەید عەلی یەکێک بوو لەو زیندانیانەی لێبڕاپەڕی، پێیوت: "ئەو وشەیە شوورەییە، ئێوە باس لەشۆڕشگێڕێتی و سۆسیالیستی دەکەن، بەڵام داوادەکەن کە خەڵکی دیموکراتخوازو شۆڕشگێڕ تف لەڕێبازی شۆڕشگێڕێتی بکات، ئەمە چ یاسایەکە". کابرای نوێنەر بەوە نەوەستاو لەدرێژەی قسەکانیدا وتی: "ئێمە دەمانەوێت ئێوە ئازادبکەین بەو مەرجەی هەرکەسێک لەو شوێنەی تیایدا دەژی ڕووداو و هەواڵەکانی ناوچەکەی بگەیەنێتە پۆلیس."

کاک عومەر وتی: "ئێمە پۆلیس نین، ئەگەر پۆلیسیمان بکردایە چوار ساڵ لەزینداندا نەدەژیاین، ئێمە ئازادبوونی وەها پڕ لەسەرشۆڕیمان ناوێت و بەهەڵویستی نازانین."

هاوڕێیانی تریش دوابەدوای کاک عومەر دابارینە سەر نوێنەرەکەی کۆشکی کۆماری و کردیان بەکێودا، کابرا ڕووی تێکردین و وتی: "ئێمە زۆرچاک دەزانین کە ئێوە کەسانی سەر بەڕێکخراوە چەپەکانی ئەم سەردەمەن لەوڵاتەکەماندا، لەبەرئەوەیە مەرجتان بۆ دادەنێین"، هاوڕێیان گشتیان وتیان: "ئێوە خۆتان هاتوون و دەڵێن ئازادتان دەکەین، لەبەرئەوە دژی هەموو داوایەکی نابەجێی ئێوەین."

ناچــار هەڵوێســتەکەی خۆی گــۆڕی و وتــی: "ئێمە ئازادتــان دەکەین بەمەرجێک لەمەولا لەسیاسەتدا کارنەکەن."

هەمووومان بەو مەرجە ڕازی بووین و بەڵێنی ئەوەمان دانێ کە سیاسەت نەکەیــن بۆئەوەی لەدەمی گورگ بێینە دەرەوەو پاشــان هەرکەســە خۆی بەرپرسیاری درێژەدانی کاری سیاسی خۆی بێت.

لەڕۆژی ١٩٧٩/٨/١٩دا ئازادکراین و پاش حەوانەوەیەکی کەم زۆربەمان چووینەوە سەنگەرو شاخ و...

**ناوی ئەو برا تێکۆشەرانەی پێش ئێمە لەئەمنی عام بوون:**

١. ئاسۆ شێخ نوری.

٢. محەمەد میرزا سەعید.

٣. دارا نوری ساڵح.

٤. عەلی حەمە مراد.

٥. عوسمان ئەحمەد نەسروڵلا.

٦. جەبار فەرمان.

٧. سەلام محەمەد برزۆ.

٨. ئیبراهیم حەسەن.

٩. سەعدون یەدوڵلا.

١٠. ئەنوەر حەسەن.

١١. عەبدوڵلا عەلی ڕەشید.

١٢. حسێن ڕەزا ڕەزا.

١٣. فاروق ئەحمەد.

١٤. د.جەمیل عەلی ڕەشید/ ئازادبوو.

١٥. ئەنوەر زۆراب.

١٦. دکتۆر مراد/ ئازادبوو.

١٧. سەڵاح مەجید کەرکوکی/ ئازادبوو.

١٨. حەمە سەعید/ ئازادبوو.

١٩. شێخ مەحمود بەرزنجی/ ئازادبوو.

٢٠. سامی/ ئازادبوو.

٢١. خدر عەبدولڕەحمان.

٢٢. هەینی.

٢٣. کەمال عەلی.

٢٤. خۆشناو عەبدوڵلا عەزیز.

ناوی ئەو برا تێکۆشەرانەی لەدوای ئێمە هێنایانن بۆ زیندانی ئەبوغرێب:

١. شەهیدی نەمر عەبدولڕەزاق محەمەد.

٢. شەهیدی نەمر مامۆستا حەمید کەریم شانە.

٣. شەهیدی نەمر مامۆستا جەمیل ڕەنجبەر.

٤. حاکم قاسم.

٥. ئەحمەد مەولود.

٦. ئەمجەد کەرکوکی.

٧. نەوزاد کاکەڕەش

٨. کوردۆ (سەعدون)

٩. محەمەد سەمین.

١٠- شەهاب وەهاب

هەموو ئەم برا تێکۆشەرانەی ناویان نووسراوەو ئەوانەش ناوەکانیانم لەیادچووە، دەوریان بینی لەوەی سەربەرزانە نەخشەو پلانی دەزگاکانی ئەمن و لێکۆڵینەوەو ئیدارەی زیندان پووچبکەنەوەو بەسەربەرزییەوە بێینەدەرێ لەزیندان، لەگەڵ تێکڕای شۆڕشگێڕانی گەلەکەماندا بەردەوامبوون لە تێکۆشان...

## شادبوونەوە بەشاخ

پاش تەواوکردنی زیاتر لەچوار ساڵ، لەحوکمە شەش ساڵیەکەم، بەلێبوردنی گشتی، کە کاتێک (ئەحمەد حەسەن بەکر) لادراو صدام بوو بەسەرۆک کۆماری عێراق، بڕیاری لێخۆشبوونی گشتی بۆ زیندانیانی سیاسی دراو ئێمەش بەرکەوتین و لە (٨/١٨)دا ئازاد کراین. ساڵی (١٩٧٩) گەڕاینەوە ناو ژیانی دەرەوەی زیندان، کاتێک ئازادبووم هێشتا پرسەی شەهید عوسمانی برازام تەواو نەکردبوو، هەواڵی نەخۆشی عومەری برازامیان دامێ، کە ئەو کاتە پێشمەرگەی دەستە سەرەتاییەکان بوو لەچەمی ڕەزان. کاتێک گەیشتمە سلێمانی ئازاری زۆر بوو بردمە لای دکتۆر، دکتۆرەکان کارەبایان لێدابوو تا بێتەوە حاڵەتی ئاسایی، بەڵام سوودی نەبوو دواجار لەنەخۆشخانەی کۆماری بەنهێنی خەواندمان لەوێش کۆمەڵێک دکتۆری چاکم لەسەر کۆکردەوە، لەوانە د. نەوزاد ساڵح و د. نەجاتی حەمەڕەق و عەمەلیاتیان بۆ کرد، بەڵام سوودی نەبوو گیانی بەخاکی پاکی کوردستان سپارد، تەرمەکەیمان بردەوە گوندی باووباپیرانمان لەعەسکەرو لەوێ پرسەکەیمان تەواوکردو گەڕامەوە کەرکوک، هێشتا دۆست و ناسیاوەکان بەتەواوەتی نەهاتبوونە سەردانمان، لەفرقەی کەرکوکەوە نەقیب حارس ئەفسەری سیخوڕی عێراقی، سەعیدی مەحمود باریکی ناردو هات وتی: نەقیب حارس وتی: ئەگەر عەلی نەیەت بۆ لام بۆ ئیستیخبارات دەنێرم بەدوای سەیارەدا ڕایکێشن هەتا فرقە، منیش بۆ دۆزینەوەی چارە وتم: جارێ پرسەم هەیەو ئەم چەند ڕۆژەی جەژنیش لەبەردەممان دایە، کاتێک ئەوە تەواو بوو خۆت وەرە بەدوامداو بەیەکەوە دەچین سەری لێدەدەین، بەوە سەعیدم دڵنیاکرد پاش ئەو کەوتمە تەگبیرو ڕای خۆکۆکردنەوەو لەیەکەم ڕۆژی جەژندا بەرەو سلێمانی ڕۆیشتم و لەوێش لەگەڵ شەهید ئەنوەر حەسەن خۆم ئامادەکرد بەرەو چەمی سوورقاوشان کەوتمەڕێ. پاشان فەرەیدون عەبدولقادریش هات و لەوێوە دەستەیەک پێشمەرگە لەگەڵماندا هاتن و چووین بۆ یاخسەمەر، پاشان براین بۆ دێی مالوومە لەوێ شەهید جەمال عەلی باپیر بەرپرسی هەرێم بوو، هاتە پێشوازیمانەوەو بڵاوکراوەی کۆمەڵەی ژمارە (٥)ی بە دەستەوەبوو وتی: ئەوە لەسەر ئێوە نووسراوە، بتانەوێت یان نەتانەوێت ئێوە بەزیوون، ئێمەش بەدەروونی خۆشەویستی کارکردنی کوردانەو هاوڕێیانەوە گوێمان بەوە نەداو هەنگاو هەنگاو بەرەو بارەگای سەرکردایەتی یەکێتی بۆ ناوزەنگ و زەڵێ کەوتینەڕێ.

## هەرێمی دوو

کە گەیشتینە ناوچەی بارەگاکانی سەرکردایەتی لەناوزەنگ، سەرەتا چووینە بارەگای مام جەلال، خۆشحاڵی خۆی نیشانداو دەفتەری یاداشتەکەی دەرهێناو وتی: دەنووسم ئەمڕۆ لەنوێ دەست بەشۆڕش دەکەین، چونکە پۆلێک لەسەرکردە ئەسڵییەکانی شۆڕش و کۆمەڵە هاتنەوە گۆڕەپانی خەباتە سەختەکەمان.

پاش ماوەیەک گفتوگۆ ئەوجا دابەشبووین بەسەر مەقەڕەکانی کاک مەلا بەختیارو کاک سالارو کاک نەوشیرواندا و ماوەیەکی یەکجار زۆر بەبێ چەک لەو ناوزەنگە بەفراوییە ژیانمان بردەسەر. بەڵام لەیەکەم کۆبوونەوەی سەرکردایەتی کۆمەڵەو یەکێتی بەشداریان کردینەوە وەکو ئەندامی سەرکردایەتی بەو حسابەی لەبەردەمی دەزگای لێکۆڵینەوەی ڕژێم چۆکمان دانەداوەو هیچ شتێکمان بەدەست دوژمنەوە نەداوە. هەر لەیەکەم کۆبوونەوەماندا مام جەلال دەرکاندی کە منیان داناوە بۆ فەرماندەی هەرێمی (٢) لەناوچەی قەڵاسێوکەو شوان و شێخ بزێنی و سورداش، ئەو سەردەمە کاک صەلاح چاوشین فەرماندەی هەرێم بوو، تا ئەویان هێنایە سەرەوەو منیان ناردە خوارەوە، ماوەیەکی زۆری پێچوو، لەساڵی (١٩٧٩) بوو کە من چووم بۆ هەرێمی (٢) ئەوسا ژمارەی چەکدارو بێ چەکی هەرێمی (٢) پەنجا کەسێک دەبوون، هەر ئەو سەفەرە بوو شەهید ئەنوەر حەسەن داندرا بەلێپرسراوی سیاسی و شەهید بێستون مەحمود دامەزرا بەلێپرسراوی ڕێکخستنی کۆمەڵە.

ئەوسا هێشتا پێشمەرگە ئەوەندە گەشەی نەکردبوو ناوچەکەی نەگرتبۆوەو هێشتا تەپوتۆزی ئاشبەتاڵ ناوچەکەی بەرنەدابوو، جموجوڵی پێشمەرگانە کارێکی زۆر زەحمەت بوو، بەڕۆژ نەماندەوێرا بڕۆینە گوندەکان، تەنیا ئێوارانێکی درەنگ دەچووینە گوندو تا شەو کاتی خەوتن لەناو گوند دەماینەوەو دوای دابەشبوون و نانخواردن دەبوو هەڵپەی ئەوە بکەین شتێک بۆ ناو نانەبەرەکانمان پەیدا بکەین بۆ ژەمی خواردنی بەیانی و سبەی نیوەڕۆ. نەدەبوو ئەوشەوە لەنزیکی ئەو گوندە یان چەند گوندی دەوروبەری بمابایناینەوە، چونکە بۆ سبەی (٨٠٪) جاش و فڕۆکەی کۆپتەری جەنگیمان بۆ دەهات، بۆیە هەرچۆنێک دەبوو مەسافەیەکی زۆرمان دەبڕی و لەشیو و چەم و قامیشەڵانێکی چڕ، یان دۆڵ و هەڵەتێکی دوورو بێگوماناوی خۆمان دەدا بەزەویدا، جا شەو ئەوەندە دەڕۆیشتین زۆر ماندوو دەبووین، بەڕۆژەکەش زۆرجار لەبەر هەتاو و لەناو ئاودڕدا ڕادەکشاین، دووچاری حاڵەتێکی دەروونی خراپ دەبووین، دەبوو هەتا ئێوارانی درەنگ

خۆمـــان نیشـــانی خەڵكـــی گوندەكانیش نەدەیـــن، بۆ چالێنـــان و نانخواردن زۆربەیجـــار كەڵكمـــان لەقوتووی یـــەك كیلۆی ئاوی تەماتـــە وەردەگرت و هەر لەشووشـــەی یەك كیلۆیی و نیو كیلۆیی ئاوی تەماتەو مرەبادا چامان دەخواردەوە، پێشمەرگە هەبوو دوو سێ دانە شووشەی یەك كیلۆیی چای دەخواردەوە. خواردنەكانیشـــمان، مرەبا، ماســـت، پەنیـــری كۆز كۆز. پیازو تەماتە، هێلكەی كوڵاو بوو، زۆرجار زۆر وەزعمان بەدەســـت مێشـــوولەوە خـــراپ دەبـــوو، بەتایبـــەت لەبنـــاری گەبـــەو گولیجـــەو لەشـــەوانی دەوری گـــەورەدێو كەڵەشـــێرە لەهەمووی ناخۆشـــتر هات هاتی جـــاش و كۆپتەر بەڕاســـتی هەراسانیان كردبووین، چونكە هێشـــتا خەڵكی سادەو ساویلكەو جاسوس زۆربوون، هەموو ڕۆژێك دەنگوباس و جموجوڵمان دەگەیشتەوە دوژمـــن و هەمـــوو ڕۆژێك دوژمن بۆمـــان دەردەچوون. بەتایبەت جاشـــە دڕەكانـــی قالـــە فەرەج و حەمەی شـــێخ حەســـەن و تەحســـین شـــاوەیس، لـــەو دوادواییەشـــدا كاوە بازیانی، ئەمانە هەمیشـــە ماندوویـــان دەكردین و بەدواماندا دەگەڕان، چونكە ئەم سێ چوار سەرۆك جاشە لەپێشدا پێشمەرگە بوون و زۆر شارەزاو زۆر ئازاو شەڕكەر بوون و شارەزای هەڵسوكەوتمان بوون.

## چوونم بۆ هەرێمی دوو

سەرەتا کە چوومە هەرێمی دوو، من دەمێک بوو لەناوچەکە دابڕابووم، بەتایبەت ماوەی دوای ئاشبەتاڵ، من چوار ساڵ و (٩) مانگ بوو لەزیندانی عێراقدا بووم و پێش لەوەیش چوار مانگ لەزیندانی ئێران، پێویستم بەوە هەبوو کەمێک شارەزا ببمەوەو خەڵکەکە بناسمەوە، بۆیە هەوڵم دەدا زۆربەی کات لەچەمی سوورقاوشان و چەمی ڕەزان و گوندەکانی زەرزی و عەودەلان و پیران و شێخ زەینەل و دەرەناردو گەرمک و سردو سورقاوشان و شێخان و عەسکەرو سۆتکەو مایلەو بۆلقامیش بم. بەلام کاتێکمزانی دووچاری ڕەخنەیەکی زۆری پێشمەرگە گەنجە تازە نەفەسەکان بووم لەپەناو لەناو خۆیاندا کەوتبوونە مینگەمینگ، دەیانوت: ئەم پیاوە لەم چەمانەدا بۆچی خۆی مەلاسداوە؟ برادەر هەبوو قسەی برادەرانیان بەدڵسۆزییەوە دەگێرایەوە لەپێناوی زانین و چارەسەری پرتەوبۆڵەکە. ڕۆژانە هەموو ئێوارانێک پێش چوونە گوندەکان قسەم بۆ دەکردن لەسەر چوونە مالان و پارێزگاری لەمال و باخ و شەرەف و هەڵسوکەوت لەگەل گوندییەکاندا، لەڕێگاش لانەدانە ناو پەلە نۆک و بێستان و چوونە ناو باخچەی قەیسییەوە. پاشئەوەی بەناوچەکەی خۆم ئاشنا بوومەوە، بڕیارمدا هەموو ڕۆژێک لەشوێنێکی ناوچەکەوە مەفرەزە بنێرمە سەر ڕەبایەکانی دەوروبەری گوندەکان، ئەوەبوو لەچەند ڕۆژێکدا کۆمەڵێک تەقوتۆقمان کردو سەدا بەرزبۆوە کە پێشمەرگە گەشەیکردووە، بەوەوە نەوەستام جەولەیەکی گشتی قەلاسێوکە، شێخ بزێنی سەروو، ئەم دیو و ئەودیوی خالخالان بکەین، بە دوو ڕۆژ جەولەکەمان گەیاندە کارێزە، هەموو گوندیەکانمان شەوان لەمزگەوتدا کۆکردەوەو قسەمان لەسەر (ی.ن.ک)و شۆڕشی نوێ بۆ دەکردن. کادرەکانیشمان خەریکی خەڵک ڕێکخستن بوون بۆ کۆمەڵە لەلایەک و بۆ یەکێتی لەلایەکیتر.

ئێوارە ڕۆژ لەئاوابووندابوو، هێشتا نەگەیشتبووینە گوندی کارێزە لەنێوانی مۆردخواردەی سەرو و کارێزەدا ئوتومبیلێکی پڕ لەجوتیار لەکەرکوکەوە هاتبوونەوە، توشمان بوون و پاش چاکوخۆشی تکامان لەشۆفێری ئوتومبێلەکە کرد کە سبەی چووە شار ناومان نەهێنێت، شەو چووینە گوندی کارێزەی خالخالان لەماڵەکان دابەشبووین و شەویش لەمزگەوتەکە خەڵکەکەمان کۆکردەوەو تێرو پڕ قسەمان بۆ کردن و ئێمە هەر لەمزگەوتەکە خەوتین و ئێشکچیمان دانا. ئاگاداری ئێشکچیم کرد چارەک بۆ چواری بەیانی هەڵمبستێنێت، بۆ چواری بەیانی لەکارێزە دەرچووین ڕوو لەشوێنێک هەتا ئەو ڕۆژە زۆربەی زۆری پێشمەرگەکان

ناوەکەیان نەبیســتبوو، بەڵام من لەشۆڕشــی ئەیلولدا یەک دوو جار ڕێگام کەوتبــووە ئــەو نــاوە، زۆر چــڕو دۆڵ دۆڵ و عاســی بوو، کەســێک زۆر شــارەزا نەبوایە ڕێگای دەرنەدەکــرد. لەوێ کە پێیدەوتــرا (گلەکە مردوو) ڕێک ســێ چــارەک لەگوندی کاریــزەوە دوورەو یەک ماڵــە جوتیار لەوێ دەژیــان و خەریکــی مــەڕداری بــوون. بەیانی هێشــتا خەڵکی بــۆ ئیش و فەرمانیان لەماڵ نەهاتبوونە دەرێ‌و چۆلەکە نەکەوتبووە جریوەجریو، کڵاو کــوڕەکان وردەوردە کەوتبوونە باڵەپرتــە، بەدووربینەکە ڕوانیم لەدەوری گونــدی کاریزە جموجوڵێکی ســەربازی هەیــە، پێدەچوو تەنیــا چارەکێک دوای ئێمە هاتبنە دەوری گوندەکە، خێرا فەرماندەی مەفرەزەکانم بانگکردو دەستنیشــانی شــوێنم بۆ کــردن و داوام لێکــردن تا دوژمن نەیەتە ســەر ســەرمان کەســێک خۆی دەرنەخــات و نابێت کەس قوتەقــوت بکات، هەر کەسە لەئاستی خۆی خۆی بشارێتەوەو چاودێری ئەملاولای خۆی بکات و دوژمن فەرامۆش نەکەن و لەکاتی هاتنی فڕۆکەشدا خۆ دەرنەخەن.

هێشــتا ڕۆژ خۆی نیشان نەدابوو بەناوچەکە، سوپای عێراقی داگیرکەر کەوتنە پەلاماری گوندی کاریزەو ئوتومبێلەکانیان لەئۆمەرمەندان و تورکمان باخەوە ڕیزیان بەســت بەدوای یەکداو کەوتنە تەقەو زرمە. لەئاسمانیشەوە بەهەڵهاتنی تیشــکی ڕۆژەکە فڕۆکە دەرکەوتن و لەســەر ئاســمانی هەموو گوندێکــی شــێخ بزێنی لەنگەریان گــرت و جاش و ســەرباز، ماڵەو ماڵ و دۆڵ و لوتکەو باخچە دەگەڕان بەشــوێن پێشــمەرگەدا. ئێمەش بەهەناســە کوتــێ‌و تــرس و لــەرزەوە چاومــان لەچاودێــری دوژمــن نەدەتروکاندو کەســمان ورتە لەدەممانەوە دەرنەدەهات، تا بەتەواوی کاریزە پشــکێندراو لەوێش جاش و ســەرباز ســەریانکرد بەڕووکاری ئاوبارەو ناسرو میسرو موردخوادەکانــدا، کەمێــک هێور بووینەوە. بۆماندەرکەوت دوژمن قســەی نەزانیــوە لەپــاش دەرچوونی ئێمە لەکاریزە، بۆیــە وردەوردە پەیوەندیمان بەیەکــەوە کــردو ئــاگاداری تاکە ماڵەکەمــان کرد ســاوەرێکی زۆریان بۆ لێناین و مەشکە دۆیەکەشیان ژەندبوو بەماستاو و دۆو ساوەر تێر تێریان کردیــن، ئــەوان لەئێمە زۆرتر ترســابوون، بەڵام پــاش دەرکەوتنی ڕەوتی پێشەنگی سوپای دوژمن ئەوانیش خۆشحاڵ بوون و هەر بەخێریان دەزانی ئەو خزمەتەمان بکەن.

ئێمــە پــاش نانخــواردن لەشــوێنەکانی خۆمــان نەجووڵاین، تــا ئێوارە ســوپای دوژمن گەڕایەوە. ئێوارە کە دوژمن گەڕایەوە من ســێ دەمانچەی بێدەنــگ و هەندێــک ڕاســپاردەی ناوەندی کۆمەڵەم پێبوو، بەشــەهید وریا ســوورو شــۆڕش قەرەهەنجیریــدا بەڕێمکردن بــۆ گوندی مــام ڕەش بۆ

ئــەوەی لەوێوە بــۆ کۆمیتەی ئاگری کەرکوکی کۆمەڵــەی بنێردرێت، لەوێ ڕێکخستنمان هەبوون کە خۆم دەمناسین و هەروەها گوللەیەکی قازیفەمان تەوقیت کرد، غەریب سـەعید شــارەزابوو بەســەعات دایدەنایەوە، ماوەی نیوســەعاتێک شــۆڕش و وریا ســوورمان فێری نانــەوەی (دانان) کرد بۆ مەرکەزی ئەمنی چەمچەماڵ، ئەوانمان بەڕێکردو هێزەکەمان بەرەو دوا بۆ چەمی ڕەزان گێڕایەوە، چونکە ئەو ڕۆژە جاش و سوپایەکی زۆر هاتبوون لەگەڵ کۆمەڵێک فڕۆکەی کۆپتەری بارهەڵگرو جەنگی، برادەران بە دیوێکی تــردا کەوتنە بۆڵەبۆڵ و دەیانوت: ئەم برادەرە لەم دەشــتەدا بەکوشــتمان دەدات، زۆرم قسە پێگەیشــتەوە، کۆمکردنەوەو بۆمباسکردن ئەوان بەهیچ ڕازینین، لەچەم دەبین، پێیان خراپە، جەولە دەکەین پێیان خراپە، ئەی دەبێت چی بکەین؟!

## شۆڕش قەرەهەنجیری و شەهید وریا

هەر چۆنێک بوو پاشئەوەی ئەو برادەرەمان بەڕێکرد بۆ کارەکەو ئێمەش بە بەرنامە گەڕاینەوە بۆ دەوروبەری چەم، دەبوو پاش دوو شەویتر ناڵە لەمەقەڕی ئەمن لەچەمچەماڵ هەڵسێنرێت، کە ئەوە خۆی لەخۆیدا نیشانەی گەشەی شۆڕش بوو ئەگەر ئەنجام بدرایە، ئێمە جەولەکەمان بەشەوێک کۆتایی پێهێناو بۆ سەر لەدوژمن شێواندن گەڕاینەوە دەوروبەری گوندی بۆ ڵقامیش، بەڵام لەئەسکەندەر بەگی نانمانخواردو تێشووی ڕۆژی دواترمان لەکۆڵ بەست و بەنێوانی ڕەبایەکانی سەر جادەی کۆپتەپەو ئاغجەلەردا ڕوومانکردە (قەڵایگان)و لەوێ چووینە گوچوورەکان کە پڕبوون لە ئاودڕی گەورە گەورە. تارۆژی دوایی ئێوارەکەی و شەوەکەیشی چووینە بۆ ڵقامیش کە گوندێکە لەئاغجەلەرەوە دوورەو کەمێک چرە بۆ شەڕی پێشمەرگانە دەستدەدات، ئەو شەوە لەوێ ماینەوەو نەمانهێشت خەڵکی بڕۆن بۆ شار، بۆ ڕۆژی سێیەم چووینە دەوارەکانی بەردەعازەبانی کوردە کۆچەرییەکان، لەوێش بەئاسوودەیی تێرمان نان و کەشک و ڕۆن خواردو بۆ ڕۆژی چوارەم خۆمان خستە چەم و ڕەزەکانی دووئاوان و بەماسی گرتن و خۆشۆرینەوە لەو سەر ڕووبارە ڕۆژەکەمان بەڕێکرد، هێشتا سەعاتێک دووانی مابوو ڕۆژ لەو چەمە ئاوابێت پێشئەوەی بگەینە سوورقاوشان، هێمنە بچکۆلی شەهید کە کاری ئەوەبوو باروبنەمان بۆ تاقەت بکات. دەبوو هەر لەو چەمە بێت هەر کاتێک چووینە ئەوێ بێتە لامان بۆ بەردەست و کاری نهێنی، جا خۆی لاوێکی منداڵکاری چوار شانەی سپی پێست بوو لەدوورەوە دەناسرا، هەمیشە خێرا خێرا هەنگاوی دەناو سەری بەبەر خۆی دەناو دەڕۆیشت، هەر کەسێک بیدیتبایە نەیدەوت ئەمە هیچ کارێکی لە دەست نایەت، بەڵام لەڕاستیدا لاوێکی وشیارو وریاو زیت و بەتوانابوو. ئەوەی بەو دەکرا بە دە پێشمەرگەیتر نەدەکرا، بەڕاستی کادرێکی سیاسی و ئیداری چوست و چالاک بوو لەو چەمەدا چەندان بنکەی ژێر ئەرزی کردبوو، ئەگەر هەموو هێزی عێراق بهاتایە نەیاندەتوانی بیگرن، بەس چەند چرکەیەک پێشتر ئاگادار بوایە، دیمان هێمن هات بروسکەئاسا ڕووی خۆش نەبوو، دەم بەخەندەییەکەی نەمابوو خۆیشی لەکەس نەدا سڵاوی گشتی کردو ئیشارەتی بەمندا، بردمیە لاڕێ وتی: دوێنێ شەو قومبەلە بەشۆڕش و وریا سووردا تەقیوەتەوە، وریا شەهید بووەو شۆڕشیش زامدارەو جوتیاران بردوویانە لەگوندی گورگەیی شاردوویانەتەوە، ڕەنگە سبەی بگاتەوە چەم منیش لەفڵانە شوێن دەواو جێگام بۆ سازداوە.

بەڕاستی هەواڵێکی زۆر ناخۆش بوو، چونکە یەکەم هەوڵی من بوو، یەکەم پۆلی پێشمەرگەو یەکەم جار بوو لەپاش ئاشبەتاڵ کاری وەها بکات، زۆر دڵگران بووم پێشمەرگەکان هەستیانکرد شتێک هەیە بۆیە لێم نەشاردنەوەو بۆم باسکردن، ئەوانیش بەشداری پەژارەم بوون. هەر لەو چەمانەدا جەولەمان دەکرد لەپڕێکدا هێمن وەکو پەری هەواڵهێن گەیشتەوەو وتی: مژدەتان بدەمێ، وتمان چییە؟ وتی شۆڕش و وریا هەردووکیان ماون و شەهید نەبوون، بەڵام هەردووکیان قومبەلەکە سووتاندونی و وریا زۆر مەترسی لێدەکرێت بمرێت، بەڵام شۆڕش تەنیا پێستەکەی ڕەش بووەو دەتوانرێت هەر لێرە چاک بکرێتەوە. کەوتینە سۆراخی دکتۆر، دکتۆرمان نەبوو تەنیا مامۆستا شێرکۆو شێرزاد حافز دوو لاوی خوێندەواری گورجوگۆڵ بوون تەداوی برینداره‌کانیان گرتە ئەستۆو پاش هێنانەوەی زامدارەکان بەپەلە وریامان بەڕێکرد بۆ سەرکردایەتی، فەردە کامان بۆ هەڵبەست و دەستەیەک پێشمەرگەی ئازامان لەگەڵدا نارد بۆ ناوزەنگ و شەویش لەتەلانەوە بەبن ڕەبایەکانی سەر جادەی دوکان کانی خاندا پەڕاندیانەوەو شۆڕش قەرەهەنجیریشمان لەشوێنێکی پەنادا داناو ڕۆژانە ئەم برایانە بەهاوکاری شەهید هێمنە بچکۆل سارێژی زامەکانیان بۆ دەکرد.

هێشتا بەتەواوەتی ماندوومان نەحەسابۆوە کەوتینەوە دانانی پیلانی سەردانێکیتر بۆ دێهاتەکانی ناوشوان و ساڵەیی و ئەنجامدانی زنجیرەیەک کۆبوونەوەی بەپەلە بەجوتیاران و باسکردنی سیاسەتی ی.ن.ک بۆیان.

## جەولەی یەکەم

ئێوارەیەک لەزەرزییەوە بەناو ڕەبایەکانی سەر جادەی گشتی قەڵاسێوکە پەڕینەوە گوندی مامەڵیشـیو لەوێ نانی شـەومان خواردو خەڵکەکەشـمان کۆکردەوە، هەرچەندە زوربەی جوتیارەکان لەخەودا بوون کە ئێمە گەیشتین، بەڵام ئێمە هەر دەبوو دابەش بین بۆ نانخواردن، بۆیە ئەوانیش هەڵسـان و پـاش نانخواردن قسـەمان بۆ کردن و بۆ ڕۆژەکـەی بێئەوەی خەڵکی بزانن چووینە ئاودڕەکانی ئەولای ماڵەکانیانەوە، شـوێنەکەمان چەپەک بوو کەمتر ڕێگای خەڵکی بەسـەرەوە بوو، ئەوسا دوو جیهازی هۆکی توکی سەربازی وردی شـرمان هەبوو، بۆ لەیەکتری گەیشـتن لەگەڵ کەرتەکان یان لەکاتی حەرەسیاتدا قسەمان پێدەکردن. ئێوارەکەی ئەو ڕۆژە بەسەلامەتی ڕزگارمان بوو بەرەو گوندێکیتر بەڕێ کەوتین، لەنیوەی ڕێگا بووین هەواڵی جیهازەکانم پرسی، کاتێکمزانی یەکێکیان بەجێماوە، کەوتمە سۆراغی لای کێ بوو کێ دای بەکێ دۆزیمەوە، برادەرێکی خۆم بەناوی وریا ئاغجەلەری کە لەڕاستیدا ناوی عومـەر حاجی عەلی بوو خەڵکی گوندی بلوکین بـوو، لاوێکی خوێندەواری شـەرمنی ناوسـک ئاوەدان بوو، بانگم کرد وتم: دەبێـت بڕۆیت بیدۆزیتەوە یان نەیەیتەوە لامان! ئەوسـا جیهاز بۆ ئێمەی بێ ئیمکانیات زۆر گرنگ بوو، بۆیە کاک وریا خێرا گەڕایەوەو پاش سـەعاتێک هاتەوە شوێنی دیاریکراو و جیهازەکەی هێنابۆوە.

ئێوارە چووینە گوندی قەسـرۆک ئەوسا هێشـتا شەهیدان ئەحمەد بەگ قەسـرۆکی و ڕەشـید توتە قەلی شەهید نەببوون و شـارەزاو چاوساغمان بـوون، خێـرا دابەشـیانکردین و نانێکـی شـوانیمان خـواردو یـەک دوو تراکتۆریـان بـۆ پەیـدا کردیـن و پێی ڕۆیشـتین بـۆ نزیکی گونـدی کانی ڕەش و لـەوێ دابەزیـن و بەپێ بەنێوانـی ڕەبایەی سـەربازەکانی عێراقدا پەڕینـەوە بۆ شـێخ بزێنی خواروو، شـەو چووینە دەوروبـەری بەرزنجەی سـەروو لەوێ خۆمان لەشـوێنێکدا مەڵاسـداو هەندێک برادەری ڕێکخستن ئازووقـەی دوو ژەمیـان بۆ هێنایـن تا دوای نیوەڕۆ تۆزێـک زوو بوو دوو تراکتۆرمان لەبەرزنجە سەندو بەرەو تورکی و قەرەسالم ڕۆیشتین و لەوێش سەیارەی ئێوارانی لادێ لەشارەوە هاتبوونەوە، سێ سەیارەمان بە (سوغرە) گرت و سـواربووین بۆ گوندی بیرە سـیانی سـەرو و خواروو، کە لەسـەر جـادەی سـەرەکی کەرکوک هەولێـرن. ئەو ناوەش جگە لەقـەڵا گەورەکەی دارەمان و حەسـار جۆرەها ئۆردوگای سـەربازی گەورە گـەورەی لێبوو، ناوچەیەکی سـتراتیژی ئابوری و سەربازی زۆر گرنگی دوژمن بوو. هێشتا ڕۆژ ئـاوا نەببـوو خۆمانکـرد بەهەردوو گوندی سـەرجادەی بیرە سـیانی

ســەرو و خــوارو، خێرا پێشــمەرگە دەوری گوندمان گــرت و باقی چووینە مزگەوتــەکان و خێــرا داوامانکــرد خەڵکــی کۆببنــەوە، یەکەمجاربوو دوای ئاشــبەتاڵ پێشــمەرگە بەچەکەوە بێتەوە ئەو ناوچەیە، بە دە دەقیقە دوژمن دەیتوانــی لەوێ بمــان فڕێنێت، چونکــە ناوچەیەکی دەشــتانییەو دوژمنیش بەهەر چوار دەوریيەوەیتی، بەســەعاتێک بەتەواوی لەسیاســەتی شۆڕشــی نــوێ و ی.ن.ک مــان گەیانــدن، تا ئــەو کاتــە لەزۆربەی ماڵەکان مریشــک ســەربڕابو و ســوور کرابۆوە لەگــەڵ تەماتــەو خەیارو ســەوزەدا، نانێکی پێشــمەرگانەی خێرامــان خواردو خێرا ســواری ســەیارە بووینــەوە، هەر ئێوارەبوو خۆمان هەڵدایەوە شێخ بزێنی و تا بەرزنجەی سەروو سەیارەکانمان بردو بۆ خەوی بەیانی چووینەوە کارێزەو تورکمان باخ. جەولەکەمان هێندە ســەیرو پەلەو نەترســانە بوو دوژمن بڕوای بەهەواڵدەرەکان نەکردبوو کە پێشــمەرگە وەهای لێهاتبێت بڕواتە ناوجەرگەی ســوپاکەیەوەو ئاوا بێ تۆز دەرباز ببێت.

ڕۆژی دوایی بەپەلە خۆمان گەیاندەوە قەڵاسێوکەو دەوروبەری سوتکەو مایلە، پێشــمەرگەکان ئاهێکیان هاتەوەبەر، ئەوە دوو جەولەی ناوچەکەو ناو خەڵکەکە بکەین و زیانیشمان نەبوو، وردەوردە لەگەڵ پێشمەرگەکان شارەزای نەخشــەکەی مــن بوویــن پرتەوبۆڵە کەم ببوو، نەخشــەمان دروســتکردنی دەستەی پێشمەرگەی هەر ناوچەیەک خۆی بوو. کۆمکردنەوەو پێشنیارمکرد کێ دەتوانێت پێشمەرگە لەناوچەکەی خۆی پەیدا بکات ئاگادارم بکاتەوە، زۆرم حەزدەکرد ناوشوان مەفرەزەیەکی بۆ خۆی لەکوڕی شوانی هەبێت، بۆئەوەی شــەو و ڕۆژ لەناویاندا بین و شــۆڕش لەوێ دەســت پێبکەن. حەزمدەکرد بۆ دەوری ســاڵەیی، بۆ عەلی بەیانیەکان دابمەزرێنم کە لەشۆڕشــی پێشوو زۆرم دەناسین و پێشمەرگەشیان هەبوو. چاوم دەگێڕا بۆ کۆنە ناسیاوەکانی خۆشیاندەویســتم، هەوڵمدا لەڕێ تەپە کوڕەبییەکانەوە دەستەیەک بۆ دەوری تۆمارو مام ڕەش دروســت بکەم، ئەمە لەمێشکمدا دەخولایەوەو دەمزانی تا پێشمەرگەی ناوچەکە دروست نەکەین شۆڕشمان پێ نابڕێتە ئەو ناوچانەی کە پێشمەرگە بەئاسانی دەستی پێناگات. هەرچەندە ڕێکخستنی کۆمەڵە لەهەموو گوندێکــدا جێگای خــۆی کردبۆوە، هەروەها یەکێتی نیشــتمانیش وردەوردە ڕێکخســتنی خــۆی دامەزراندبۆوە، ئــەو ڕۆژانە تاکەکــەس دەوری دەبینی بەمەرجێک لەناو جەماوەردا کەسایەتی کۆنی نیشتمانپەروەرو پێشمەرگانەی هەبووبێت، منیش لەشۆڕشــی پێشــوو لەســاڵەیی و لەشــوانەکان و لەشێخ بزێنی و لەقەڵاسێوکەو لەسورداشدا ناســرابووم، تارادەیەک خەڵک بڕوایان پێمهەبوو، بۆیە بەشــێوەی فەردی دەورم دەگێڕا بۆ هاتنی لاوی نوێ بۆ ناو پێشمەرگەو دەستبەجێ کارم دەدانێو دەمناردنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان.

## بکوژەکانی من

بیروباوەڕەکەم تا دەهات زەمینەی چەسپانی زیادیدەکرد، شەویکیان لەپشتی ماڵەکانی سوتکەوە خەوتبووین لەسەر ڕیگای ماڵە کوردە کۆچەریەکانی پشتی گوندی سوتکە، شەو ببوو بەنیوە، هاوین بوو هیشتا سەرما ڕیگای لینەدەگرتین لەدەرەوە بخەوین، حەرەسەکە بەدەنگیکی بەرز هاواریکردو میلی تفەنگەکەی هینایەوەو وتی: ئیوە کین؟ تیکڕامان خەبەربووینەوەو خۆمان نووساند بەزەوییەکەوە، هاواریانکرد خۆمانین خۆمان خیرا خیرا خۆیان بەناسیاو دەدایە قەڵەم، گویم لیبوو وتی: هاتووین بۆ لای مام عەلی و ئیمە خەڵکی عەلی بەیانین، ئای بەخەبەریکی چەند خۆشمزانی، دەنگی یەکیکیانم ناسی وتی من حسین فەقێ محەمەدی عەلی بەیانیم و هاتووم بۆ لای مام عەلی بچکۆل. بانگمکردن هاتنە پیشەوە سێ چەکدار بوون، حسینم ناسییەوە ئەملاولام ماچکردن و بەخیرهاتنی گەرمم لیکردن. لەو شاخە بووین هیچ نەبوو تا بیاندەینێ نەئاو نەچا نەڕاخەر هەر لەتەک خۆمەوە داوام لیکردن هەلاژین تا بەیانی زوو دەڕۆین و سبەی قسە دەکەین. من لەخۆشی ئەوەی هەوێنی دەستەیەکم بۆ پەیدابوو نەمدەزانی چۆن خەو لەخۆم بخەم، ئەوانیش لەخۆشی ئەوەی ئیمەیان دۆزیوەتەوە نەدەخەوتن، بەڵام هەر چۆنیک بوو بۆئەوەی برا پیشمەرگەکانیترمان خەویان لینەزڕیت من پاش شەو باش نەمدواندن و سبەی زوو چووینەوە بۆ چەمی ڕەزان. لەوێ دەستمانکرد بەخۆشۆرین و مەلەکردن و جلشۆرین، هەندیک مژومورەی هەنارە قلیشاوی ناو پەناو پەسیرمان کردو دانە دانەش گویزمان دەدۆزیەوە.

ئەو سێ برادەرە بەهاریان بۆ هینامە ئەژنۆ، ئەوسا نەشۆڕش چەکی هەبوو نەخەڵکی، نەمزانی چۆن ئەم سێ برادەرەی من بەسێ کلاشینکۆفی چاکەوە هاتوون و چۆن بەم شەوە ئیمەیان دۆزییەوە؟ هەندیک شت گلۆپی دادەگیرساند، چونکە دوای ئاشبەتاڵ و پاش شۆڕشی پیشوو خەڵکی لەترسی بەعسی و لەبەرخاتری ئیشوکارو بەدەستهینانی پارەو ژیان گۆڕابوون و نەخشەی زۆلانەی بەعسیان جیبەجیدەکرد، لەلایەکیترەوە دەموت لادێ سەبارەت بەئاستی زانیاری زۆر دوورترن لەخیانەت و ئەمانەش لەپیشتردا مریدو دۆستی بنەماڵەی شەهید عەلی عەسکەری و دۆستی نزیکی خۆشمبوون لەکاتی مەلایی و جەلالیدا.

دوو ڕۆژ بوو ئەو برادەرانە هاتبوون، شەو چووینە گوندی سرد، کاتیکمزانی نامەیەکی کۆمیتەی ئاگر هات و خویندمەوە، دەڵێ "حسین و عومەر هەیتەو قادر عەلی بەیانی هەرسیکیان لەلایەن بەعسەوە

نێردراون و یەکێک لەبرادەرەکانی خۆمان چەکەکانی بۆ کڕیون لەڕەحیمئاوای کەرکوک بەوەندە". نامەکە لەلایەن یەکێک لەهاوڕێ زۆر نزیکەکانی خۆمەوە نووسرابوو، لام سەیر بوو دونیا بۆچی وەها گۆڕاوە، تۆ بڵێی ئەمە ڕاست بێت یان نا؟ سەرنجی هەندێک ناکۆکی ناو هەندێک پیاوی عەشایەری ناوچەکەم دەدا لەوە دەترسام لەژێر ئەو کاریگەریدا ڕاپۆرتی غەرەزی شەخسی هاتبێت، چونکە دوژمن نەیدەویست پێشمەرگە گەشە بکات و بۆ ئەو مەبەستەش ناکۆکی نێوانی جوتیارانی بەکاردەهێنا. هەر جوتیارێک ببوایە بەپێشمەرگە یەکێکیتری ڕاستدەکردەوەو ڕاپۆرتێکی ئەوەندە شەیتانانەی دەنووسی بڕوابکەیت ئەوە پیاوی دوژمنەو دەبوو هەڵسی خێرا بیکوژیت و لاشەکەی بخەیتە کەندڕە شیویکەوە، کە ئەمەش لای من بەکارێکی هەڵەشەو ناڕاست دەژمێردرا، بۆیە زۆر گوێم بەڕاپۆرتی هاوڕێکانم نەداو هەر ئەو شەوە هەرسێکیانم بانگ کردە دەوری پێشمەرگەکانیتر، لەکاتێکدا تەنیا یەک حەرەس هەبوو ئەویتری خەوتبوون، پێموتن: دەنگ هەیە ئێوە بۆ ئەوە هاتوون من بکوژن و بگەڕێنەوە، گوایە حکومەت ئێوەی ناردووە، کڵاشینکۆفەکەم لەسەر ڕانم دانابوو ئەوانیش هەر یەکێکیان لەبەردەممدا بەچەکەوە گوێیان بۆ دەگرتم. زۆرم قسە بۆ کردن و لەکۆتایدا وتم: ئەگەر یەک زەڕە پیاوەتیتان تێدایە دەی من تەنیام و ئێوەش سێ دەست بکەنەوە، هەرسێکیان وتیان: بەوەندە سوێندو قورئانە ئێمە لەدڵسۆزی هاتووین و هیچ نیازێکی خراپمان نییە، بەوە کۆتاییمان بەقسە هێناو ئەوان چوونە پەنایەکەوە هەڵاژان و منیش چوومەوە دەوری حەرەسەکانی خۆم، نەمهێشت بزانن لەکوێوە خەوتووم، هەر لەو ڕۆژەوە کە نامەکە هات کەوتمە گومانەوە، بەڵام بەڵگەی بڕوا پێهێنراوم نەبوو، بۆیە ڕۆژانەو شەوانە چاودێریم دەکردن.

## شەوی کوشتنی من

شەوێک لەســەر زێی دوکان بەرامبەر گوندی کڵێسە شوێنێکە پێیدەڵێن بەرشاخ، پەنایەکی چڕبوو بۆ ئەوەی جاش دەستی نەماندگاتێ، لەوێ بڕیاری مانــەوەو خەومــان دا، مانگا شــەو بوو هەر ســێ عەلی بەیانیــەکان هاتنە دەوروپشتم و خۆیاندا بەئەرزاو دەستیانکرد بە قسەی زلزل و دەیانویست دڵنیــام بکەن و نیازیشــیان هەبوو لەدەورەی من بخــەون، منیش هیچ وام نیشان نەدا گومانیان لێدەکەم هەتا ئەوان بەدرۆ خۆیان خستە خەو. ئەوسا بەهێواشی دوورکەوتمەوەو پێشــمەرگەیەکم لەگەڵ بوو ناوی شێخ سەلام بوو بەخزمایەتی دەگەیشــتینەوە یەکتری، لەڕاستیدا سەلام زۆر چاودێری دەکردم، کە هەڵساین وتی مامە ئەم ئێوارەیە لەم سێ برادەرە کەوتوومەتە گومــان، بۆچــی وا هاتنە نزیکی ئێمــەوەو خۆیان کردە خەوتــوو؟ کە ئێمە هەڵساین ئەوان نەخەوتبوون، منیش وتم: ئەوەندە لای خۆت گەورەی مەکە، بەڵام با لەشــوێنێکدا بخەوین ئەوان نەزانن، شــوێنێکی دۆزییەوە بەوشــکە کەڵەک هەڵچندرابوون بۆ ژێر دەواری کۆچەری و پوشێکی زۆری تێدابوو لەوێدا خەوتین. چەند ڕۆژێک لەم حاڵەتە دەروونیەدا دەژیاین، لەم ماوەیەشدا چەندان نامەی یەک لەســەر یەکی دۆست و براو بەشی ڕێکخستنی کۆمەڵە لەســەر گومــان لێکردن لەمانەم بــۆ دەهات، بەڵام بەڵگە هــەر ڕاپۆرتەکان بوون، نەمدەتوانی دەســتبەکاری سزایان بم، چونکە وەکو وتم زۆر نامەی تۆڵەســەندنەوە ســاز دەکــرا، بــاش بــوو زۆری نەخایاند خۆیــان ماوەی کارەکەیان تەواو ببوو، لەهەوڵی کوشتنی هەندێک پێشمەرگەدا سەرکەوتوو نەبــوون و شــەوێک هەڵهاتن و چوونەوە ئاغجەلەرو پاشــان گەیشــتنەوە ڕەحیمئاوای کەرکوک. لەوێ عومەر خۆی بەکوشت دا، پاش ماوەیەکیتریش قالــە خۆی دووچاری موشــکیلە کــردو ئەویش کوژراو ئــاگاداری وەزعی حسێن نیم.

## گوندی مام ڕەش و یەکەم شەڕی پێشمەرگانەی ناو گوند

سەرەتای مانگی ١٠ی ١٩٨٠ ئەوکاتانەی هێشتا هێزی پێشمەرگە وەهای لێنەهاتبوو بەڕۆژی ڕووناک بڕۆنە ناو گوندەکانی کوردستان، بەڵکو زیاتر لەشوێنە شاخاویی و چڕو دارستانەکان ڕۆژگارمان بەڕێدەکرد، ئێواران پێش ڕۆژئاوابوون بەرەو یەکێک لەگوندەکانی ناوچەکە دەکەوتینە ڕێ بەنیازی دابینکردنی نانی ئێوارەو نانی ڕۆژی دواتریش، ژیانمان بەند بوو بەدەرامەتی خەڵکی گوندەکانەوە.

دووی مانگی ١٩٨٠/١٠ نەخشەمان دانا بەمەبەستی دروستکردنی کەرتێکی نوێ تا بۆ هەرێمەکەمانی زیادبکەین، بۆ ناوچەی شوان و شێخ بزێنییەکان، بۆ ئەو مەبەستەش شەهید حەمید کەریم (پشتیوان) کەرکوکیمان دەستنیشان کردبوو، کە پێشمەرگەیەکی قارەمان و دڵسۆزبوو، شارەزای کاری پێشمەرگانەی لێدەو بڕۆ بوو.

تازە پێشمەرگە لێرەو لەوێ بەڕۆژ خۆی دەردەخست، ئەوکاتانە کۆپتەر بەڕۆژی ڕووناک چاوی مرۆڤی دەردەکرد، چەندجارو لەچەند شوێنێک پێشمەرگەیان هەڵدەگرتەوە، بۆیە هەر دەبوو بەشەوان یاخود ئێوارانێکی درەنگ بجووڵێین، ئەوسا چەکی دژی تانک و کۆپتەرمان نەبوو جگە لەوە لەسنورەکەدا ئەگەر ئار بی جیەک بە گولەیەک دوانەوە هەبووایە ئەویش نەماندەوێرا بیتەقێنین، بەڵکو بۆ لێقەومان هەڵماندەگرت. ئێوارەی ١٩٨٠/١٠/٣ لەسورقاوشانەوە بەڕێزو مەسافە بەرەو گوندی هیچجار نەدیو، عەسکەر کەوتینەڕێ، شەهید فەرهاد بەهۆی ئەوەی خەڵکی عەسکەربوو بەسەر ماڵ بەماڵدا دابەشیکردین، دوای نانخواردن بەنهێنی بۆ نوستن بەرەو ماڵی خوا کەوتینەڕێ، برایانی کەرتی ٣ی تازە دروستکراو لەشەوق و زەوقی ئەوەدابوون لەئاگری باوەگوڕگوڕ نزیکدەبنەوەو لەوەلا کەرتی پێشمەرگەی کەرکوکیەکان بە بەرنامەی نوێی خۆیانەوە دەجولێن. شەهید پشتیوان دەمی یەکی نەدەگرت لەخۆشی ئەوەی ئەرکی نوێی پێسپێردراوە. هەرچۆنێک بوو ئامادەی ڕۆیشتن بوون و لەبەرهەیوانی مزگەوتەکە ڕێزبوون، هەمووومان بەئەملاولا ماچکردن ڕێزمان پێوەگرتن، لەماڵی نەبوو ماڵئاوایمان لەیەکتری دەکرد، ئەوان ڕۆیشتن و ئێمەش بەخۆشی ئەوەی گەشەمان کردووەو لقی نوێمان زیادیکردووە سەرخەوێکمان شکاند، تا کاتژمێر چواری بەیانی، پاشان هەڵساین وەکو هەموو ڕۆژەکانیتر بەرەو شوێنی چڕو دوور لە ئاوایی و بەدەم خەوەنوچکەو لەڕێگاکانەوە گوندەکەمان جێهێشت، ڕووی چاومان زیاتر لەدەوروبەری ئاسمان و شوێنی باڵەفڕەی کۆپتەرو دەنگی دوورە تەقەبوو، چونکە دڵنیابوین ئەمڕۆ یان سبەی دوژمن دەکەوێتە

پشـكنینی ناوچەكە بۆ هاوڕێكانمان، ئەوسا یەكتریمان زۆر خۆشدەویست، مان و ژیانمان بۆ كوردو ئازادی نیشتمانەكەمان بوو، هاوڕێی ڕاستەقینەی بێ فرتوفێڵی یەكتری بووین، سەركەوتنی ئەوان و تێكشكانیان هی هەموومان بوو.

ڕۆژی ٤ مانـگ هاوڕێكانمـان بـۆ جەولـەو كۆبونـەوە گونـد بەگوند ڕۆیشـتبوون، خەڵكی خۆشەویسـتی ناوچەكە گرتبوونیە ئامێز. چووبوون بـۆ گوندەكانـی پەڵكـەڕەش و مەحمەخان و گـەزەڵان و گورگەیی و بنەو بنگردو بەرەو خوار بۆ چیمەنەكان. ئێوارەی ١٩٨٠/١٠/٥ دوا كۆبونەوەیان لەچیمەنی گەورە كردبوو، بەتەواوەتی سیاسـەتی شۆڕشی نوێ و یەكێتی نیشـتمانیان بۆ بـاس كردبـوون، پاش نانخواردنـی ئێوارە بـەرەو دەڵۆو پیریجـان و قەفـارو بەبەردەمی ماڵەكانی تۆمـاردا هەڵگەڕابوونەوە بۆ مام ڕەش، زۆر لەجـادەی كەركوك دووركەوتبوونـەوەو پێیانوابوو بۆ ڕۆژی دواتـر ١٠٠ لـە ١٠٠ دوژمـن دەكەوێتە پشـكنین، بۆیە هەر بەو شـەوە تا گونـدی مام ڕەش ڕانەوەسـتابوون، بەڵام زۆڵە كوردە جاشـەكان چونكە لەكاتـی خۆی چەند مانگێك لەناو هێزی پێشـمەرگەدا ژیابوون، شـارەزای شـێوەی هەڵسـوكەوتی كاری پێشمەرگانەی ئەوسـا بوون و شوێن پێیان هەڵگرتبـوون، پێش كاتژمێر چـواری بەیانی دەوری گوندی مام ڕەشـیان گرتبوو، یەكەم دەستڕێژ لەشەهید مەلا ئەحمەد مامڕەشی برای پێشمەرگەی دێرین و دڵسـۆز مەلا وەیسـی كرابوو، هەر لەشـوێنی كەمینەكاندا گیانی سـپاردبوو، پاشان ئێشـكچیەكان لەمزگەوتەكەی مام ڕەشـەوە هاوڕێیان هەڵدەسـتێنن و تەقـە گـەرم دەبێت. كـە ڕۆژدەبێتەوە دەبینـن گوندی مام ڕەش بەهـەر چـوار دەورەدا ئابڵۆقـەدراوە، ڕێـگای دەربازبـوون تەنیاو تەنیـا یـان بەرگـری لەخۆكردنە یان شـەهید بوونەو ڕێگای سـێیەم نییە، ئەوسـا پێشـمەرگە بەڕاسـت دەیوت كوردسـتان یان نەمان، بەڵێ كوڕانی ناوشـوان و كەركوكی و كوردستانی، كوردسـتان یان نەمانیان هەڵبژاردو تاكو سـێرەی تفەنـگ هەڵگیرا بەرگرییان كردو دیـوار بەدیواری ماڵان بە بێڵەقان و بێڵ و پاچ كون دەكردو سەنگەریان نوێدەكردەوە، هێزە فشۆڵ و ڕووڕەشەكەی دوژمنی داگیركەر دەوری گوندیان بەرنەدا تاكو ئێوارەیەكی درەنگ، هاوڕێكانیان لەكەرتی هەرێم لەشاخەكانی پشتی گوندی عەسكەرەوە هەواڵیان لەڕێكخسـتنی كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی شـاری كەركوكی هەمیشـە تێكۆشـەرەوە بـۆ دێت و بێ ڕاوەسـتان دەچن بەهانـای هاوڕێكانیانەوەو ئابڵۆقەكـەی دوژمـن تێكدەشـكێنن و هاوڕێكانیان دەگرنەوە باوەشـیان و پێیان شـاد دەبنەوە. بەداخەوە زۆر زۆر بەداخەوە قوربانی ئەم داسـتانی سـەرەتایە نوێیەی هێزی پێشمەرگە لەشەڕی ڕووبەڕووبوونەوە، لەشەڕی

نـاو دێدا کە بـۆ یەکەمجاربوو ڕۆڵــە ئازاکانی کەرتــی ٣ هەرێمی دووی یەکێتی نیشتمانی دایانهێنا، کەم نەبوو، هێشتا داستانی پێشمەرگە ئازاکانی بەری کۆیە بەسەرپەرشتی پێشمەرگەی ئازا مەندە و فەرەج ڕووینەدابوو، شــەڕی ڕووبەڕووی شــەیتانبازێڕی سورقاوشــانی کەرتی هەرێمی دوو ڕووینەدابــوو، کە پۆلێک لاوی خوێندەواری کــەم ئەزموون دەوریان تێدا گێــڕاو ئازایانەش لوتی هێزی دوژمنیان شــکاند، شــەڕەکانی ژاڵەو حەمک ڕوویان نەدابوو کە داســتانێکی زۆر بێ وێنەیان داهێنا. بەڕاســتی داستانی قارەمانانــی کەرتــی ٣ هەرێمی دوو، داســتانی ڕۆڵــە پاڵەوانەکانی کوڕانی کــوردی ناوچــەی کەرکوک بوو. ئــەوەی لەبیر ناکرێت مەرگــی ئەو ڕۆڵە دڵسۆزانەی کەرتی ٣ی هەرێمی دوو بوو کە بریتیبون لەم قارەمانانە:

١. شەهید حەمید کەریم کەرکوکی (پشتیوان)، فەرماندەی کەرت

٢. کادری جوتیاری هەڵکەوتوو تاهیر بابە قەمەری.

٣. مەلا ئەحمەد عەودل مام ڕەشی

٤. مەناف تالیب چالاوی پێشمەرگەی ئازاو دلێر.

٥. بیلال جەلال چالاوی ڕۆڵەی بەئەمەکی شوانی

زۆر بەداخــەوە خائینــەکان و زۆڵــە کــوردە جاشــەکان بەزامــداری شــەهیدان بیــلال و مەنافیان گرت و بزماریان بەســەر ســەری یەکێکیاندا داکوتیبوو، هەر لەڕێ یەکێکیان شــەهید کردبوو، ئەویتریشیان بەزیندویی گەیانــدە چەمچەماڵ و لەوێ شــەهیدیان کرد، نەفرەت لەهەرچی خیانەتکار هەیە، سەری بەرزو نەمریش بۆ دڵسۆزی نیشتمانپەروەران و تێکۆشەرانی کوردایەتی.

ئەوەی دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە نەمری بۆ شەهیدەکانمان و بۆ پێشمەرگە قارەمانەکانــی کەرتــی ٣ی هەرێمــی دووی ئەوســای یەکێتــی نیشــتمانی کوردستان.

جگە لەپێنج شــەهیدەکە ئەوەش ناوی هەموو ئەو تێکۆشەرانەی کە لەو داستانە داهێنەرانەیەدا دەوریان بینیوە:

١. سالار بۆگدی

٢. مامۆستا شێرکۆ عەسکەری

٣. مەلا وەیسی عەودل برای شەهید مەلا ئەحمەد

٤. شێرزاد عەبدولحافز کە پاشان و لەداستانێکیتردا قاچی لەدەست دا.

٥. سالّح سەیدانی

٦. عەبدولّا سور بۆگدی

٧. فەرهادەسور

٨. شەهید نامق شکور (پێشرەو)

٩. شۆڕش قەرەهەنجیری، سەرتیپی پێشووی ٢٥خالّخالّان.

١٠. محەمەد عەلی ئەحمەد (ئامانج)

١١. سیروان هاوڕێی شەهید پێشڕەو

١٢. -عەلە ڕەش تەپەکوڕە کە پاشان و لەداستانێکیتری پێشمەرگانەدا لەسنووری جەباری شەهید بوو.

پێشمەرگەکانی کەرتی ٣ بریتیبون لە ١٧ کەس، کە پێنجیان شەهیدبوون.

ڕۆژانە شۆڕش ڕوو لەگەشەکردن بوو، ئا لەو کاتانەشدا شەڕی نێوانی یەکێتی و حسک، یەکێتی و پارتی، ناوە ناوە ڕوویدەدا، بەلّام شەڕەکان بچووک بچووک و کەموکورت بوون. زۆرجار دەبوو لەناوچەی شوانەوە پێشمەرگە بەرین بۆ ناوزەنگ و زەلّێ بۆ پارێزگاری لەبارەگاکانی سەرکردایەتی، هەر لەم کاتانەدا هەندێک چەکمان لەسەرکردایەتیەوە بۆ هات بەگەورەترین سەرکەوتنمان دەزانی، چونکە چەکمان کەم بوو، پێشمەرگەمان زۆر بوو، چەکیشمان بۆ نەدەگیرا ئەوە وای کردبوو هەمیشە کەرتی (هەرێم) بریتی بوو لە (١٨)چەکداروو (٢٠)و بەرەو ژوور کە بێ چەک بوون و بۆ زۆریان لەخەلّکانی ئەندازیارو مامۆستاو خوێندەواربوون زۆرجار کە دووچاری شەڕ دەبووین دەبوو ئەوانە هەمیشە بخەینە دوای خۆمانەوەو ئاگاداریان دەبووین کە بە دیل نەگیرێن. بۆ نموونە کە دووچاری

شەڕی ڕۆژی (١٩٨٠/١٢/٢٢) نێوان عەسکەرو سوتکە بووین بەشێکی زۆری بێ چەکەکانمان لەماڵە کوردەکاندا دانابوو کەچی سێ کۆپتەری جەنگی هاتن و یەکسەر چوونە سەر ئەوان و کارێکیان پێکردن بەسودفە ڕزگاریان بوو، لەکاتێکدا چەکدارەکان دووچاری ئابلۆقەی بەهێزی سەربازو جاش ببووین و شەڕی مەرگمان دەکردو هەر لەو شەڕەدا بەشەو ڕزگارمان بوو. سێ شەهیدو چەند زامدارمان دا، بەڵام تا بێ چەکەکانمان نەهێنایەوە خەتی کشانەوە مەیدانی شەڕەکەمان بەجێنەهێشت، هەر چەندە لەئێوارە درەنگانێکدا لەپاشەڵی ئەو هێزەماندا کە هێرشی هێنابوو بۆ گوندەکانی گۆپتەپەو هەیدەر بەگ و عەسکەر.

## چەککردنی لەشکری ئیسلامی

کاتێکمانزانی ئێرانیەکانیش هێزێکی کوردیان پەیداکرد بەناوی (لەشکری ئیسلامی کورد)ی (حاجی شێخ قادرو عەباس شەبەک) سەرپەرشتییان دەکردن، زۆرجار داوامان لێدەکردن با بەیەکەوە پەلاماری بنکەی سەربازی و جاشی ناوچەکە بدەین، بەڵام ئەوان چونکە مانگانەی چاکیان هەبوو چەکی نوێو چاکیان هەبوو وەکو (R.P.G) و(B.K.C)و کلاشینکۆفی بێ قۆناغی چاک هاوکاریان نەدەکردین و زۆر فەرماندەی کەرت و دەستەیان لێهەڵگێڕاینەوە. ببوون بەهۆی لاوازی هەرێمەکەمان، ڕۆژگارێکی زۆری نەبرد بنکەیەکی گەورەیان لەسەرگەڵوو بەرگەڵوو داناو ژیانێکی نوێی چاکیان بۆ چەکدارەکانیان دامەزراندو جیهازێکی ڕاکاڵی گەورەشیان لابوو، سەعات سەعات لەگەڵ تاراندا قسەیان دەکردو هەندێکیشیان پارتی بوون، بەو ناوەوە هاتبوونە سنوورەکە. لەشکری ئیسلامی زۆر مەغروورانە کاریاندەکردو وەکو گۆمێک ئاویش بوون کە ماسی و سەرەمێکوتەو بۆق و قرژاڵ و کیسەڵیشی تێدابێت، ئەوانیش پڕبوون لەخەڵکانی سەر بەعێراق و بەئێران و بەسوریاو بەلیبیاو بەپارتی و بەڕێکخراو و پارتە سیاسیەکانیتری کوردستان، پارەو چەک کۆیکردبوونەوە، لەهەڕەتی گەشەکردندا بوون یەکێتی پەلاماریدان، لەکاتژمێری سفرداو لەماوەی یەک دوو کاتژمێردا چەند هەزار چەکداریان لەچەک داماڵدران و هەندێک کوشتاریش لەهەردوولا ڕوویدا، بەوەش ساحەی یەکێتی فراوانتر بوو ئەو چەکانەش کەوتنە شانی ئەو پێشمەرگانەی کە بەدڵسۆزییەوە پەلاماری دوژمنیان دەدا، ئەم چالاکییە هەنگاوێکی چاک هەرێمەکانی بردە پێشەوە، بەوە ژمارەی پێشمەرگەش چاک گەشەیکرد، ئەوانەی پێشتر دەبوون بە لەشکری ئیسلامی، بوون بە پێشمەرگەو چوونە سەنگەری دژی داگیرکەرانەوە.

# سەرەتای دروستبوونی پەیوەندی من و ڕووناکی هاوسەرم

دوای ئـەوەی لەزیندان ئازاد بووم و چوومە بارەگاکانی سـەرکردایەتی شـۆڕش و بـووم بەپێشـمەرگەو پێشـئەوەی مـن بگەمـە سـەرکردایەتی، دەستنیشـان کرابووم بۆ فەرماندەی هەرێمی دوو، کە ئەوسا کەرتی یەک و کەرتـی دووی هەبوو، لەبارەگاکانی سـەرکردایەتیەوە ڕاسـپێردرام بڕۆم کارەکەم وەربگرم، هەروەها کۆمەڵێک برای تێکۆشـەریان بۆ دەستنیشان کـردم لەگەڵمـدا بێنەوە ناوچەکەو بەو جۆرە ڕۆیشـتین، هاوڕێ شـەهید بیسـتون عەسـکەری، پێشـنیاری بۆ کردم کە من هەوڵ بدەم بەزووترین کات ژنبهێنـم، چونکە من دەبم بەلێپرسـراوی خەڵکی ناوچەکەو ئەگەر ژنم هەبێت زیاتر جێگای ڕەزامەندی خەڵک دەبم، منیش پێشنیارەکەیم لاپەسەند بـوو، بەڵام هیـچ بەرنامەم نەبوو، کەسێکیشـم دەستنیشـان نەکردبوو کە بیکـەم بەهاوسـەری ژیانـم، چونکـە دواڕۆژی من ڕۆشـن نەبـوو، بۆیە نەمدەویست کەسێک بەخۆمەوە سەرگەردان بکەم، بەڵام کە هاوڕێ بیستون پێشنیاریکرد منیش پەسەندم کرد، هەروەها وتی لەناو ڕێکخستنی کۆمەڵەدا چەنـد خوشـکێک هەن قسـەیان لەگـەڵ دەکەین و لەگەڵ کامیـان گونجان پاشتر قسـەکردن و هەوڵ لەگەڵ کەسـوکاری دەدەین. لەڕێی بێستونەوە، لەگـەڵ هـاوڕێ ڕووناک بەیەکتر ئاشـنا بووین و دووبەدوو قسـەمانکرد، مـن هەمـوو ڕاسـتیەکان و بۆچوونی خۆمم لەسـەر ژیـان و دەوروبەرو کۆمەڵـگاو ئەرک و فەرمانی خۆم، بۆ باسـکرد، بـەوردی تێمگەیاند کە من دەسـت لەخەبـات هەڵناگرم، پاشـان سـەروەت و پارەو ماڵـم نییە. گرتن، شـەهیدبوون، دەربـەدەری، هەموویم لەڕێیە، تەمەنم لەتۆ زۆرترە، سـەرم ڕووتاوەتەوە، زۆر وردە بابەتیترم بۆ باسکرد، ئەو یەک وەڵامی هەبوو، وتی: سـوپاس بۆ ڕوونکردنەوەکانـت و زۆریانم لێدیارە، ئەگـەر باوک و دایکم ڕازیان لەسـەربێت من هیچ شـتێکم نییە، چونکە هەسـتدەکەم تۆ بۆ کورد زۆر ماندووبویـت و منیـش یەکێکم لـەو کچانەی ئاواتمـە کۆمەڵگا ڕێگام بدات و چەکی پێشمەرگایەتی هەڵگرم و شانبەشانی پێشمەرگە بۆ ڕزگاری گەل و نیشـتمان تێبکۆشـم، هەروەها دەمەوێت بۆ تۆ خـۆم تەرخان بکەم تـا هـاوکاری سـەرکەوتنت بم لـەو خەباتـە پیرۆزەماندا. مـن بەوەندەش وازمنەهێنا لـەڕۆژی ١٩٨٠/٦/١٠ لەچەمی هەنارانی سورقاوشـان، لەکاتی سەرگەرمی یادی کۆمەڵەدا بووین، جارێکیتر قسەم لەگەڵ کردەوە، ئەمجارە بڕیارمان دا لەگەڵ شێخ مەحمودی باوکی قسە بکەم، کە ئەویش لەیادەکەدا ئامادەبـوو، وەڵامی باوکی ئەوە بوو وتـی: ڕووناک خۆی خاوەنی بڕیارە، پاشـئەوەو لەهەمـان شـوێن چەپکێک لەگەڵای ناسـکی دارە ڕەشـی بۆن خۆشم، دروستکردو کردم بەدیاری و لەجیاتی گوڵی سوور پێشکەشم کرد،

ئەمەدوای چوار پێنج جار یەکتری ببینین و هەڵسەنگاندن لەنێوانی خۆماندا، خــەزورم مەرجێکی هەبوو کە تا پایز نەیگوێزمەوە، ســێ مانگی مابوو بۆ پایــز، هــەر لێم نەدەڕۆی، بۆیــە زووزوو بەهەرێمەکەمــەوە دەچومەوە بۆ گوندی عەســکەرو دەبووم بەمیوان و توزێک دڵم ئــارام دەبۆوە، لەیەکێک لــەو جارانەدا دوژمن بۆمان هاتوو شــەو دای بەســەر گوندەکەماندا، ئێمە دەربــاز بووین، بــەڵام ڕووناک لەماڵی مام ســەلمان کــە جوتیارێکی زۆر هەژاری گوندی عەســکەر بوو، پەنادراو نەیانهێشت دوژمن دەستی لێبگیر بێت، ڕۆژێکی تاڵبوو، هەتا هەواڵی سەلامەتی ڕووناکم پێگەیشتەوە، چونکە هاتنی هێزەکەی دوژمن بۆ گوندی عەسکەر بۆ گرتنی ڕووناک بوو، چاومان لێبوو ماڵەوماڵ لێدەگەڕان.

پایــز هات بــەڵام پەریشــان بــووم، مانگــی ١٠/١٩٨٠ چــووم بەدوای مامۆســتا مەلا مەحمودی دانیشــتوی گوندی کلێســەی بەری کۆیە، لەماڵی کاک ڕەســوڵی کوڕی لەچەمی سورقاوشان بوو، نەمانهێشت کەس ئاگادار ببێــت، بانگمانکــرد بۆ نــاو ڕەزەکانی مــەلا ئەحمەدی بۆڵقامیشــی و لەپاڵ توترکەلانێکــدا لێکــی مارەکردین بەشــاهیدی کاک ڕەســوڵ، کــە لەئەنفالدا خــۆی و ماڵومنداڵی تێداچوون، شــێخ فەرهادی ئامۆزای ڕووناک و شــێخ مەحمودی باوکی ڕووناک. مامۆستا پرسیاری کرد کچم تۆ چی داوادەکەیت لەم پیاوە بۆت بکات؟ لەوەلامدا وتی هیچ، پاشــان ئەی چەند مسقاڵ ئاڵتون پێشــەکی و چەند لەدواتر؟ وەلام هەر هیچ، مامۆســتا فەرموی نابێت کچم، ناچار بە ٥ مسقاڵ کۆتایمان بەپرسیارەکانی مامۆسا هێنا. بۆ شەو کە دنیا تاریکبــوو چوینەوە گوندی عەســکەر، هەرێم لەوێ بوون، ئەو شــەوە دڵم زۆر خۆش بوو، خواخوای ئەوەمان بوو زوو ڕۆژ بێتەوەو بەرەو بنکەکانی ســەرکردایەتی بــەڕێ بکەوێن، ئەگەرچی کە دوو ڕۆژ بوو بروســکەیەکی ســەرکردایەتی هاتبــوو داوای لێکردبووین هێزەکەمــان بەرین و بڕۆین بۆ ناوزەنــگ لەبەرئەوەی هەندێک هێــزی ناوخۆیی دەوری بنکەکانی یەکێتیان گرتبــوو. ڕۆژی ٢٠/١٠/١٩٨٠ ئــەو ڕۆژەیــە تەنیــا گڵ لەبیــرم دەباتــەوە، ئێــوارە کات خــۆی دا لەچــوارو پێنــج، کە قەتــارەی قازو قوڵینگ ئاســای پێشــمەرگە کەوتــەڕێ، چاوەڕێی دنیا تاریک بــوون و پەڕینەوەمان دەکرد لەجــادەی دوکان ســلێمانی، لەگونــدی تەلانەوە بۆ قەمچوغــە، مام غەریب پێشمەرگەیەکی خەڵکی عەسکەر، هاتە لامەوەو وتی لەبەر هاوڕێ ڕووناک با ڕانەوەســتین لەمزگەوت و ســەرەی دابەشــبوون بۆ مــاڵان، من ماڵێکی خزمم لێرە هەیە لەپێشەوە دەڕۆم پێیان دەڵێم لەماڵی ئەوان دەبین، سوپاسم کردو ئەو ڕۆیشــت، برا پێشــمەرگەکان بۆ مزگەوت ڕۆیشتن و ئێمە لەگەڵ شــێخ ســەلامی هاوڕێمان بەهەورازەکەدا هەڵگژاین، مام غەریبیش هاتەوە

وتی من بۆ شارەزای پێشدەکەوم، کاتێک بەهەناسەبڕکێ بەهەورازەکەی مالآندا سەرکەوتینە سەرەوە، گەیشتینە مالّی حاجی سمایلی برای شەهید حەمەدەمینی مام کەریمی قەمچوغەیی سلآومان لێکردن، وەلآمەکان دوو کێژۆلەی ئێسک سووک دایانەوە، ئێمە سێ پێشمەرگەی بەرگ بۆرو لەولاشەوە دوو کچی بالآبەرزی ئێسک سوک وەستابوون بۆ پێشوازی بووک و زاوا، کەچی بووک دیارنەبوو، کچەکان خێرا خێرا چاویان دەگێرا بۆ بووک، بووکێش دیارنەبوو، کچەکان بەملاولادا هەردەیانڕوانی، دایکیان هاواری لێهەلّساو وتی: کوا بووکەکەمان لەو هاتوهاوارەدا بوو ئایشەخانی کچی حاجی سمایل، میرووە شێنەکەی گوێچکەی ڕووناکی بەر چاو کەوت و دەمی خۆی گرت و بۆ چێشتخانەکە گەڕایەوە، چپاندی بەگوێی دایکیدا هەر ئەوەندەمان زانی حاجی ژن پەلاماری ڕووناکی داو دەستی کردە ماچکردنی، تومەز کە وتویانە مام عەلی ژن و مندالّی لەگەلّە لای وابووە ژنێکی قەلّەوی تێکسمڕاو کراسێکی کەرنەکی لەبەرەو دووسێ مندالّ لەملایەوە دەڕۆن، ئەو شەوە تاکو کاتژمێر سێی شەو ڕووناک و هەردوو کچەکەو حاجی ژن فسکەفسک و قاقای پێکەنین بوو، من و شێخ سەلامیش لەو دورەوە سەرو بەتانیان داینێ و هەلآژاین، من بەدەرکراو دەچووم، لەدلّی خۆمدا وتم ئەمە شەوی یەکەمی مانگی هەنگوینم فت.

هەرچۆنێک بوو ڕۆژ بووەوە، زۆر زوو بەرەو سەرمۆرد بەڕێکەوتین، من و ڕووناک بەدەم قسەکرد بۆ داهاتوومان لەدوای دواوە دەڕویشتین و هەموو دەردەدلێ خۆمان بەدەست خستنە دەستی یەکەوە فەرامۆش دەکرد. هەورازی سەرمۆرد بەناوبانگە، بەڕاستی کوڕی دەوێت بەتاقم و تفەنگەوە بگاتە شێخ باخ، بەلآم ئێمە هەورازەکەمان بەجادەی قیر دەزانی، هەوایەکی خۆش و دلّێکی کراوە، بەمەرجێک دەمانزانی بۆ مەیدانی جەنگێکی نادیار هەنگاودەنێین، فڕەفڕی کۆپتەر زرموهوڕی تۆپە دورهاوێژەکانی دوکان و سوسێ، هیچیان قیمەتیان نەبوو لەئاست هەست و خۆشی دەروونمان، ئەمە خەیالّنییە، بڕوابکەن لەوەش زیاتر بوو کە باسیدەکەم.

هەورازمان بەڕێکرد هەموو برا پێشمەرگەکان دەتوت دۆ بەپشتیاندا ڕژاوە لەژێر تاقمەکانیانەوە، تەکانیان دەدا بگەنە بن دار گوێزەکانی شێخ باخ بۆ ئاو خواردنەوەو پشوودان، ئێمەش گەیشتین و ماندووش نەبووین، تائەوێ کەس نەی پرسی ئەم کچە بۆ لەگەلّ ئێمەدایە، چونکە ئەو سەردەمە کچانی شۆڕشگێر زۆر دەهاتنە ناو شۆڕشەوە بووبوو بەشتێکی ئاسایی، هات بەبیرمدا خۆمانیان لێئاشکرا بکەین چاکە.

لەکاتی هەڵسانماندا لەگەڵ ڕووناک چووینە نێوانی دوو بەردی زلەوە کە ڕێگاکە بەنێوانیاندا تێدەپەڕی و چەند قسەیەکم بۆ برایان کردو وتم من و ڕووناک پرۆسەی هاوسەرگیریمان کردووە، ئێمە دەوەستین وئێوەش بەلاماندا بڕۆن و پیرۆزبایمان لێبکەن، هەموویان بەڕوویەکی خۆش و دەموچاوی گەشەوە تەوقەیان لەگەڵ کردین، تەنیا یەک پێشمەرگە نەبێت، مردین و سووتاین نەهاتە پێشوو تەوقەی لەگەڵ ڕووناک نەکرد، ئەویش ناوی حاجی عومەر بوو پیاوێکی بەدین و نوێژکەرو خواپەرستبوو.

کاروانە جوان و ڕێکوپێکەکەی پێشمەرگایەتیمان بەمەسافە کەوتەڕێ، ئێمەش لەدواوە پێمانگران دەکرد بۆئەوەی کەس گوێی لەقسەوباسمان نەبێت، لەنێوانی زنجیرەی پێشمەرگەکان و ئێمەدا ژنێکی پیرەساڵ کۆڵێک چیلکەی لەکۆڵدابوو، کە ڕووبەڕووی ئێمە بۆوە هەڵویستەی کردو دەستیبرد بۆ ناو سنگی و دوو هەزمێنی لاسورەی دەرهێناو وتی فەرموون ڕۆڵەکانم، ئەمەی وت و ڕۆیشت، بڕوا بکەن بۆنیکی لێدەهات بەبۆنی سنگوبەرۆکی کێژێکی لاوی تازە پێگەیشتوو دەچوو، جگە لەخۆشی تاموبەرامەی هەرمێکانی کە ئێستاش چێژەکەی لەبیرمان نەچووەو تامردنیش لەگەڵ یادگاری مانگی هەنگوینیەکەماندا دەژێت.

ئەو سەردەمە نەوعە شێتێک کوردی گرتبوو، بەگیانی یەکتری خڕبووین، برادەرانی حیزبی سۆسیالیست بەسەرپەرشتی شەهید شێرکۆی شێخ عەلی سەرگەڵو، لەوناوە هەرێمێکیان هەبوو، زۆرجار لەگەڵ هێزەکانی یەکێتی ڕووبەڕوو دەبوونەوە، کاتێک من سەرپەرشتی هەرێمی دووەم دەکرد سەبارەت بەناسیاریمان لێک دڵنیابووین، کاتێک دەگەیشتینە یەکتری لێبوردنمان هەبوو. دوای ئەوەی لێژبووینەوە بەرەو گوندی سێکانیان، ئێشکچی برایانی سۆسیالیست بەسەرسەرمانەوە بوو، کە زانیان هەرێمی دووین، سڵاومان لێک کرد، بەحەزەرەوە بەمەسافەیەکی زۆر شۆڕبوینەوە بۆ سێکانیان کە بارەگای ئەوان لەوێ بوو، ماڵی شەهید شێرکۆش لەوێ بوو، برادەران برسی بوون و ویستیان بڕۆنە ماڵان بۆ ژەمی نیوەڕۆ، لەسەر ڕێگاکەمان شێرزادی برای شێرکۆ زانیبووی هەرێمی دووین خۆی هاتبوو بۆئەوەی دامان بمەزرێنێت، کە ئێمەی بینی وتی کاک عەلی خۆت و چەند کەس لەگەڵ خۆت فەرموونە ماڵی ئێمەو منیش برایانیتر دادەمەزرێنم، من لەگەڵ بووکەخان و دوو برایتر چووین بۆ ماڵی کاک شێرکۆ، کاتێک چووم شەهید قادر چاوشینی هەڵەدنی کە جێگری شێرکۆ بوو لەوێ بوو، ئەملاولای یەکتریمان ماچکرد، پاشان دانیشتین و

دەســتمانکرد بەهەواڵ پرسین، کاک قادر پرسی و وتی کاک عەلی، دەستی بۆ ڕووناک درێژکـرد، ئەوە کوڕتە؟ منیش بەپێکەنینەوە وتم بەڵێ کوڕمەو کوڕە گەورەشــمە، ڕووناک قاتێکی بۆری پێشمەرگانەی کۆنی لەبەردابوو، جامەدانەیەکـی بەگردی بەســتبوو، جوتێـک میرووی بچکۆلــەی بەگوێوە نووســابوو بەئاســانی نەدەناســرایەوە، پاشــان وتم ببورە کاک قادر ئەوە ڕووناکی هاوســەرمە، شەهید کەمێک دڵگران بوو، وتی من گاڵتەم لەگەڵتدا کردووە، هەندێک جەوەکەمان خۆشکردو بوو بەپێکەنین، دوای پشوویەکی چاک بەرەو ســەرگەڵو کەوتینەوە ڕێ، گەیشــتینە بانووەکەو شۆڕبوینەوە بەکۆڵانــە بەردەلانــی و پێچاوپێچەکانــدا گەیشــتینە بەردەمــی دوکانەکان، پێشــمەرگە بڵاوبوونــەوە بۆ کڕینی پێویســتییەکانیان، من و بووکەکەشــم لەگەڵ یەک دوو لەبرا پێشــمەرگەکانمان چاوەڕێی دابەشبوون بووین، هەر ئەوەندەمانزانی منداڵەوردکە دەوریانگرتین و دەستیانکرد بەپێکەنین، خۆمان بەشــێت دەهاتە بەرچاو، خواخــوای ئەوەمان بوو یەکێک فەرمووومان بکات بــۆ ماڵی خۆیان، نازانم چ برایەکی پێشــمەرگە وتــی بابڕوینە ماڵی دایکی شــێخ عوسمان سەرگەڵویی، هەرچۆنێک بوو خۆمان بەپەلەکروزێ گەیاندە ئەوێ، ئۆخەی پشوومان دا خوشکێکی عازەبی شێخ عوسمان هەبوو ناوی ئامینەخــان بــوو لەگــەڵ بووکەخان بــوون بەهاوڕێ و ئەو شــەوەش ئەو داگیریکردو تابەیانی خەریکی پەروەردەکردنی ئامینەخان بوو بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵەو بەیانی کۆمەڵێک بڵاوکراوەی دا بەســەریدا بیدات بەکچانی دەستە خوشکی، ئەمڕوشمان فت.

ڕۆژی ســێیەم بەرەو مالومەی کۆلنەدەرو بنکەی ســەرەتای شۆڕشی ئەیلــول دەڕۆیشــتین، پێشــئەوەی بگەینــە کۆتــەڵ ڕێک لەبــەر دەروازەی یاخســەمەر، شــەهیدی نەمــر هاوڕێمان جەبــار فەرمــان بەتراکتورێکەوە هاتەســەر ڕێگامــان وەکــو خدری زینــدوو بــەرەو یاخســەمەر ڕێگامانی گۆڕی، چووینە ماڵی شــەهید ئیســماعیل گەورەدێی، دیمان ســەبیحەخانی کاک جەباریــش هاتــووە بــۆ لای کاک جەبــار فەرمــان، برایــان دابەشــبوون بۆ نانخواردن، ئێمەش لەوێ ماینەوە، بووک لەگەڵ ســەبیحە خان، پێکئاشنابون خانەقینی و شێخانی، ئێمەش لەگەڵ کاک جەبار یادەوەری ڕۆژانی زیندانمان دەگێڕایەوە، لەپڕێکدا کاک جەبار دەســتی کردە گیرفانی قەمسەڵە سەربازییەکەی و قوتویەکی دەرهێناو وتی ئەم دیاریە سبیحە بۆ یهێناون بۆ خوشــک و براکەمان، بەڕاستی شتێیکی چاک بوو، بەناو بووک و زاوابووین، بەلام ئەڵقەی هاوســەرگیریمان پێنەبوو، خێرا بانگی ڕووناکم کــردو لەبەر چاوی ئەوان ئەڵقەکانمان گۆڕیــەوەو بووین بەخاوەنی ئەڵقە، بەلام نەماندەزانی کەی دەبین بەخاوەنی ماڵ.

لای کاک جەبارمـــان بەزیـــاد کــردو بۆ نیوەڕۆ چووینــە میوانخانەکەی حاجی قادری مالومەیی، کە لەڕێی شەهید جەمالی عەلی باپیرەوە بووبووین بەئاشنا، لەوێش بووک دەبێت بڕواتە ناو ژنان و ئێمەش بەدیار قسەخۆشە بێ سانسۆرەکانی حاجی قادرەوە ژەمی نیوەڕۆمان خواردو باروبەندەمان بەرەو ولاخلوو، درەنگ بوو گەیشــتین، برایان لەڕێی لێپرسراوی گوندەوە دابەشــی مالان بوون، ئێمەش چووینە مالێک ناوی عومەر عەبدولا بوو کە پاشــان بەکارەساتی شــۆڕش چاوێکی لەدەســت دا، هەندێک بەعارومارى خۆمانەوە دانیشتبووین لەپڕێکدا باجی ڕووناک، بەو بەرگە بورۆ جەمەدانیە خرەوە خۆیکرد بەچێشتخانەکەی مالەکەدا بەنیازی ئەوەی هاوکاری کابانەکە بکات، مەکە کابانیش پێوایە پیاوە، کە بەپرتاو ڕایکردە دەرەوە ڕەنگی زەرد بووبوو، بەدوایدا ڕووناک هات و وتی دادە بۆ ترسایت خۆمنیش لەخۆتانم، تێکڕامـــان دامانە قاقای پێکەنین، هــەر لەو ڕۆژەوە مالی کاک عومەر بوون بەخانەخوێی هەمیشـــەیمان و کاتێک لەدوورە ولاتیشەوە دەگەڕێینەوە یان ئەوان دێنە لامان یان ئێمە سەردانیان دەکەین.

چاوەڕوانــی شــەومان کرد کــە دنیا تاریکبــوو، ڕێزمان بەســتەوە بۆ ســەفرەو زەرون، بەبــێ چرپــەو بەمەســافە دوڵــی ســەفرەو زەرونمـــان تەواوکــرد، ئەوەندە ئەمبەروبەری ئاوەکانمانکرد قاچمان پێرەلۆک بووبوو، تا گەیشــتینە سەر ســیمەکەی هەرزنە، دانەدانەو دوودوو شەتەکیاندین و پەڕاندیانینەوە ئەوبەر، بەهەورازەکەدا هەلزناین بۆ گوندی هەرزنە، ئەوســا خالە شــێخ ســدیق و ئومێدی کوڕی بەشــی گومرگی یەکێتیبوون لەســەر چەمەکــە، پێش ئێمە کاک دارۆی شــێخ نوری، خــۆی و خێزانی کە لەوێوە دەڕۆن خالە شــێخ ســدیق دەچێــت بەپیریانــەوە، کاک دارا بەنەرمین خان دەلێــت باگێلەیەک بەخالە شــێخ بکەین، نەرمین خــان دەلێت چۆن، ئەویش دەلێت تۆ هیچ دەنگ مەکەو بۆ خۆت پێبکەنە، خالە شــێخ ســدیق کادرێکی دلسۆزی کۆنی یەکێتی بوو، کەمێک گوێیەکانی گرانبوون، بەلام تا ئارەزوو بکەیت قسەخۆش و پیاوچاکبوو، ئارەزوویدەکرد هەر پێشمەرگەیەک لەوێوە بڕۆیشتایە خزمەتی بکردایە، بەلام خێزانی مردبوو خۆشیان وەکو پێویست بۆیان نەدەکرا خزمەتەکە تەواوبکەن، واشــڕاهاتبوو لەسەر ڕێگا دەوەستاو بەسەرە ئەملاوئەولای هەمویانی ماچدەکرد، کاتێک کاک داراو نەرمین خان دەگەنە ئەوێ خالە شــێخ ســدیق ســەرەی پێوە دەگرێت، دارۆ ماچدەکات، یەکەیەکە تا دەگاتە کۆتایی پاشان ڕوودەکاتە دارۆ لێدەپرسێت ئەی توخوا نەرمیــن خان چۆنە؟ دارۆش بەپێکەنینێکــی خوش دەلێ خالە گیان ئەوەنیە تێــر ماچتکرد، ئەوســا خالــە تەریق دەبێتەوە، بەلام بۆخۆشــی دەلێت: وتم ئەم پێشــمەرگەیە بۆ ئەوەندە نەرموخۆشــبوو. کاتێک ئێمە گەیشــتین، وتم

ڕوونــاک لێرە پیاوێک هەیە هەمومان ماچــدەکات، ئاگاداربە، وەختێک خاڵە هات لەدورەوە هاواریکرد وتی عەلی بەدەردەکەی کاک دارۆم نەبەیت، کوا ژنەکەت، ناچار خۆمان بۆ کەشــفکرد. خاڵە شــێخ سدیق، ئومێدی ڕاسپارد بردمانــی بــۆ ماڵێک، من و ڕووناک و شــێخ ســەلام، ســەرەتا پیرەژنێکی باڵابــەرز، هــات بەخێرهاتنــی کردیــن، پاشــان دوو نەمامــی قــەد باریکی پەریئاســا زۆر بەناســکی بەخێرهاتنیان کردیــن، نەیاندەزانی ژنمان لەگەڵە دوورکەوتنەوە لێمان، پاشان نەمانزانی چۆن میرووەکانی گوێی ڕووناکیان بێنیبوو کاتێکمان زانی پیرەژن هاتەوە بۆ لامان و لەپشتەوە سەری ڕووناکی گرت و نوســاندی بەخۆیەو دوو زلەی خۆشەویســتانەی لێداو وتی: دەک دەبــەرت مــرم، ئەوە تۆ کچیــت، کچەکانیــش ڕووناکیان لســتەوەو لەگەڵ خۆیــان بردیان بــۆ چێشــتخانەکە، ئەوانیــش ماوەیەک لێیــان داگیرکردم. دوای نانخــواردن بــەرەو گوندی جوان و قەشــەنگی بێتــوش کەوتینەڕێ، ئێمــە لەڕێــگای پێشــمەرگەیەکی هاوڕێمــەوە کە ناوی عەبــدوڵا قازی بوو براینــە ماڵی عەبدوڵا قــازی خزمیان هەروەکو شــەوانیتر پاش نانخواردن ســێ چوار هەناری هەڵگرتوویان بۆ هێنایین، لەو هەنارانەی هەڵیان گرتبوو بەگوێســوانەکەیاندا هەڵیانواســیبوو، خواردمان و ئەوجا ڕووناکیان لەگەڵ ژنەکان پێچایەوە بۆ ژوری ژنان و ئێمەش بەزگورتی ماینەوە لەگەڵ خاوەن ماڵ و چەند پێشــمەرگەیەک. ئەو شەوەشــمان بۆ ماڵی قازی بەجێهێشــت، بەیانــی زوو نانمــان خــواردو بەهەورازەڕێــی زەرتکەدا کەوتینــە ڕێگا بۆ دەرمانــاوێ و قەڵەرەشــە، شــەومان بردە قەڵەڕەشــە، وەکو کوردســتانی عێــراق ئــازاد نەبووین لەدابەشــبوون و دەبوو داوا بکەیــن کوێخای گوند دابەشمان بکات، ئەویش زۆر بەگران بەدەنگمانەوە دەهات، هەرچۆنێک بوو هات و دابەشیکردین، ئێمە سێ کەس بەر ماڵێک کەوتین، دوای نانخواردن پێمانی وتن لەبەرئەوەی ژنێکمان لەگەڵە ئەگەر مومکین دەبێت لانیکەم ئێمە نەبەنــە مزگەوت، من و ڕووناک لەوێ بمێنینەوە وتیان مومکین نییە، ناچار پەتۆیەکیــان دایــێ و لەگەڵ پێشــمەرگەکان چووینە مزگــەوت بۆ خەوتن، شــەو حەرەســمان دانا بۆ ناو مزگەوت و بۆ دەرەوەی مزگەوت، چاریش نەبــوو دەبــوو لەگەڵ ڕووناک پێکــەوە بخەوین، براو خوشــکی، بەتایبەتی بۆ حورمەتی پێشــمەرگەکان خۆمــان نەخوران و ڕوومان نەکردە یەکتری، بەیانی تاریک و ڕوون مەلای مزگەوتەکە فوی پێدا کردو جێگامان پێلەقبوو، پیاوێــک هاتە لامانەوە نوێژ بکات بینی ئێمــە دووان لەمزگەوتدا خەوتوین، چاوی ئەبڵەق بوو، هەرچونێکبوو لەخەویانکردین و پەتۆکانمان پێچایەوەو بــەرەو ماڵەکان ڕۆیشــتین، هەرچەندە هێشــتا هەڵنەســتابون، لەبەردەرگا وەســتاین تــا ماڵەکەمــان هەڵســان و ئەوســا چووینــە ژورەوەو ســەرو نانێــک و هەندێــک ژاژییان داینێ، ڕووناک شــتی وەهــای نەدیبوو، کەمێک

بۆنیشـی هەبوو بۆی نەدەخورا بەهەر شـێوەیەک بوو نەمانهێشـتماڵەکە پێبزانن.

برادەران شـاوریان لێداو ئێمــەش ماڵئاواییمان کردو بەرەو بێورانەکان کەوتینەڕێ بۆ نیوەڕۆ چووینە بێورانی ســەروو، من ماڵە دۆستێکم هەبوو بەنــاوی میرزا عەلی قەرەنی و نانێکی خۆشـمان لــەوێ خوارد، بەڵام خوا ماڵیانئاوا بکات هەندەیان چای ڕوونی پێش نان داینێ دەممان تاڵ بووبوو، جارێکیتـر برادەران بەشـاور ڕایانپەڕاندین و بەرەو بنەو خەکەف، ڕیزمان بەسـتەوە، کاتێک گەیشتینە بەردەمی مزگەوتەکە، وا ڕێک کەوتبوو ئاغەڵی ژنانیـش لەوێیە، ڕوونـاک ڕوویکردە ئاغەڵەکە بەحسـابی ئەوێ مزگەوتی ژنانە، هەر کە گەیشتە ناو دەرگاکەو ژنگەل بەقاوقیژ هاتنەدەرەوە، ڕووناک هاواری لێهەڵسـا لەخۆتانم، لەخۆتانم بەڵام سـوودی نەبوو، بەشی زۆری ژنــەکان دەرپەڕینــە دەرەوە، دیمەنێکی سەرسـوڕهێنەربوو، لەو بەلایەش ڕزگارمان بوو، یەکێک لەخەڵکی گوندی بنەو خەڵەف پێشـمانکەوت و دوو دوو سـێ سێ دابەشـی سـەر ماڵەکانیان کردین، پاشـان نانمان خواردو و بەرەو بنکەکانی سـەرکردایەتی یەکێتی ڕیزمان بەسـتەوە، کاتژمێر ٤-٥ بـوو گەیشـتینە دۆڵ و هەورازەکـەی ناوزەنگ و هەڵگەڕاین تا گەیشـتینە ئاسـت بـارەگای مەکتەبـی سیاسـی و ناوەنـدی کۆمەڵــەی ڕەنجدەرانی کوردستان و لەبارەگاکانی کاک ملازم عومەر عەبدوڵاو مەلا بەختیارو کاک سـالارو دەوروبەریان، لەپڕێکدا چەند ریزێک تەقەی خۆشـیمان بەسـەردا کرا، گوایە بووک هاتووە.

هەمـوو هاوڕێ و برا تێکۆشـەرەکان بەسـەریانکردینەوە. بۆ ئێوارەش چووینــە زەڵێ و میوانی ناوەندی کۆمەڵە بووین، شـەویش خوا ماڵی کاک عومەری سەید عەلی و پاکیزەخان ئاوا بکات یەکێک لەپشتیرەکانی ماڵی پور کەسـکێیان بۆ ئامادە کردین و شـەو میوانی ماڵی خۆمان بووین، پێموابوو ڕزگار بووین و ئیتر دەتوانین لەشوێنێکدا ئارام بگرین، بەڵام قەدەر وەهابوو شـەوی دووەم ئـەو پشتیرەشـمان پێڕەوا نەبینـراو یەکێـک لەکاکیلەکانم کەوتــە ژان و ئارامی نەهێشـتم، بەیانی زوو چووین بـۆ لای دکتورەکانی ناوزەنگ، کە ئەوسـا بەیان و نازەنین و دکتۆر نەریمان لەوێبوون، کەوتنە وێزەی ددانم بەهەر سێکیان هەرچی کردیان و تێکۆشان بۆیان دەرنەهات، ئـازارم زۆر زۆرتـر بـوو، بۆیە ناچـار بەڕێی قاچاغدا چووین بۆ شـاری سەردەشت و چووینە ماڵی شەهیدی نەمر جەمالی عەلی باپیر، بەهۆی شێخ ئەحمەدی سـەرگەڵوییەوە بەنهێنی بردیانـم بۆلای دکتۆر، پاش یەک هەفتە ئینجا بۆیاندەرهێنام و گەڕاینەوە ناوزەنگ، ئەوسـاش دەبوو پشـتیرەکەی

پوره کەسکێ بەتاڵ بکەم، چونکە پێویستیان بوو تا گۆلکەکانی تێبکەن.

لەسەر زینۆی ناوزەنگ کونە خانوویەکی چۆڵ هەبوو، بەوشکەکەڵەک دروستکرابوو، مقەڕی پێشمەرگەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوو کە پێشوتریش کاک ئازادی سەگرمە ماوەیەک تێدا ژیابوو، کاک نەوشیروان وتی برۆن لەوێ بخەون و بۆ نانخواردن لەگەڵ پێشمەرگەکانی دەستەکەی من نان بخۆن، بۆ ماوەیەک وەهامانکرد، دنیا بەرەو باران و سەرما دەڕۆیشت، با لەژورەوە بۆ دەرەوە دەچوو، دوو کۆڵەکەی گێری تێدابوو، خانووکە زۆر بچوکبوو، کە باران باری شەوی یەکەم دڵۆپە لەنێوانی سەرینەکەی هەردووکمانی دەدا، هەوڵم دا بەتاڵێک بەن ئاوەکەم لاداو لەخۆمانم دورخستەوە، ماڵەکەمان بریتیبوو لەجامێکی ئاو خواردنەوەو دەولکەیەکی پلاستیک. جامێکی ئاو خواردنمان لابوو سەرێکی تاڵە بەنەکەم لەکۆڵەکەکە بەست و سەرەکەیتریش بەبەردێکەوە بەستم و خستمە ناو دەولکەکەوە تا بەیانی پڕاوپڕبووبوو لەباراناو، زۆر شەو ئەمە دووبارە دەبۆوە.

کاک ملازم عومەر قەلێکی بۆ ناردبووین گوایە تازە ماڵین و بۆخومان بێخوین، بەڵام ئێمە قاپوشتمان نەبوو نەماندەزانی چی لێبکەین، باشبوو ڕۆژێک پاکیزەخانی خوشکی شەهید عەلی ئامەخان سەری لێداین بۆمان باسکرد کە قەلێکیان بۆ هێناوین نازانین چی لێبکەین، ئەویش دەستی خۆش بێت بۆی چارەسەرکردین. زۆر لەبرادەدان هاوکاری مادی و مەعنەویان کردین، دکتۆر کەمال خۆشناو، کاک عومەر شێخ موس دوو بەتانی پڵنگی خۆیان بۆ ناردین، شەهید ئازاد هەورامیش باربوی مادی کردین، چی لەگیرفانیدا بوو لەماڵەکەماندا بەجێیهێشت، برایانیتریش کەم و زۆر درێغیان نەکرد.

ڕۆژێک برایان پێشنیازیان بۆ کردم کە ئێمە پشوومان نەداوە بۆ سەرێکی بۆکان نادەم و مانگی هەنگوینیەکەم لەوێ تەواو بکەم؟ ئەسا بۆکان ئازاد بوو، کۆمەڵەی ئێران و دیموکرات و کۆمەڵێک سازمانی ئێرانی تێیدا دەژیان.

ئێمەش پێشنیازەکەمان پێخۆش بوو بەتایبەت لەبەر ڕووناک، ڕێکەوت وەهابوو کاک ئاسۆی شێخ نوریش هاوڕێ سەفەرەکەمان بوو بۆ بۆکان، سەرەتا بەپێ ڕۆیشتین پاشان دەبوو بەلورییە گەورەکان لەسەر بارەوە سوار بین، بەشەویش برۆین چونکە شەڕ هەبوو لەنێوانی کۆماری ئیسلامی و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ئێمەش تەنیا شاری

بـۆكان هەبوو كـە بۆی بڕۆین، بەزەحمەتێكی زۆرو سـەرمایەكی زۆرمان چەشت، كە ڕۆژ بۆوە گەیشتین، سووڕێك بەناوشاردا گەڕاین، ئێمە چووینە نەخۆشـخانەو فەحسـێكمان كرد، پاشـان سـەرمان لەماڵی كاك سەلاحی موهتـەدی دا، ئەوان لایەنگـری كۆمەڵەی ئێران بـوون، زۆر نزیكتر بوون لەئێمە، هەر لەو ڕوانگەیەوە یەكسەر چووین بۆ دیوەخانەكە تەماشامانكرد گەرمەی موناقەشـەبوو، پێمانوابوو دەتوانین ڕووناكیش لەلامان دانیشێت، بەشـداری گفتوگـۆ ببێت، بەڵام نەیانهێشـت دانیشـێت و فەرموویانكرد بۆ ژووری ژنان، شـەوێك لەوێ بووین نەمزانـی هەواڵی ڕووناك چییە، زۆر دڵم پەرێشـان بوو لەدڵی خۆمدا دەموت بەخـوا خۆش مانگی هەنگوینیمان كرد.

بەیانی دوای نانخواردن ماڵئاوایمان كردو چووینە بازاڕو دوو ژوورمان گـرت، كاك ئاسـۆ لەژوورێكداو ئێمەش لەژوورێكدا، كاتێك چووینە سـەر تەختی خەو كەوتینە ناوی و لەژێرەوە كۆمەڵێك مشـك دەرپەڕین، جێگاكە بۆن مشـكی لێدەهـات، لەحاڵی خۆمان بێـزار بووین و بڕیارمـان دا، هەر ئێـوارە كـە داهات بڕۆینە گـەراج و بگەڕێینەوە بۆ ناوزەنگ، ئێمە لەسـەر چەنچەكەی جێگامان بەركەوت و كاك ئاسۆش لەنێوانی فەردەكاندا جێگای بۆوەو بـەرەودوا گەڕاینەوە. شـەوەكەی زۆر سـاردبوو لۆرییەكە بەرزو هەواكـەی كردمانـی بەئایسـكرێم، زووزوو ڕوونـاك دەیپرسـی هـاوڕێ زۆرمان ماوە بگەین بەناوچەی سەردەشت، منیش بۆئەوەی بێتاقەت نەبێت دەموت سـێ چارەك، نیوسەعاتێك، چەندجار ئەم پرسیارانە دووبارەبۆوە، لەپـڕ وتـی ئەرێ هاوڕێ ئەوە چەند جارە من دەپرسـم و تۆ هەمان وەڵام دەدەیتەوە. بۆ پێكەنین وتم پیاو دەبێت خاوەنی قسەی خۆی بێت، ئا ئەوەیە مانگی هەنگوینی ئێمە.

پێمخوشـە ئەو هەواڵە خۆشە بدەم بەو كەسـانەی بەئاشتی هەتا سەر پێكەوە ژیانیان پێخۆشە، كە من و بووكەكەم هەتا ئێستا وەكو ڕۆژانی یەكەم گەرمیـن لەڕێز لەیەكتری گرتن، ئومێد دەخوازین هەموو، جووتێك، لەنێرو مێـی كۆمەڵگاكەمـان بەختەوەربن بۆ ئەوەی نەوەكانیـان باش پەروەردەو تەندروست بن.

## ڕاپەڕین لەشاری کۆیە

ئەو کاتەی من بەهۆی ژنهێنانەوە چوومە بارەگاکانی سەرکردایەتی و ماوەیەک لەوێ مامەوەو شەهید ئەنوەر حەسەن بووبوو جێگرەوەی من، هەرێمەکەی لەگەڵ هێزێکی گەورەی ڕێکخراوی یەکێتی کە بۆ مەڵبەندی سێ و چوار دەنێردرا بەڕێکەوتن و زۆر بەداخەوە لەپشتی گەلاوزێ لەلایەن هێزێکی ئاسمانی دوژمنەوە بۆردومانکران و خەڵکێکی زۆر شەهیدو زامداربوون، لەوانە شاعیرو مامۆستا (جەمیل ڕەنجبەر) شەهید بوو، ئەندامی سەرکردایەتی کاک (عومەری سەید عەلی) زامدار بوو، من لەبەر خراپی نێوانم لەگەڵ هەندێک لەئەندامانی سەرکردایەتی شۆڕشگێڕانەوە لەهەرێمی دوو دەستم لەکارکێشایەوەو سکرتێری گشتی ڕەزامەندی لەسەر داو ناچار لەبارەگاکانی سەرکردایەتی خانوویەکم کردو تا کاروانی کوڕم لەدایکبوو هەر لەوێ مامەوە. پێشئەوەی کاروان لەدایکبێت، ڕووناکم نارد بۆ شاری سنەو لەوێ چاوەڕوانی لەدایکبوونی کاروان بکات و خۆیشم بەکاری دەزگای ڕێکخستنی کۆمەڵە چوومەوە بۆ ناوچەی خۆمان. ئا لەو کاتانەدا ڕاپەڕین لەشارەکان دەستی پێکردبوو بەهۆی پەلامارو شەڕی ئێران عێراقی. لەگەڵ شەهیدان شێخ شەماڵ و شەهید سەربازو شەهید ملازم خولەو چەند هاوڕێیەکیتر چووینە ناو شاری کۆیەو شەوێک تا نزیکی بەیانی چووینە کۆڵانەکان و بەجیهاز قسەمان بۆ جاشەکان دەکردو پەیوەندیمان کرد بەهەندێک خەڵکی نیشتمانپەروەرەوە لەوانە شێخ جەنگی برای مام جەلال.

ئەو شەوە کە چووینە گەڕەکەکانی شاری کۆیە، شەهید سەرباز چاوساغی بۆ دەکردین و دابەشیدەکردین، چووینە هەر گەڕەکێک لەبەردەرگای هەر ماڵێکدا دوو سێ کچ و کوڕ پیاو و ژن ڕاوەستابوون بەکاسەی پڕی بەفرو دۆو ماستاو و بەڕووخۆشی و پەرۆشیەوە فەرمووی ماڵەکانی خۆیان دەکردین. بەڕاستی لەوێدا تاموچێژی خەباتی خاوێن بۆ ڕزگاری جەماوەر دەردەکەوێت.

هەر لەو ساڵانەدا بوو تازە شەڕی نێوانی عێراق و ئێران دەستی پێکردبوو من بەهەرێمەکەمەوە پەلاماری گوندی گۆپتەپەمدا، کە گەورەترین سەربازگەی حکومەت بوو، ڕاومانان و چووینە ناو دێیەکەوە، هەموومان دەناسین و وتمان: کێ بووە بە بەعسی خۆی بێت پێمان بڵێت؟ دەزانین لەترساندا بوون بە بەعسی، بەڵام ئەوەی پێمان نەڵێت پاشەڕۆژ موحاسەبەی توندو سزای توندی دەدەین، خەڵکەکە خۆی لەبەردەمی مزگەوت و قەڵاکەی گۆپتەپەدا کۆببوونەوە، تەماشامکرد لەو گوندەدا زیاتر لە (١٦٠)

بەعسـى هاتـە دەرێ، هەندێک حاشـايان دەکـردو بانگمانکـردن بۆئەوەی ئاگاداربن کە دەزانين يەکێک لەجياتی يەکێکيتر تەلاقی خوارد کە نەبووە بە بەعسـی، بەڵام کاتێک بانگمان کرد ناوی (بەلوو بوو) خۆی ئاشکرايکرد کە چەکێکی لايەو لەکۆنەوە بەعسييە، ئەوسا وابوو لەپاش ئاشبەتاڵەوە خەڵکی لەبەعس زۆر دەترسان، خۆ ئەگەر ڕەبايەيەک يان سەبازگەيەک لەدەوريان بوايە ئەوە زۆر بەئاسانی بەعس جێگای خۆی لەوێ دەکردەوە.

## شەڕی هێزی پشتیوان

ساڵی (١٩٨٢) بوو شەڕێکی گەورە لەنێوانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆماری ئیسلامی ئێراندا ببووە هۆی ئەوەی زۆربەی ناوچەکانی کە لەڕاپەڕینی ئێران دژی شاە ڕزگارکرابوون بگرنەوە، یەکێتی بەناوی هێزی پشـتیوان هێزێکی خۆی نارد بۆ هاوکاری حیزبی دیموکراتی ئێران و منیش لەلایەن سـکرتێری گشتی و مەکتەبی عەسکەرییەوە بانگکرام و ڕاسپێردرام چەند تیپێک بەرم و بڕۆم لەناوچەی سەردەشت و ڕەبەت بەرگری بکەم، بۆ ماوەی دوو مانگ سەرپەرشـتی ئەو هێزەمکرد کە پێکهاتبوو لەتیپی (٤٣)ی ئاسـۆس و تیپی مامەندە قادر ئاغاو تیپی کـوڕەکاژاو و ئۆمەر ئاغاو تیپی شـێخ سـەدرەدین و تیپی جوتیاران. بەڕاستی هەموویان ئەوەندە بەپیاوانە کاریان لەگەڵ کردم سەربەرزی بەردەمی حیزب و یەکێتییان کردم و ئێران لای ئێمــەوە هەنـگاوی پێنەهاویـژرا، هەرچەندە لەو هەڵوێسـتەی یەکێتیدا شەهیدی چاکدرا، بەڵام هەڵوێستێکی کوردانەو دڵسۆزانەبوو.

مانگی ١١ سـاڵی ١٩٨٢ بوو بەفرێکی چاک باری و نێوان ئێمەو ئێرانی دیوارکـردو برادەرانـی حیزبی دیموکرات وتیان ماڵتان ئاواو شـەڕ بەتاڵە، جەنەراڵ بەفر هاتووە.

گەڕامەوە (ناوزەنگ و زەڵێ) لەوێ لە (بنەوخەڵەف) شـەهید (قاسم لو و مام جەلال)م تووش بوو، شەهید د. قاسم لوو زۆر سوپاسی کردین و ڕێزی بۆ هەموو سەرتیپ و تێکڕای پێشمەرگەکان هەبوو.

هــەر لــەو ماوانەدابــوو گۆڕانکارییەکی سیاســی هەبوو (مــام جەلال) لەدەرەوەبــوو، بەئێراندا هاتەوە، یان چووبــوو بۆ ئێران و دەگەڕایەوە، من هێزێکم بردو چووم بەدوایدا بۆ بۆکان، ئەوسـا شـەهید حەسەن کوێستانی سەرتیپ یان مەسئوولی عەسکەری بوو، بردم لەگەڵ خۆم و چەند ڕۆژێک چاوەڕوانــی (مام جەلال)مان کرد. پاشـان لای ئێمــەوە نەهاتەوەو ئێمەیش گەڕاینەوە ناوزەنگ، ئەوسا هێشتا شەڕمان لەدژی کۆماری ئیسلامی ئێران نەکردبوو، حیزبی دیموکراتی کوردستان هەر لە بۆکان و مەهاباد بوون.

## مەڵبەندی دوو

ساڵی (١٩٨٣) بوو کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵە لەناوزەنگ بەسترا، لەوێدا هەڵبژێردرامەوە بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵەو لەکۆبوونەوەی یەکێتیدا داندرام بۆ بەرپرسی مەڵبەندی دوو، کە یەکەمجاربوو ناوی مەڵبەند هاتە پێشەوەو سنووری یەکێتی بەسەر چوار مەڵبەنددا دابەشکرا، کە گەورەترین مەڵبەند ئەو مەڵبەندەبوو کە بەمن سپێردرا، هەندێک لەبرادەرانی شۆڕشگێران و خەتی گشتییان لەگەڵ دانام، مەڵبەندەکەم بەم شێوەیە بوو:

١. عەلی بچکۆل، بەرپرسی مەڵبەندی دوو.

٢. مستەفا چاوڕەش، لێپرسراوی عەسکەری.

٣. دارا شێخ جەلال، بەرپرسی دارایی.

٤. ئاوات، بەرپرسی سیاسی مەڵبەند.

٥. شێخ محەمەد شێخ مەحمود، کۆمەڵایەتی.

٦. عەبدولکەریم حاجی، بەرپرسی ئیعلام.

بەشی تەندروستی، دکتۆر فایق. لەگەڵ بەشی دادگا، حاکم سەمەد، حاکم عەزیز، حاکم عمران.

پاش تەواوبوونی کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی خۆم کۆکردەوەو بەدەشتی قەڵادزێدا بەرەو گەرمکان ڕۆیشتم، پاشان بەئاسۆسدا هەڵگەڕام، بۆ بەری مەرگە لەو ڕێگایەدا زۆر ماندوو بووین، جگە لەوەی باران دەباری و تاریکە شەو بوو ڕەبایەی جاش و سەرباز لەسەر ڕێگا زۆر بوون

کاتێک گەیشتینە مەرگە دەستمکرد بەنامە نووسین و پەیوەندی دروستکردن بەخەڵکانی ڕیش سپی و پیاوە ناودارەکانی ناوچەکەوە، بۆئەوەی هاوکاریمان بکەن، لەوەی پارتی ڕێگای یەکێتی بدات هێزی برواتە بادینان بۆئەوەی یەکێتیش تەنگ بەهێزەکانی ئەوان لەناوچەی سۆران هەڵنەچنێت، بەڵام پاش ڕۆژێک لەم کۆششەی ئێمە لەناوچەی مەرگە، کاتێک بەڕێکەوتین بۆ سەرگەڵوو لەگوندی سێدەر هەڵویستەیەکمان کرد بۆ هەندێک قسەکردن لەگەڵ دوو سێ خەڵکی گوندەکە لەسەر ڕێگاکە بوون،

تەتەرێکی یەکێتی لەئەنجومەنی سەرگەڵووەوە هات وتی: ئەمشەو هەموو ئەو خانوانەی شۆڕش لەبەرگەڵوو بوو سوتێندراوە، ئێمەیش مەسەلەکەمان بۆ خەڵکەکە باسکردو نیازپاکی خۆشمان پێراگەیاندن. بە بەردەمی قۆمرغان و قەرەنگۆێ و مەولاندا کەوتینەڕێ‌و لەلای حاجی مستەفای مەولان لاماندا‌و لەڕێی شێخ محەمەد سەرگەڵوویی ناوسێلێکی بۆ کردین ئەو زیاتر لەگەڵ حاجی مستەفا دۆست بوو، بەهەردووکیان گیسکێکیان سەربڕی و نانی (١٥) کەسیان بۆ ساز داین و لەوێش مەسەلەکانمان بەحاجی مستەفاش ڕاگەیاندو تکامان لێکرد وەکو مرۆڤێکی ناسراوی ناوچەکە قسەکانمان ڕابگەیەنێت بەخەڵکی، وتمان: زۆرمان پێخۆشە کوردستان بۆ کورد ئازاد بێت، پارتی و یەکێتی لەگەڵ هەموو پارتە بچووکەکانیتر مافیان هەبێت لەهەر شوێنێکدا شەڕ هەبوو لەگەڵ دوژمنی داگیرکەر بجەنگێن و لەکوێ بیانەوێت بارەگاو بنکەو سەنگەر دروست بکەن. بەڵام پارتی ڕێگای یەکێتی نادات لەبادینان کاربکات، لەم ناوچەیەش یەکێتی هێزی سەرەکییە، ئەگەر پارتی ئەو بڕیارە جێبەجێ نەکات، چاکتر وایە ناوچەکە بێ شەڕ چۆڵ بکات بۆ ئەوەی شەڕمان نەبێت.

پاش نانخواردن بەرەو سەرگەڵوو بەڕێکەوتین، کاتێک گەیشتینە بەرگەڵوو هێشتا کەلاوەکان دووکەڵیان لێهەڵدەستا، یەکسەر خانوو سووتانەکەی سەردەمی بەعس و حەرەس قەومییەکانم هاتە بەرچاو.

ئێوارە بوو چووینە لای مزگەوتەکەی سەرگەڵوو، خەڵکەکە زۆر خۆشحاڵ دیارنەبوون بە گەیشتنی ئێمە، هەندێک برادەری خۆمان هەبوو هاتن بەرەوپیرمان و هەندێکیش لەشێخ محەمەدو شێخ عەبدولکەریم کاکە حەمە کۆبوونەوە، چونکە ئەوان خەڵکی خۆیان بوون، پرسیم بۆچی خەڵکەکە گرژ دیارن، وتیان: زۆریان پێخۆشە بڕیار دراوە سەرگەڵوو ببێت بەمەڵبەند، بەلام لەوە دەترسن هێزەکانی پارتی و حسک و پاسۆک و شیوعی کە لەم ناوەن دووچاری شەڕ بین و لەم نێوانەدا خەڵکی بکوژرێت. زۆر نەوەستاین لەماڵی هاوڕێکانی خۆمان دابەشبووین ئاگادارمان کردن ئەگەر کەسانی لایەنەکان هاتن ئێوە خۆتان تێکمەدەن، ئەگەر ویستیان شەڕ بفرۆشن خۆتان دوور بخەنەوە، بۆ ئەوەی پەیامەکەمان بەخەڵکی بگەیەنن و وردەوردەش دەنێرین تیپەکانمان هێزمان بۆ بنێرن نەکو ئەوان بیانەوێت پەلامارمان بدەن. ڕۆژی دووەم بوو گەیشتبووینە سەرگەڵوو هێشتا خەڵکمان بۆ قسەکردن کۆنەکردبۆوە لەمزگەوت، هاوڕێکان هاتنە لام وتیان: حسک هاتوون و حەرەسیان لەهەر چوار دەوری گوندەکە داناوە، جارێکیتر داوای ددان بەخۆگرتنمان لێکردن و پێمانوتن: ئێوە حەرەس

دامەنێن، باش بوو ئەوان زۆر نەمانەوەو سەرگەڵوویان چۆڵکرد.

ڕۆژی سێیەم خەڵکی سەرگەڵوومان کۆکردەوەو قسەمان بۆ کردن لەبابەت وەزعەکەو ناکۆکیەکانمان لەگەڵ ئەو هێزانەو وتمان: تەنیا پارتی بۆی نییە لەم ناوچەیە بێت، بەڵام هێزەکانی پارتەکانیتر ئازادن. چونکە پارتیە ناهێڵێت بڕۆینە ناوچەی بادینان. لەکۆبوونەوەکەدا بۆماندەرکەوت زۆربەی خەڵکی سەرگەڵوو لایەنگری ئێمەن و قسەکانیان پێ ڕاست و پەسەندبوو، داوامانکرد لەڕێی خۆیانەوە ڕاستییەکان بۆ جەماوەری دۆڵێ ڕۆشن بکەنەوە.

چەند ڕۆژ تێپەڕی هێزی تیپی ۲۱، ۲۵، سورداش، ئاسۆس، جوتیاران، تیپەکانی مامەندەو کوڕەکاژاو و تیپی شێخ سەدرەدین و تیپی ٤٧و تیپی ٥٧ی سەگرمەش گەیشتن، هێزەکانی ئێمە ناوچەکەی تەنی، بەفرێکی زۆریش دۆڵێی گرتبوو، وشکە سەرمایەکی زۆر بوو دەبوو بجولێین، بنکەو جیهازێکی گەورەمان لەسەرگەڵوو داناو بەدوو (ڕەتل) کەوتینەڕێ لەسەرگەڵوو بۆ یاخسەمەرو بنارەو بنار بۆ قەیوانەکان. لەبەرگەڵوو بۆ مالوومەو لەمالوومە لووتمان بوو بە لووتی هێزەکانی ئەو پارتانەی لەپێشەوە ناومان بردبوون، مالوومە گوندێکی خزمەتگوزارو پانبوەوەی ژێر پێی پێشمەرگە بوو، بەڵام جۆرەها مرۆڤی شێتیان هەبوو هەیان بوو بەهەر چوار دەوری خۆیدا دەسووڕایەوەو نوێژی دەکرد، هەیان بوو لەدوای نانخواردنی ئێوارە نامەیەکی دەگرتە دەستەوەو هەواڵەکانی چالاکی پێشمەرگانەی دەخوێندەوە، هەشیان بوو دیوەخانی دانابوو. هەر لەوانەی بەشێت ناودەبران وەکو حاجی قادر دێکەڵی مالوومە، هەر کەس بیوتایە: دێ، ئەو دەیوت دایکت، بیوتایە گەڵ، واتە (دێ گەل) ئەو دەیوت: دایکت وا لێبکەم. جا هەر کەسێک بوایە، لەم گوندە کە لازەوی دەوروبەری هەمووی چیلکەی باخچە بوو هەمووی بۆ شەڕە تفەنگ سەنگەر بوو. چووینە ماڵی حاجی قادر لەوێ ناردمان نوێنەری حسک، حشع، پاسۆک، هاتن، ئەوەندەی لەیادم مابێت محەمەدی حاجی مەحمود نوێنەری حسک بوو، لەگەڵ قادر چاوشینی گەلاڵی و قادر چاوشینەکەیتر، عوسمانی قالەی منەوەر، نوێنەری حشع (حەمە سالح) قەرەچەتانی بوو، نوێنەری پاسۆک لەیادم چووە کێبوو، من و شێخ خدرەدین و ئاوات عەبدولغەفورو شێخ محەمەد سەرگەڵوویی و ڕۆستەم و کۆمەڵێکیتر لەکادرەکان لەیادم نەماون نوێنەری یەکێتی بووین. من نانم نەخواردبوو لەگەڵ حاجی قادریش زۆر دۆست بووین لەکاتی خۆی شەهید (جەمال عەلی باپیر) بە یەکتری ناساندین، کاتێک لەزیندانی ئەبوغرێب ئازاد بووم، لەگەڵ شەهید ئەنوەر حەسەن و کاک فەرەیدوندا

چووینە ماڵیان و شەهید جەمال باسی ئێمەی بۆ کردبوو. حاجی قادر زۆر ڕێـزی لێگرتم و هەندێک گاڵتەوگەپی لەگەڵ عوسـمان قـادر منەوەر کرد، ئـەو وتـی: دێ گەڵ ئەویش وتـی: دایکتان وا لێدەکەم ئەی (سـیکو تیکانە) هەمـوو کەوتینە پێکەنین، لەو ژوورەی سـەرخانەکەی حاجی قادر کە کەم پێشـمەرگە هەبـووە نانی لێنەخواردبێت یازدە، دوازدە مەسـئوولی هەموو لایەنـەکان کۆببووینەوە بۆ دۆزینەوەی چارەسـەر. سـەرەتا ڕێگایاندا من قسـە بکەم بەحسـاب بەرپرسـی مەڵبەندی دووم و ئـەو ناوچەیە من لێی بەرپرسـیارم، قاپێک برنجی بێ شـۆربام لەبەردەم بوو گرتمە دەستمەوەو بەکەوچکێک وردەوردە دەسـتمکرد بەقسـەکردن، سـەرەتا هەندێک گلەیی دۆسـتانەم لەمحەمەدی حاجی مەحمود کرد، پاشـان دەسـتمانکرد بەقسە لەسەر ڕێگاچارە.

١- ئێمـە وتمان: ئێمە کوردسـتان بەموڵکی خەڵکی کـورد دەزانین کە هەموومان دەگرێتەوە.

٢- بەمافی هەموومانی دەزانین سەنگەر لێبدەین لەهەر شوێنێکدا هەین و دوژمنی لێهەیە، هەروەها بنکەی حەسـانەوەش لەگەڵ چالاکی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێشمەرگانەی لێبکەین.

٣- داوا لەئێـوە دەکەین هەوڵبـدەن پارتی ڕێگا بەهێـزی یەکێتی بدات بڕواتە ناوچەی بادینان و لەماوەی (٢٤) سـەعاتدا هەمووتان بروسکەیەک بکـەن بۆ پارتی و سـەرکردایەتی بارزانی بڕیار بـدات ئێمە هێز بنێرین بۆ ناوچـەی بادینـان، ئەگەر ڕێـگای دا ئێمەش ڕێگای پارتـی دەدەین بۆ هەر شوێنێک دەیەوێت جەولە بکات، ئەگەریش ڕازی نەبوون ئەوە ئێوە لەپارتی دوور بکەونەوەو ئێمەو ئەوان نێوانی خۆمان جێبەجێ دەکەین.

٤- من پێشـنیارمکرد ئەگەر پێشـتان چاکە پێشـمەرگە ئازاد بێت لای یەکێتـی دەچێـت بۆ لای هـەر پارتێکیتـر بەچەکەکەیەوە بـڕوات و چەکی نەکەین و لەسەری نەیکەین بەشەڕ، هەروەها لەلای هەر لایەنێکی تریشەوە پێشمەرگە هات بۆ ناو یەکێتی با مافی خۆی پێبدرێت.

هەموویـان ئیمزایان کـردو نوێنەریان نـارد بۆ وڵاخلوو، (قـادر قادر) لـەو ناوەبـوو، خەبەرەکەیـان پێـدا، زانیاریمـان پێگەیی هەر ئەو شـەوە هێزەکانی پارتی بەڕێکەوتن بەرەو شـارباژێرو ناوچەی مەڵبەندی دوویان بەجێهێشت.

ئەو ڕۆژە پاش ئیمزاکردن، کاتێک لەژوورەکە هاتینە دەرێ هەر چوار لای ئەو تەنیا هۆدەیە بە ئارپیجی و بیکەیسی گیرابوو، ئەگەر تەقەیەک بکرابایە ئێمــە هەموومان نوێنەری هەموو لایەنەکان دەکوژراین. کەچی لەژوورەوە زوو زوو مام ڕۆســتەم ئیشارەتی دەدامێ دەیوت: با بەمەغزەنێک ٧٥یەوە ڕەمییــان لێبکەم، منیش ڕووم نەدەدایەو نیشــانم دەدا واز لەو هەڵوێســتە بهێنێت.

بــەو بڕیارەی ژمــارە چوار عوســمانی قالەی منەوەر زۆر خۆشــحاڵ بوو، نەمدەزانی بۆچی، کاتێک بڵاوەمانکرد من و شێخ سەدرەدین و ئاوات هــەر لای قــادر دێگەڵ مابووینــەوە، یەکێک لەشــێتەکانی مالوومە خۆیکرد بــە باڵەخانەکــەداو وتی: مام علی فریاکەوە شــەڕ دەســت پێدەکات ئەوە ڕۆســتەم و عوسمانی قالەی منەوەر ســەنگەریان لێکگرتووە. ئێمەش خێرا ڕۆیشــتین هەر لەپەنای ماڵی قادردا شــەهید مەلا ئارازی ڕەحمەتی، ساڵحە ســووری هەڵەدنی چەک کردبوو، کە یەکێک لەهەرە کوڕە ئازاکانی حسکی ئــەو ناوە بوو. ســاڵحم ئازاد کردو چەکەکەم دایــەوە، نامەیەکی محەمەدی حاجــی مەحمود هات دوو ســێ وشــەبوو وتبوی: ئێوە شــەڕ دەکەن یان ئاشــتی پێم بڵێن؟ وەڵامم بۆ نارد شەڕ نەکەیت، ئێستا دەگەمە لات. ڕامکرد ڕۆســتەم و عوســمانم لێک جیاکردەوەو بەرەو لای کاک محەمەد ڕۆیشتم، دەبینم هەر چوار دەوری گیراوە ئەویش لەسەر ئاخر سەربانی مالوومە ڕوو لەســەرگەڵوو وەســتاوە. لەدوورەوە تووڕەبوونی پێوەدیاربوو. لێی نزیک بوومەوەو قسەم بۆ کردو دەمویست دڵنیای بکەین ئەوە سیاسەتی یەکێتی نییە، بەڵکو هەڵچوونی فەردییە، کاتێک لەمە کۆڵاینەوە دەرکەوت عوســمان کەڵکــی لەو بڕیارەی ژمارە (٤)ە وەرگرتووەو خێرا پێشــمەرگەیەکی نوێی یەکێتی هەڵخەڵەتاندووە کە ئارپێجی یەکەی لابووە لەتیپی (٢١) کەرکوک کە هەموو تیپەکە دوو ئارپیجییان هەبوو. ئاڕ پی جیش بۆ ئەوان زۆر بە کەڵک بوو، چونکە لەدەوروبەری کەرکوک ســەنگەریان لێدابوو، کاتێک ڕۆســتەم ئەمــەی زانیبــوو وتبوی: ئەو کوڕە چەکی نییە ئــەوەش ئارپیجی تیپەکەیە، چەکەکەمان بدەنەوە با لای ئێوە بێت. عوســمانیش لەخۆشــی ئارپیجییەکە ئەوەی کردو لەوەوە (ســمڕ ســمڕ) دەستی پێکرد بوو، کاتێکمزانی جۆرەها لوولە ڕووی لەپشتی من بوو، لەسکی محەمەدو لەپشتی محەمەدبوو ڕووەو ســکی من، لەهێزی هەردوولامان ئەو ڕۆژە تەنیا یەک تەقە زیاتر لە (٣٠٠) کەســی تێدا دەکوژرا. هەر چۆنێک بوو کاک محەمەدم ئاشتکردەوەو بەرەو سەرگەڵوو هێزەکەی ئەومان بەڕێکرد، ئێمە ماینەوەو نیازمان هەبوو ئەگەر وەڵامی باشــی پارتی نەیەتــەوە نەهێڵین پارتیــەکان لەناوچەکەمان جەولە بکــەن، بەڵام هەر ئەو شــەوە (ســوارە فەتاح) جاســەنەیی بەخۆی و (١١)

چەکدارەوە لای پارتییەوە هاتنەوەو وتیان: پارتی ڕازی نین لەسەر چوونی (ی.ن.ک) بۆ بادینان و خۆشیان بێ شەڕ چوونەوە بۆ ناوچەی مەڵبەندی یەک لەشــاربازێڕ. ئەم خەبەرەم زۆر پێخۆشــبوو، چونکە کوشتارەکە هەمووی هەر لەکیس میللەتەکەمان دەچوو، بەڕاستی شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو کە ئەمڕۆش خەڵکێکی زۆر نەکوژرا. دەتوانم بەشانازییەوە بڵێم دەوری سەرەکی نەهێشتنی بوونی کوشتار دەگەڕێتەوە بۆ لەسەرخۆیی من. من پێموایە هەر کەسێکیتر بوایە کارەساتێکی هەرگیز لەیاد نەچوو دروستدەبوو.

بەم شــێوەیە توانیمان ناوچەی مەڵبەندی دوو ڕزگار بکەین لەشــەڕی ناوخۆیی، بەڵام زۆری بەسەردا نەچوو هێزەکانی ئەو لایەنانەی باسمانکردن لەگــەڵ پارتی پەلامــاری مەڵبەنــدی چواریانــداو لــەزۆر لاوە هاتوچۆیان بڕی بۆ مەڵبەند. من لای خۆمەوە دوو سێ هەزار دینارێکم بەڕێگای نهێنیدا نــارد بــۆ مەڵبەندو هێزێکی چاکم ســازکردو بــەرەو مەڵبەنــد کەوتمەڕێ، مــن لەلای کانیماران چوومەوە ســەر دۆڵ و کێوەکان، بەڵام نەوشــیروان لــەو دۆڵەدابــوو بڕیاردرا من پەلامــاری ناوچەی نازەنین بــدەم. پەلاماری چیــای پشــتی ســماقولیەکانم دا لەهەمــوو دۆڵــی ســماقوولی هێزەکانــی حسک کە زیاتر لەوێ بوون هەڵمان بڕین بۆ دەشتی هەولێرو بەلای دێگەڵەدا شــۆڕ بووینــەوەو لەپیــرەرو باوەقوبەوە چوینەوە گۆپتەپەو گۆمەشــین و لەوێشەوە بەستی شــەرغەو پاشان پەلاماری دیرەدانمان داو لەباغەمرەوە ڕوو لەکەڵەکی یاسین ئاغا هەڵمان بڕین و ئێمە هەتا دارەتو و کونە گورگ چوویــن و شــەوێک دارەتــووم کۆکــردەوەو قســەم لەســەر وەزعەکە بۆ کردن. پاشــان گەڕامەوە بۆ مەڵبەند، هەتا هاتمەوە هەندێک کێشە لەمەڵبەند ڕوویدابوو، مەســەلەی کوشتنی کچ و کوڕێک کە دابوویانە پەنای مەڵبەند، دووەم کوشتنی کاکە سوور قوڕیتانی نەگەیشتمایەتەوە ئەکرەم قوربانیش دەکوژرا.

بەهەرحاڵ لەماوەی دووساڵدا کە من لێپرسراوی مەڵبەندی دوو بووم، لەهەڵســەنگاندنی ســاڵانەدا لەهەموو ڕووەکانەوە مەڵبەنــدی دوو، یەکەمی مەڵبەندەکانــی یەکێتی بوو، ئەو ســاڵانە دەســەڵاتی ی.ن.ک بەســەر چوار مەڵبەنــددا دابەشــدەبوو، مەڵبەنــدی دوو زۆربەی ناوچەکانی ســلێمانی و هەموو ناوچەی کەرکوکی دەگرتەوە.

لەکاتێکدا مەڵبەندمان دامەزراند زۆر گرنگیمان دا بەکاروباری کۆمەڵایەتی، کێشــەو گرفتە گەورەکانی ناوچەکانمان هەموو هەڵدەســەنگاندو هەوڵێکی زۆرماندا کێشــەکان بەشــێوەی ئاشتیانە چارەســەر بکەین، بەڵام هەندێک کێشــەی زەوی لەهەندێک شــوێن زۆرێک لــەکادرە هەڵەشــەکانی کۆمەڵە

ئالۆزکاندبوویان، یان زیاتر چارەسەری ئاسان نەبوو، هەروەکو کێشەی زەوی لەناوچەکانی سالەیی خوارو و شێخ بزێنی خوارو و سەروو هەندێک لەناوچەکانی شوان و هەندێک ناوچەی قەلاسیوکەو هەندێک لەناوچەی سورداش، گەیشتبوونە ئەوەی زەوی تووکراوی سەوزیان هەلدەگێرایەوە، یان بە گوریس زەوییان دابەشدەکرد. هەرچەندە یەکێتی دەیوت: یاسای کۆماری ژمارە ٩٠ جێبەجێبکەن، جاریکیانم لەیادە چوومە شێخ بزێنی خواروو لەگوندی پەلکانە، جوتیارێکی زۆرمان لێهەلگەڕانەوە کە ڕوانیم کادرەکانی خۆمان لەناوەڕۆکدا کاریان تێکردووە، ئەنجامی ئەوەی بەقسەی ئێمەیان نەکرد کوشتوکوشتار لەنێوانی جوتیاران خۆیاندا ڕوویدا. کاتێک شۆڕش لەناوچەکەش نەما خاوەن زەوییە دابەشکراوەکان بەپالپشتی حکومەت ئەوانەیان دوچاری دەردەسەری دەکرد کە کادیرەکان بەگوریس زەوییان دابوونێ.

تا مەلبەندی دوو بووین چەند جارێک هێزم برد بۆ دەشتی هەولێرو بەهاواری مەلبەندی سێ و چوارە چووم. بۆ مەلبەندی یەکیش هەر لە سەرەتاوە هێزمان بۆ ناردن.

دواجار چوومە بالیسان بۆ کۆبوونەوەی سالانە لەگەل کاک ئەرسەلان بایزو مامۆستا جەمال تایەر، لە بەلالوکاوای دۆلی بالیسانەوە چووینە مێرگەسوورو گەڕاینەوە بۆ بالیسان. لەڕێ سەیارەکەمان لایداو وەرگەڕاو مامۆستا جەمال تایەر شەهید بوو، من و کاک ئەرسەلان و زۆرینەی پێشمەرگەکانی دەستەکەم، بەتایبەتی شەریف قادرو جوتیار حەمە شوان، زامداربووین.

هەر سالی ١٩٨٣ بوو لەبالیسانەوە چووم بۆ وەرتێو لەوێ لەگەل شەهیدان (سەید کەریم، شەهید حەسەن کوێستانی، شەهید ئەحمەد مەولود) و کۆمەلێک کادری سیاسی و عەسکەری یەکێتی لەمالی حەسەن کوێستانی کۆبووینەوەو نەخشەی بەرەو ڕووبوونەوەی هێزەکانی پارتیمان دانا کە لەمەلبەندی سێ نزیک ببوونەوەو هەموو بەرزایی قەندیلیان گرتبۆوە دەست.

شەڕێکی زۆر سەختمان دەست پێکرد، ماوەی دە پازدە ڕۆژێک زۆر ئازارمان چەشت، بەلام پاشان بەهیمەتی هەموو پالەوانە شەهیدەکان، هێزەکانی پارتی و هاوکارانیانمان ڕاوناو لەهەمانکاتدا هێرشێکی جاشمان بۆ هات لە (لوتەرە)وە ئەویشمان تێکشکاند.

هەر ئەو سـەفەرە لەگەڵ نەوشـیروان مسـتەفا لێک عاجز بووین و من گەڕامـەوە بۆ سوورقاوشـان، کە ئەوسـاماڵەکەم لەوێ بوو. لەسـەر ئەوە دڵگران بوو، گوایە من لەوەرەقەی بچووکدا نامەم بۆ ناردووەو داوای شەکرو چام کردووەو لەدوابەشی یەکێک لەکتێبەکانیدا ئەم مەسەلەی باسکردووە.

له ١٩٨٤/٧/٤ گوندی سـەرگەڵووم بەجێهێشـت و مەڵبەندم دایە دەست فەرەیدون عەبدولقادر. ماڵەکەم برد بۆ سوورقاوشـان و ئەو سـاڵە چەمی سوورقاوشـان وشـکی کردبوو، ئێمەش چووینە گوندی شـێخان و لەوێ خێمەیەکمان هەڵدا.

# داستانی (٩١)ڕۆژە لەکوورەی ئەنفالی چواردا

## ڕۆژانی پێش ئەنفال

شەڕەکانی داستانی ڕزگاریی، قەیوان ماوەت، زنجیرە چیای چەرماوندو دامێنەکانی چیای پیرەمەگرون، قوولەپوشینە، قولمەوزە، سپێلک و بنارەکانی شەدەڵە، هۆمەرقەوم، جاسەنە، قەمچوغەو دەشتی مەرگە، بەسەری دەرو و گەورە قەڵاو پشتی هەنجیرەو تا دەگاتە تۆکلی گەورەو تۆکلی بچووک. دامێنی گوندی شارەستێن و هەڵدەگەڕێتەوە بۆ دامێنی هەوارەبەرزەو داری زەکەریای دامێنی خورخوڕەو یاخیان و دادەبەزێتەوە بۆ پشتی قۆمرغان و قەرەنگۆو مەولان و زرموکوتی ئاسەنگەر ئاسایی هێزی دوژمن، لەسەر سەری حەسەن بەگ و دەوروبەری ولاخلو و برزودو بالۆیەو بەرزایی کەژۆستیش، هەمووی شتێکی بەکوڵ بوون کە دوژمنی داگیرکەر خۆی بۆ زنجیرەی ئەنفالە مرۆڤ قرکەرانەکەی ئامادە دەکرد.

لەولاشەوە شەڕێکی گەورەی نابەرامبەری وەها دامەزرابوو لەنێوانی دوو هێزدا:

.یەکەم:

١- ڕژێمێکی ڕەفتار فاشیی داپڵۆسێنەری خاوەن بیری سێکوچکەی بەعسیان بۆ هەڵوەشانەوەو لەبەریەک بردنی مۆرکی نەتەوایەتی کوردو داگیرکردنی خاکەکەی بەبوونی هێزێکی سوپایی جەنگی زۆرو زەبەندو بەبوونی جاشێکی خۆماڵی یەکجار زۆرەوە، کە هەمیشە لەپێشەوەی سوپای داگیرکەربوون لەپەلامارو کاولکردنی کوردستاندا.

٢- دارایی ئامێرەکانی جەنگی سەردەم بەچەکی دوورهاوێژو کیمیاویشەوە.

٣- خاوەنی سوپایەکی مەشقپێکراوی ئامادە بۆ هەموو جۆرە جەنگێکی ناوخۆیی و دەرەکی.

٤- خاوەنی ڕادیۆو بێسیم و تەلەفیزۆن و ڕۆژنامەو هەواڵبەری گەورە گەورە.

٥ـ خاوەنی پرۆژەی نەوت و بوودجەیەکی ئەوتۆ کە لەئاستی جەنگی ناوخۆیدا هەر نرکەی نایەت.

## پەڕینەوە بۆ بەری کۆیە

ڕۆژی (٧/١٤) لەکانی دزانی قۆچەبڵاخی کۆنەوە دڵزارو دڵسۆز لەپێشەوە چووبوون بۆ ئامادەکردنی کەڵەکەکە لەسەر زێیەکە، ئەو شوێنەی پێیدەوترا دۆڵی کادیران دامێنی شیوی کاولان بوو، ئێوارەی (٧/١٦) لەدۆڵی کاولانەوە هێشتا سەعاتێک ڕۆژی زیاتر مابوو بەڕێکەوتین بەرەو نزیکی کۆیەو شەو درەنگ چووینە شـیوەکەی بەرماڵانی سوورە قەڵاتەوە. لەوێ خەڵکی زۆر دەهاتن بۆسـەر ئەرزو شـتی شـاراوەیان، ڕەهبەرو هەندێـک لەکۆییەکان قسـەیان لەگەڵکردبوون لەبابـەت ژیان و مانەوە، ئێـوارەی ڕۆژی (٧/١٥) هاتنەوە لامان و وتیان ژیان لەدەشتی کۆیە لەتوانادا نییە بۆیە بابڕۆین بۆ میر سـەیدو لەوێوە پەیوەندی دەکەین لەگەڵ مەڵبەند، منیش کە زانیم لەوە ترازاوە چاوەڕێی برادەران بکەین بێنە شوێنمان بڕیارماندا هەر ئەو شەوە واتە (١٦/١٥ ـ ٧) بەکوورانی شاری کۆیەدا سەرکەوتین بۆ کانی و ئاوەکەی کانـی بی سەرشـاخ، زۆر ماندوبیووین، وزەمان تێدا نەمابوو، پێشـئەوەی سەرکەوین، لەشیوە لۆچکەیەکدا گۆماوێکی بچکۆلە هەبوو ڕەنگە دە دوازدە گڵاس ئاوی تێدا بووبێت، پڕی لەسـەرەمێکوتەو قەنگەلاشـکەو پیسی بوو، زۆر لەو برادەرانەی نەشـارەزاو تینووبوون خواردیانەوەو منیشـیان بردە سـەری، کاتێک قوومم لێدا بڕوا بکەن لەژەهراو نەبێت لەهیچیتر نەدەچوو، چارمان هەر ڕۆیشتن بوو چونکە نزیکی ڕۆژبوونەوەبوو، تەکانماندا بۆسەر کانی بییەکە لەوێ خۆمان دا بەزەویداو سـەروچاومان شـۆری و ئاومان خواردەوەو خەریکبوو خەو دەیبردینەوە، برادەران وتیان: بگەینە میر سەید لەوێ لەمەترسی ڕزگارمان دەبێت، لوژەلۆژ ڕێگامان بڕی، لەترمان دەبرد، ئەو تۆزە ڕێیەمان لێببوو بەساڵێک، چوینە میر سەید، کۆییەکان بای قوڵیان خۆشـبوو، ناوچـەی خۆیان بوو، کۆیی و خۆیی تێـدا بکەن، خێرا خەڵکیان ڕاسپارد بۆ خەیارو تەماتەو گۆشت یان کەباب و نان.

ئێمە لەناو دارەکانی میر سـەیدا خۆمان دابـوو بەزەویدا، لەپڕێکدابوو بەهـات هات، هەندێـک لەبـرادەران بڕوایانکردبوو، شـوێنەکە لەهات هات دووربوو، تومەز کاک ڕەهبەر دڵی خۆشەو ناوچەی خۆیەتی، گاڵتەی لەگەڵ بـرادەران کردبوو، نیوەڕۆ هات، خەیارو تەماتەو گۆشـتیش هات، بەشـی ئێمە درا، جا خوا دەیزانێ چیتر.. ویسـکی و مەشـروبات بۆ برا کۆییەکان بەدزییەوە هاتبێت.

ڕۆژی (٧/١٨) بوو، گەیشـتینە میر سەیدو هەر ئەمڕۆ ئێران ڕەزامەندی خۆی دەربڕی بۆ ڕاگرتنی شـەڕ لەگەڵ عێراق، ڕۆژی (٧/١٩) میر سـەیدم بەجێهێشـت و لەگـەڵ دەسـتەکەی خۆم بـەرەو گوندی سـکتان و گوندی

چێوەی ســەروو کەوتینە ڕێ، دوای دوو ڕۆژ پشــوودان و دەورو تەسلیم کردنی لیستی پێشــمەرگەکان بەمەکتەبی عەسکەری کە ئەوسا کاک ملازم عومەر بەرپرســی بوو. پاشــان لەگەڵ شــەهیدی نەمــر کاک عەبدولڕەزاق ڕێکەوتین نامەیەکم بۆ بنێرێت بۆ ڕێکخســتنی ســلێمانی بەتایبەت وەســتا بەکــری دارتاش کە براو هاوکارو دڵســۆزم بوو تا ڕووناکی هاوســەرم و کاروان و کارزانی کوڕمم بۆ بنێرێت بۆ گوندی سوورەدێی بناری قەندیل، ئینجــا لەگەڵ دەســتەکەی خــۆم بەڕێکەوتین بۆ هــەورازە پێچاوپێچەکانی دەرەشیرو شێرێ ڕوو لەدۆڵی شاوران و گوندی گولان، کە ئەوسا شەهید عەلــی نەبــی لەوێ بوو، هاوکاری پەڕینەوەی کردیــن ڕوو لەگوندی بۆڵێی بناری قەندیل و ڕوومان کردە گوندی سوورەدێ. ئەوکاتە هێزێکی پێشمەرگە بەبنــاری قەندیلــەوە چاودێــری جموجوڵــی هێزەکانــی دوژمنیــان دەکرد، لەبارەگایەکی پێشــمەرگەکان شــەهید مەریوانی برازام و شــێخ محەمەدی شــێخ حسینم بەجێهێشت بۆئەوەی ئەگەر ڕووناکی هاوسەرم و منداڵەکانم گەیشتن بیانهێنن بۆ گوێزیلە، ئینجا بەوچان بەرەو قاسمەڕەش بەڕێکەوتین، ئەو برا پێشــمەرگانەی لەگەڵم بوون بریتیبوون لەعوســمان عەســکەری و مەریوان عەبدوڵای برازام و ئاراز حەمەدەمین عەســکەری، بەرەو تاتی دۆ لەوێوە بۆ گوندی گوێزێ، دوا قۆناغیشمان کەپرە نایلۆنیەکانی قاسمەڕەش بوو، لەوێ لەبارەگای مەکتەبی سیاســی هەندێک هاوکاری مادیان داینێ و وتیان بڕۆنە ســەقز ماڵ دابمەزرێنن، ئێمەش هەروەهامان کردو لەگەڕەکی شارەوانی لەگەڵ ماڵی مەلا فەرمان خانوویەکمان بەکرێ گرت.

ئــەوەی پێویســتە بیڵێــم ئەوەیــە ٩٠ ڕۆژ بەرگری لەکــوورەی ئەنفالی چواردەاو خۆگری و ئیدارەو مانەوەمان بەهاوکاری برای بەڕێز کاک ملازم عومــەر عەبــدوڵاو ڕێکخراوی ســلێمانی کۆمەڵــەی ڕەنجدەران و وەســتا بەکری دارتاش و برایانی ڕێکخستنی شاری سلێمانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و ماڵی حەسەنی حەمەبەگی موغاغ و براکانی و کۆمەڵێک برای دڵســۆزی شــاری ســلێمانی وەکو عەلی کاکەڕەش و هیمەتی عەبدولکەیم هەڵەدنی و عەتا کافرۆشی بوو.

بە هیمەتی هەموو ئەمانەبوو کە توانیمان لەو ٩٠ ڕۆژەدا خۆمان بگرین بەبێئەوەی تاکە یەک پشمەرگەش لێمان دابڕێت. مامۆستا جەمال محەمەد، وریا ئاغجەلری، عوسمان عەسکەری، سابیر کۆکەیی، مەلا فەرمان، ڕەفعەت عەبــدوڵا، ڕابەری ســەید برایم و پێشــمەرگە ئازاکانــی ٢٥خاڵخاڵان و ٣١ ســلێمانی و مامۆستا عادل، شێخ فەرهاد، بەکر عەبدوڵا، ئاراز حەمەدەمین، هەمــوو ئەوانــەی ناوەکانیانم لەیاد نەماوە، یەکەیەکەیــان پیاوی ئەو ڕۆژە

سەختەبوون و بەهەمووومان لوتی دوژمنمان شکاند.

دوای چەند ڕۆژێک و لە ١٩٨٨/٨/٣١ هەواڵی شەهید بوونی کاک ئازاد هەورامیمان بۆ هات و بڕیاردرا من لەگەڵ د.کەمال خۆشناو روحی شاد بێت، بڕۆین بۆ پێشوازی تەرمە پیرۆزەکەی و هەر لەگەڵ تەرمی پیرۆزیدا بڕۆین بۆ زێدی باوباپیرانی لەهەورامان و هەر لەوێش بەخاکمان سپارد، پاشان گەڕاینەوە شاری سەقزو دواتر بەرەو قاسمەڕەش گەڕامەوە.

## پێشینەی پەیوەندی من و کاک نەوشیروان

دوای گەڕانـەوەم لـە سـەقزەوە بۆ قاسـمەڕەش و هەر لـەو ماوانەدا کۆبونەوەیەکـی کادرو فەرمانـدە سـەربازیەکان ئەنجامـدرا، لەبـارەی بارودۆخـی ئەو ناوەوە گفتوگۆ کرا، لەو کۆبوونەوەیەدا کاک نەوشـیروان وتـی: برادەرینە بڕوابکەن ئەگـەر ئەو برادەرانەی زیندان، دەسـتی بۆلای مـن درێژکردو وتی: ئەگەر ئەمانە نەبوونایە ئێمە بەجۆرێکیتر شۆڕشـمان دەکرد، منیش لەوەلامدا وتم: برادەرینە ئەو کاتەی ئێمە بڕیارمان دا بڕۆینە دەرەوە کاک نەوشیروان هەر لەکۆمەڵەشدا نەبوو.

وەک پێشتر وتومە، کاتی خۆی لەسەروبەندی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشدا ئێمـە نیازمـان وەهابوو بگەینـە دەرەوەی وڵات و لەگەڵ بەڕێز مام جەلال بەرنامەی دەست پێکردنەوەی شۆڕشی نوێ دابنێین و هەریەکەمان بڕۆینە ناوچەیەک و شۆڕش ڕابگەیەنین. ئەم قسەیەی من لەشاری خانە لەڕۆژهەڵاتی کوردسـتان لەناو کادرەکاندا گەورەکرابوو، دەنگۆکە بەخراپ گەیشـتبووە کاک نەوشیروان و لەدڵیدا مابۆوە، هەرچەندە ئەو ڕۆژە کاک ملازم عومەرو کاک بەکـری حاجی سـەفەرو من و کاک نەوشـیروان لەژوورەکەی ئەودا پێکەوە نانمانخوارد بەو نیازەی شتی خراپی لێنەکەوێتەوە.

پێشـتریش پێـش گەڕانەوەی خۆمـان، کاتێک هێزەکەمـان بەڕێکرد بۆ سـەرکردایەتی، من ئاگادار نەبووم، تومەز لەوکاتەدا فەرماندە کاک سابیر کۆکەیی لەلای کاک نەوشیروان بووەو یەکێک لەو کادرانە بەخراپ قسەی لەسـەر من بـۆ گێڕابۆوە، ئەو کەسـەش لەگـەڵ ئێمەدابوو، هـەر لەگەڵ مندا لەدوا شـەڕمان لەگەڵ دوژمن زامداربووبـو و بەهیمەتی ئێمەو کاک عەبدولکەریـم هەڵەدنـی و ماڵی کاک حەسـەنی حەمەبەگ و ڕێکخسـتنی سـلێمانی دەربازمان کرد بۆ ناوشـارو لەوێشـەوە بۆ قاسـمەڕەش، ئەو کادرەمـان ئـاوا نـاردەوە ئەویـش هەتـا توانیبووی قسـەی ناڕاسـت و بێوژدانانەی لەسەر من بۆ کرد بوو، ئەوەش شتی لەدڵی کاک نەوشیرواندا دروسـتکردبوو. ڕۆژگارەکانیش تا دەهات شتی نوێی لەلای ئەو هاوڕێیەم دروستدەکرد.

لەوماوانـەدا بەبڕیـاری مەکتەب سیاسـی من کرابووم بە بەرپرسـی لیژنەی دارایی بۆ گەیاندنی موچەی مانگانەی هێزەکان، لەگەڵ نەوزاد کاکە ڕەش و ئازاد سەرسپیدا کارەکانمان بە ڕێدەکرد.

چەند سـەڵێکیش لەوەوبەر لەشەڕە نەگریسـەکانی قەندیل لەگەڵ کاک نەوشـیروان پێکەوەبوویـن، ئەو لەزارگەلی مەقـەڕی گەرموگوڕی هەبوو، ئێمەش لەگەڵ برا پێشمەرگەکان چلکن و ئەسپێ تێیدابووین، شەڕەکە تەواو بووبـوو بۆ خۆراک و پێویسـتیەکانی ژیان لەسـەر کاغەزێکی ناو پاکەتی جگەرە بۆم نوسـیبوو: بەڕێز برادەران داوا دەکەن کەمێک پشـوو بدەن و پێویستیشمان بەنان و شەکرو چاو جگەرە هەیە، بەڵکو هیمەت بکەن بۆمان بنێرن، بەڵام هیچ دەنگی نەبوو هەرچەندە زۆر دووریش نەبووین، کاتێکیش چوومـە لای زۆر خـراپ لـەو نامەیـە تووڕەبووبوو، ئەوەشـی کردبووە خاڵێـک و لەدڵـی خۆیـدا هێشـتبویەوە. جگەلـەوەش زۆر وردە شـتیتری کەڵەکـە کردبـوو. بەڵام کـە پێکەوە چووین بـۆ لێدانی شـەریکەی نەوتی کەرکـوک کە ئـەو سەرپەرشـتی دەکـردو مـن هێزەکانم هەڵدەسـوڕاند، پێموابوو دڵی پاک بۆتەوە، لەڕاسـتیدا من هەمیشـە ڕێزی زۆرم لێدەگرت، بەڵام دەرکەوت دەوروبەری ئەو خەڵکی ناحەزی زۆر لێبوو، نەیاندەهێشت دڵـی پاکبێتەوە، بەداخەوە زۆربەی سـەرکردەکانی کورد لەژێر کاریگەریی دەوروبـەردان و بـێ لێکۆڵینەوەو سـەبرگرتن زوو هەڵدەچن و بڕیاری نا تەندروست دەدەن.

## تەقینەوە گەورەکە

لەسەفەرێکمدا بۆ شاری ڕەزاییە شەو لای د.ئەرسەلان بایز مامەوەو ڕۆژنامەی بەرەی کوردستانیم بینی کە لەگۆشەی سەکۆی ئازاددا باسی جوان و گرنگ دەنوسرا، لە پێش مندا شەهید ڕێباز دوو بابەتی زۆر جوانی لەسەر کەموکورتیەکانی خۆمان نوسیبوو، ئەوە پاڵی بەمنەوە نا تا لای خۆمەوە شتێک بۆ هەمان ڕۆژنامە بنووسم. کاتێک گەڕاینەوە ڕەزاییە لەماڵی دکتۆر ئەرسەلان منیش دەستمکرد بەنوسین بەو نیازەی هەندێک لەهەڵەکانمان بیربهێنینەوە بەڵکو بۆ لەوەودوا کەڵکی لێوەبگرین، من بەو نیازە ئەوەم نووسی تا بۆ داهاتوومان لەبەرچاوی بگرین، بەڵام کاتێک بڵاوبۆوە، وەکو بۆمبی ئەتومی تەقیەوەو هەر ئەو ڕۆژە بڕیاری تاکلایەنەی کاک نەوشروان دەرچو و بەبێتەل هەموو هێزەکانی یەکێتی لێئاگادار کرایەوە کە عەلی بچکۆل لەڕیزەکانی کۆمەڵە دەرکراوەو بۆ ناو یەکێتیش دەیدەین بەدادگاو دەبێت ٥٠٠ پێشمەرگەش بۆ دادگاییەکە ئامادەبن، چونکە عەلی بچکۆل سوکایەتی بەپێشمەرگە کردووە، هەر ئەوەندەم زانی ڕێگا بە برادەرەکانم دەگیراو قسەی ناشیرینیان پێدەوتراو تەلەفۆن لەسەر تەلەفۆنیان بۆ دەکردم و قسەی هەلەقومەلەقیان تێدا دەوترا، ئەوەش درزێکیتری خستە نێوانمان. بەداخەوە مەکتەبی سیاسی و ئەندامانی سەرکردایەتی هیچ هەڵوێستێکی ڕەسمییان نەبوو لەو بڕیارە تاکڕەویانەی دەرچووبوون، نەشیان توانی نێوانیمان بکەن، ئەو بەنیازبوو من ملشۆڕ بکەم و بچمە بن دەستیی و بەدادگاییەکی ناڕاست و بەزەخت تاوانبارم بکات و وەکو مـلازم جوامێر بەخائین ناوم بزڕینن و بمکوژن، لەوکاتانەشدا دوژمنان دەیانویست کەڵک لەو هەلە وەربگرن، عێراق ڕایانسپاردبوو ئەگەر بڕۆمەوە دەمکەن بە وەزیری دەولەو ئێرانیەکانیش ڕایانسپاردبوو کەمپێکم بۆ بکەنەوەو کێ لەگەڵم بێت هاوکاری بکەن. بەڵام من نە بۆ ئەمانە ملم شۆڕ دەکرد و نەقبوڵیشم بوو سەرەڕای ئەو تەمەنە درێژەو خەباتە سەختە منداڵەکانم سەرشۆڕ بکەم، ئەوەبوو بەڕێگای قاچاغ بەرەو پاکستان بەناوجەرگەی ئێراندا بەبێ بەڵگەو بەبێ ئیجازە گەیشتمە جەحیمی ٩ساڵەی پاکستان، ٩ ساڵی پڕ لەبرسێتی و لەئازارو زیندانی و لێدان و ڕاوەدوونان، ئەوەی بەبیرتاندا نایەت ئەوەندە نەهامەتی و دەردەسەریمان بینی، هەمووشی لەئەنجامی گوێگرتن لەدەوروبەر بێ لێکۆڵینەوەو ڕووبەڕووبوونەوە. بەداخەوە دەبێت چەند تێکۆشەریتر بەو دەردەی من بردرا بێت.

خوێنەری بەڕێز تۆ دادوەر بەو بەراوردی بکە بزانین وتارە نوسینەکەی مـن زیانی بـە یەکێتـی و بە کـورد گەیاند یـان لەتوپەتکردنـی یەکێتی و هەڵوەشـانەوەی یەکێتـی و تێکدانـی میزانـی هێـز لەناوچەکـەدا خزمەتی بەدوژمنان کرد.

## دەرئەنجامی بڕیارەکەی کاک نەوشیروان

ڕۆژی ١٩٩٠/٤/١٨ نەوشیروان مستەفا بەهۆی وتارەکەمەوە بروسکەیەکی دا بەهەموو بێسیمەکانی شۆڕش کە من لەڕیزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران دەرکراوم، لەبەرئەوەی نوسینەکانم لەخزمەتی دوژمندان، منیش ئەوەم ڕەتکردەوەو بەبڵاوکراوەیەک وەلاممدایەوەو تیایدا وتم: من خاوەنی کۆمەڵەم و هیچ کەسێک ناتوانێت دام ببڕێت، هەرچەندە بڕیارە فەردیەکەی نەوشیروان ئەوەبوو من بدرێم بەدادگاو هێزێکی زۆرم لەدەور کۆبکرێتەوە، بەلام من ئەو بڕیارە فەردیەم ڕەتکردەوە. دواتر دەقی وتارەکەو بڵاوکراوەکەم دادەنێمەوە.

لەدوای ئەم بڕیارەوە زۆربەی کادرە بالاکانی یەکێتی پەیوەندیان پێوەکردم، ئامادەی یارمەتی و نێوەندگیریی بوون، بەلام من سووربووم لەسەر هەڵوێستی خۆم.

هەر ئەو ڕۆژە هاوڕێی خۆشەویستم جوانەمەرگ و سەرکردەی ڕۆژە سەختەکانی شۆڕشی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کوردستان، جەبار فەرمان سەری لێدام بۆ ماڵەوە لەشاری سەقزو وتی: ئەمڕۆ برایان کۆسرەت ڕەسوڵ و فەرەیدون عەبدولقادرو ملازم عومەر لەمەهابادەوە دەگەڕێنەوەو دێنە لات و ڕێگاچارەیەک دادەنێن بۆ کێشەی نێوانی تۆو نەوشیروان.

هەمان ڕۆژ بەکری حاجی سەفەرو دلێری سەید مەجید، سەریان لێدام بۆ دڵدانەوەم، هەر بەو بۆنەیەوە ڕۆژانە بەدەیان کادری کۆمەڵەو یەکێتی نیشتمانی دەهاتنە سەردانم و لێیان دەپرسیمەوە، ڕۆژی ١٩٩٠/٤/٢١ هێرۆخان، هاوسەری سکرتێری یەکێتی نیشتمانی لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەدا سەردانی کردم بۆ ماڵەوەو دڵتەنگی خۆی نیشان دا بەرامبەر ڕووداوەکە، ئەگەرچی شێرکۆ بەهەندێک قسەی نامەعقول، دڵی ئێشاندو ئەو دڵئێشانەنەش وایکرد هێرۆ خان بەخراپ بۆ مام جەلالی بگوازێتەوەو ئەویش وشەیەکی خراپی بەکارهێنابوو زۆر دڵمی ئێشاند.

ڕۆژی ٢٢-٤ مەلا ئەحمەدی دزکەرە سەری لێدام و دڵتەنگی خۆی نیشانداو نامەیەکی مەحموود سەنگاوی بۆ هێنابووم، هەم مەلا ئەحمەدو هەم مەحموود سەنگاوی دوو پیاوی تێکۆشەرو دوو پێشمەرگەی دڵسۆزبوون، مەحموود نامەکەی زۆر بەداخەوە بۆ نوسیبوم، دەیوت خۆزگە لەشەڕێک لەشەڕەکاندا لەگەڵ دوژمن شەهید بوویتایە نەک ئەو هەواڵەم ببیستایە لەسەر تۆ. هەمان ڕۆژ مەلا بەختیار بەدلێری سەید مجیددا جوابی بۆ

ناردبـووم كه بەهیـچ لایەكدا نەڕۆم، ئەو ئامادەیـە لەماڵەكەی خۆیدا پەنام بـدات، منیش بەدڵیردا سوپاسـم بۆ نـاردو وتم ببورە من خـۆم بەرنامەم هەیـە. هەر ئەو ڕۆژە جوانەمەرگ و سـەركردە جەبار فەرمان و عومەری سـەید عەلی و ئەرسـەلان بایز بەتەلەفۆن، ئەوان لەڕەزایەو من لەسـەقز، لەبابـەت كێشـەكەوە زۆر قسـەمانكرد، مـن داوامكرد هاوكاریـم بكەن بۆ دەربازبـوون، بەڵام ئـەوان لەو بارەیـەوە هیچیان بۆنەكـراو خێزانەكانیان سەردانیان كردین، هاتبوون بۆ ماڵئاوایی. دواتر خۆم لەڕێگای هەژاری مەلا سـادق و ژنبراكانیانەوە ڕێگامان دابینكرد، هەرچەندە عومەری سەید عەلی ڕای وابوو بیر لەڕۆیشتن نەكەمەوە.

ڕۆژی ١٩٩٠/٤/٢٣ زۆر كادرو پێشـمەرگەی تێكوشـەر پۆل پۆل هاتنە سـەردانم، لەوانـە بەكری حاجی سـەفەر ئەندامی سـەركردایەتی و حاكم قاردی حەمەجان و شۆڕش حاجی و ئەحمەدعەسكەری.

ڕۆژی ١٩٩٠/٤/٢٤ كادری تێكۆشەرو ماندوو، ئیبراهیم جەلال هاتەلام و دڵتەنگی خۆی دەربڕی.

ڕۆژی ١٩٩٠/٤/٢٨ كۆمەڵێك سەریان لێدام لەوانە ئەندامی سەركردایەتی مامۆستا ساڵح ژاژەڵەی، عومەر محەمەد حەسەن سەرگەڵویی، حەمەڕەش سـەرگەڵویی، سامی برای شەهید ئازاد هەورامی، هۆشمەند، شەهید نەهرۆ قەسـرۆكی، مەلا شێخە، ئەحمەد عەسكەری و مامۆستا شێركۆ عەسكەری، ئەم پۆلەش هەموویان پیاوی تێكۆشەرو ماندو و دڵسۆزو كاردی پێشەوەی یەكێتیبوون. ڕۆژی١/٥/١٩٩٠ هەندێك كادری ڕاگەیاندن و پیاوی تێكۆشەریتر سەریان لێدام، لەوانە سەعدون فەیلی كە هاوڕێی زیندانم و كادری دەزگای ڕاگەیاندن بوو، مامۆستا جەلال تەلانی و كۆچكردوو مەردان حاجی عەبدوڵا تەلانی و ئەنوەری برای و هەروەها ڕۆشـنبیر ڕەئوف ئەحمەد كە ئەوسـا لایەنگیری پارتی دیموكراتی كوردستان بوو.

ڕۆژی ١٩٩٠/٥/٣ ڕۆژی یـادی كیمابارانـی بۆردمانی گوندی گۆپتەپەو عەسـكەرە كە لەڕۆژی ١٩٨٨/٥/٣ سوپای سـەدام بە ٨ فڕۆكە بۆردمانیان كـردو خەڵكێكـی زۆر لەمنداڵ و پیـر لەژن و مرۆڤی كورد شـەهیدبوون، بەكری حاجی سەفەرو دلێری سەید مەجید ئەندامانی سەركردایەتی سەریان لێدام و دڵیان دەدامەوە.

ڕۆژی ١٩٩٠/٥/٤ پێشـمەرگەی ماندوونەنـاس و ئەندامـی فەرماندەی هێزی پێشـمەرگە، غەریب عەسـكەری لەقاسمەڕەشـەوە هاتبوو بۆئەوەی

بروا بەمن بهێنێت و لەگەڵیدا بڕۆمە لای نەوشیروان و داوابکەم لێمببورێت، لەکاتێکدا ئەو هەڵەی بەرامبەرم کردووە، زۆر ڕێزم لێگرت و داوای بوردنم لێکرد، چونکە من غەدرم لێکراوە دەبێت ئەو داوای بوردن بکات.

١٩٩٠/٥/٥ شێخ عوسمان سەرگەڵوی هات و وتی دلێر تاقانە باسیکردووە لەدەمی عەبدوڵا بەکرەجۆییەوە گوایە نەوشیروان داوای لەقەرارگای ڕەمەزان کردووە هەندێک کەس لەئێمە یاخیبوون و لەئێراندا دەژین، ئەگەر ڕێگامان نەدەن بیانگرین و بیانهێنین بۆ قاسمەڕەش ئەوە ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ عێراق. هەر هەمان ڕۆژ سابیر کۆکەیی و وریا ئاغجەلەری سەریان لێدام، دوو کادرو پێشمەرگەی دڵسۆزن و پێیانوەهابوو بۆ دەربازبوون لەکێشەکە بگەڕێمەوە بۆ عێراق، کە هەرگیز من بڕوام وەهانەبووەو ڕەفزی داواکەیانمکرد، هەرچەندە ئەوان خۆشیان بڕوایان بەڕژێمی سەدام نەبوو، بەڵام پەرۆشی من گەیاندبوونیە ئەو باوەڕە. هەمانکات شێخ عوسمان سەرگەڵویش شتێکی بیستبوو بەڵام نەیدرکاند.

ڕۆژی ١٩٩٠/٥/٩ پەخشان خانی حەفیدو سەبیحە خانی جەبار فەرمان لەڕەزاییەوە هاتن بۆماڵئاوایی و شەو لامانبوون، هەندێک لەخزمانی پیرشێخیش لەوێبوون، شەو کۆمەڵێک گۆرانی خۆشیان بۆ وتین، بۆئەوەی دڵتەنگ نەبین، بەڵام خوشکانم سەبیحەو پەخشان خان تێر تێر بۆمان گریان و دڵیان سەغڵەت کردین، ئەوان بۆ ڕەنج و ماندویەتی من و ڕووناکی هاوسەرم دەگریان، چونکە ئەوان دەیانزانی ئێمە چەند ماندو و دڵسۆزی گەل و نیشتمانین.

ڕۆژی ١٩٩٠/٥/٩ بوو بەخۆپارێزییەوە سەرم لەکەسایەتی نیشتمانپەروەرو ناسراو شێخ کاکە حەمەی مامە ڕەزا دا لەماڵەکەی خۆی و ماڵئاوایم لێکرد، زۆری پێخۆشبوو، بەچرپە پێیوتم: پێمخوشە لای کەس باسی سەفەرەکەت نەکەیت بۆئەوەی سەرکەوتوبیت، ئەگەر دەتەوێت منیش قسەیەک لەمەسەلەکەتاندا دەکەم، بەڕاستی ئەو پیاوە ئازاو نیشتمانپەروەرە بەهەڵوێست بوو. هەمان ڕۆژ بەکری حاجی سەفەر هاتەوەو سەری لێدام بەڕاستی ئەو هاوڕێیەش هەڵوێستی جوامێرانەی هەبوو.

ڕۆژی ١٩٩٠/٥/١٠ لەوە دڵنیابووم کە دەتوانم دەربازبیم، لەڕێگای پێشمەرگەی ئازاو دڵسۆزو خزمی نزیکی خۆم عوسمان عەسکەری و شەهید مەریوانی برازامەوە ماڵەکەم هەڕاجکرد، خۆم و ڕووناکی هاوسەرم و کاروان و کارزانی کوڕم لەیەکێک لەژوورەکاندا دەرگامان لەسەر خۆمان داخست، ماڵکڕە کوردە سەقزیەکان دەهاتن و ماڵی

هەرزان و تالانیان دەکڕی بۆئەوەی بەشی قاچاغچییەکان پارە پەیدابکەین، پێموایە تەنیا ٢٠ هەزار تومانمان لە د.ئەرسەلانەوە بۆ هاتبوو، پەخشان حەفید دایە دەست منداڵەکان و شتێکی وەهامان نەبوو بەڵام عوسمان عەسکەری و شەهید مەریوان ئازایانە لەدوو ڕۆژداماڵەکەیان تالانفرۆش کردو پارەی ڕێگامان پێکهێنا.

ماڵمان نەمابوو، ناوەناوە دەچووینە ماڵی حەمید محەمەدو کۆتا شەویش سەرمان لەماڵی شێخ عوسمان سەرگەڵویی دا بەنیازی ماڵئاوایی، چونکە برادەرێکی نزیکبوو، بەڵام خۆمان ئاشکرانەکرد کە دەڕۆین، هەمان شەو سەرمان لەلاوی شاعیر هەڤاڵ کوێستانی دا، هەر بەو نیازەوە بەڵام بەوانیشمان نەوت.

ئێوارەی ١٢ لەسەر ١٣ی ٥-٩٠ لەماڵی خاوەنی خانووکەمان، میرزا حسێن، نانمان خواردوو شەویش لەماڵە چکۆلەکەی خۆمان خەوتین، هەر هەمان ڕۆژ جەبار فەرمانی هاوڕێم تەلەفۆنی کرد تا قسەم لەگەڵ بکات، بەڵام من وەڵامم نەدایەوە.

ڕۆژی ١٣-٥-٩٠ ئەو ڕۆژە بوو بەناچاری پشتمکردە نیشتمان و ڕوو لەئاوارەیی سەرم هەڵگرت لەگەڵ ڕووناک و کاروان و کارزان و کارای کوڕەی چەند مانگانەو بەکرو شەهید مەریوانی برازام و پەروینی هاوسەری بەکرو تافانی کچیان، لەسەعات دووی دوای نیوەڕۆداو زۆر بەپەنهانی و بێدەنگییەوە ڕومانکردە تەرمیناڵی ئەسفەهان، بەچاوساغی کوڕانی عەبدوڵا ڕەشید، خەزورانی هەژاری مەلا سادقی کەرکوکی، ئەوەی ئاگاداربوو لێمان تەنیا عوسمان عەسکەری و وریا ئاغجەلەری و شێخ فەرهادی ئاموزای ڕووناک و ئاغا محیی برادەری بەکر، کە هونەرمەندێکی خەڵکی شاری سەقزە، سواری مینیبۆس بووین لەبەرئەوەی هیچ وەرەقەی هاتوچۆمان پێنەبوو هەمیشە لەوە دەترسام لەلایەن سوپای پاسداران و پۆلیسی ئێرانەوە بگیرێین. ڕۆژێکی زۆر تاڵ و ناخۆشبوو، ڕۆژێک بوو هەرگیز بیرم لەسەفەری دەرەوەی نیشتمان نەکردبووە، ڕووناک و پەروین بەبێدەنگی دەگریان دڵیاندەهەژاندم. هەرچۆنێکبوو بەرەو ئەسفەهان ڕێگەمان گرتەبەرو بەشی ژەمێک دووان خۆراکمان هەڵگرت، تاگەیشتین بەئەسفەهان، لەبەرئەوەی بەقاچاغ ڕۆیشتبووین لاماندایە ناو پارکێکی شاری ئەسفەهان لەڕۆژی ١٤-٥-٩٠ لەبەرئەوەی لەڕێگا زۆر ماندوو بووبووین پێویستمان بەپشوو هەبوو، بۆیە تائێوارە پشوومان داو پاشان بەرەو شاری کرمان بەڕێکەوتین، شەودرەنگ بوو گەیشتین زۆر ماندوو بووبووین بۆیە داوامانکرد بمانبەن بۆ ئوتێلێکی پەناو لەوێدا کەمێک پشوو

بدەین، گیانمان بەکوڕەکانی عەبدوڵا ڕەشید بوو چاوساغمان بوون، لەئوتێل ئیسـتقلال دابەزین و هەڵاژاین، لەبەرئەوەی وەرەقەمان نەبوو نەمانتوانی چێژ لەخەوەکەشـمان وەربگرین، سـەعات خۆی دابوو لـە١١و نیوی پێش نیوەڕو عەبدوڵا ڕەشـید کۆنە سـەرلقی شۆڕشـی ئەیلول خۆی و خێزانی سـەریان لێدایـن و مەنجەڵێکـی گەورە یاپراغـی کەرکوکیانەیـان هێنابوو لەگەڵ نانی دەستکردی ژنە کەرکوکیانە، بەڕاستی ڕاستیان وتووە کورد لە ڕێزگرتـن و لەمیـوان و میوانداریدا نموونەیە، ئـەوماڵەش زۆر خزمەتیان کردیـن و پێمانەوە ماندووبون هەرچەندە هیچ بەدڵمانەوە نەنوسـا، چونکە هەندێـک لەکارمەندەکانـی ئوتێلەکە چاودێریان دەکردیـن، هەرچۆنێک بوو تـا سـەعات ٤ و ٥ی دوای نیوەڕۆ خۆمانگرت، پاشـان سـەیارەیان هێناو ڕۆیشتین بۆ تەرمینالی زاهیدان.

دەرچوونمـان لەئێـران و گەیشـتن بەپاکسـتان و نـۆ سـاڵ مانـەوە لەنـاو گێـژاو و دەردیسـەریەکانی پاکسـتاندا، بابەتـی کتێبێکـی گەورەی یادەوەریەکانمـە، کە دەبێتە تەواوکاری ئەم کتێبەو دوابەدوای ئەم، ئەویش چاپ و بڵاودەکەینەوە.

## ئەو وتارەی بووە هۆی سزادانم

ئـەم وتارە لەژمارە ١٨ی سـاڵی دووەم/ لە مارتـی ١٩٩٠ی ڕۆژنامەی بەرەی کوردسـتانیدا بڵاوبۆتەوە، کە ئۆرگانی ناوەندیی بەرەی کوردستانی عێـراق بـووەو ئەمـەی خـوارەوە دەقەکەیەتـی بەهەمـان ڕێنـووس و خاڵبەندی و شێوازی خۆیەوە:

(باوکی کارا) نازناوی خۆمە.

ئایا لەگەڵ جەماوەر چۆن بووین؟

باوکی کارا

لـەم ئاوارەیـی و پەناهەندەییـەدا، لـە شکسـتی ئەمجـارەو چەندەمین شکستی شۆڕشی کوردستان دا، پێویستە هەموومان بەووردی بە خۆماندا بچینەوە ، تیشـک بخەینە سـەر کونـج و کەلەبـەرەکان ، باچیتر جەماوەر چەواشە نەکەین، فێڵیان لێ نەکەێن با جورئەتمان هەبێ قەتماغەی برینەکان هەڵدەینەوەو گۆشتە مردووەکان ببڕین و زامەکان هەتوان بکەین.

شـانازی یە بۆ ڕۆژنامەی بەرەی کوردسـتانی کە دەسـت پێشـکەری کـرد لـە ئاواڵەکردنی لاپەڕەکانی خۆی بۆ یاداشـت کردنـی کەم و کوری بزوتنەوەکەمان، بۆ خۆناسـین و بەخۆداچوونەوە، بۆ ڕاسـت گۆیی لەگەڵ جەمـاوەر. ئەگەر ئەم ڕاسـت گۆییـە ئەمڕۆش بەری نەبێـت ئەوا بێگۆمان دەبێتە دەرس و پەند بۆ نەوەکانی داهاتووی گەلەکەمان.

نووسـینەکانی ناو ئـەم ڕۆژنامەیە جێگای لێ ووردبوونەوەو دیراسـە کردنێکی قووڵە بۆ دەست نیشان کردنی هۆکارە خۆیی و بابەتیەکان. منیش دەمەوێ تیشـک بخەمە سـەر لایەنی ڕابردووی پەیوەندی شـۆرش لەگەڵ جەماوەر.

حزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان لەوسەردەمانەی شۆڕشی کوردستان بەهێزو دەسەلاتداربوو لەناوچە بەرفراوانە ئازادکراوەکان لەگەڵ جەماوەر دیموکراتی نەبوون. ڕاست گۆو ، دەست پاک و داوێن پاک نەبوون، هەرگیز ڕێگامان بەخەڵک نەداوە ڕەخنە بگرن، گلەییمان لێ بکەن.

دوێنــێ ئەوکاتــەی دەســەڵاتدار بووین بــەڵام نەبووبوویــن بەدەولەت کەچی بەهەموو شێوەیەک جوتیاران و هەژارانمان چەوساندۆتەوە جۆرەها فرۆفێڵمان لێ کردوون، درۆمان لەگەڵ کردوون، بە قســەی لوس و زمانی درێژ قەل و مریشــک و گیســک و بەرخمان پێ ســەربڕیون، بە ناهەق لە کاروکاســبیمان کردوون، ســوکایەتیمان پــێ کردوون، چاومــان بڕیبووە ناموســیان. هــەر بەهــۆی ئێمەوە خانوویان ســوتاوە و دەربــەدەر بوون، رەز و بــاغ و بێســتانیان ســوتاوە. یان لــە ناوچەکان دەســەڵاتدار بووین، ماڵیاتــی خەڵــک، رەز و بــاغ و بێســتان، زەوی خەڵکمان تــاڵان کردووە و دەســتمان بەســەرداگرتووە و داومانــە بەکــەس و کاری خۆمان. جۆرەها تومەتی ناڕەوامان بۆ خەڵک دروست کردوە. تا مەرامەکانی خۆمان جێبەجێ بکەین.

چەندان خەڵک، لە شۆڕشەکانی کوردستان دا، بەم شۆڕشەوە دەوڵەمەند بوون و بون بە بازرگانی شەڕ. هەڵس و کەوت و معامەلەیان لەگەڵ خەڵک وەکو ئاغاکانی جاران بوو. روح زل، بە ســوک ســەیرکردنی خەڵک، قێز لێ کردنیــان، گوێ پێ نەدانیــان، تەنانەت کردنیان بە مەقاش بۆ جێبەجێکردنی مەرامە شۆڕشگێڕەکان.

ئای کە خەڵکمان چەوساندەوە، زوڵممان لێ کردن، سەدانیشمان بە دزی ســەرنگون کرد. ئێســتا جەنازەی ســەدان خەڵک وونە و کەسیش ناوێرێ فزرە بکات. خوێنەری بەڕێز:

بــا ئیتــر بە ویژدانەوە پێ لە راســتیەکانەوە بنێین – بــە ناهەق هەزاران خەڵکمان رووتکردەوە، تاڵانمان کردن، زێڕ و پارەو پولەکانیانمان بۆ منداڵەکانی خۆمان دزی! دەیان و بگرە ســەدان سەیارەی خەڵکمان دزی و سوتاندمان، بگرە خاوەنەکانیشیانمان بە نا هەق دەکوشت!... هەر وەکو کاک سابیر عەلی ئەحمەد، لە ســەکۆی ئازاد، نووســیویەتی بە راستی شوورەییە بۆ حیزب و رێکخراوێکی چەوساوە، کە داوای دیموکراتی دەکات، مافەکانی پێشێلکراوە کەچــی هەر ئەو حیزب و رێکخراوانە نــەک هەر دیموکراتی نەبوون لەگەڵ خەڵک بەڵکو دیکتاتۆر بوون.

با هەندێ بگەڕێینەوە ئەو ســەردەمانەی کە حاکمی کوردســتان بووین. کــێ ئــەو رۆژانەی لە یــاد نەماوە کە بــێ بەزەییانە بۆ ســەعاتە رێگایەک بارمان لە ســەر پشتی تراکتۆر و ســەیارە و وڵاخ دادەبەزاند، تراکتۆرمان لــە جووت بەردەدا. دەیــان جار عارەبانەی تراکتۆرمان لە کەندێک پەنایەک بەجێ دەهێشت، تراکتۆرەکەش بە ئارەزووی خۆمان دنیای پێ دەگەڕاین، تا

شەق و شرمان نەکردایە بەجێمان نەدەهێشت. خاوەنەکەشی دووای چوار پێنج ڕۆژ گەڕان عەرەبانەکەی لە شوێنێک و تراکتۆرەکەی لە شوێنێکی تر دەدۆزیەوە، بەڵام سەدان دیناری دەویست بۆ چاکردنەوەیان. گالۆن و سۆندە ببووە دروشمێکی ئەم شۆڕشە. دیارە بەنزین وەرگرتن کارێکی ئاساییە ئەگەر بە ئوسوڵ و ئیحترامەوە وەربیگریت. بەڵام چ سایقێک توانای ئەوەی هەبوو بڵێ بەنزینم نییە، یان هەندێ رووی خۆش نەبوایە، سەرباری ئەوەی هەموو گیانیان دەشکاند سویچەکەشیان لێ دەستاند و خوا دەزانێ چەند ڕۆژ سەیارەکەیان دەبرد! کاتێ خاوەنەکەش سەیارەکەی دەستدەکەوتەوە تایەرەکانی لەژێر نەدەما. لە هەر گوندێکیشا ماڵێک تەلەفزیۆنی ببوایە ئەوا ئەو پاترییەی کە تەلەفزیۆنەکەی کار پێدەکرا لەبەر سەیارەی پێشمەرگە نەدەکەوتە ماڵەوە. ئەگەر لە ماڵیش بوایە، ئەو ماڵە دەبوو بە مەقەڕی پێشمەرگە و تا دووا دەقیقەی بەرنامەکان دەبوو بە دیوەخان. بەم جۆرە منداڵی ماڵەکە نەک هەر خێریان لە تەلەفزیۆن و ماڵەکەی خۆیان نە دەدیت، بەڵکو ماڵەکەیان دەبوو بە دۆزەخ و هیچ ئازادیەکیان نەدەما. بۆیە کابرای خاوەن ماڵ بە ناچاری تەلەفزیۆنەکەی دەفرۆشت.

برایان:

زەوی بەگوریس بەشکردنیش دیاردەیەکی ئەم شۆڕشە بوو. هەر کادیر و مەسئولی ناوچەیەکیش بە ئارەزووی خۆی گوریسی دەست دەدایە و زەوی دابەش دەکرد. جاری وا هەبوو زەوی چێندراو دابەش دەکرا و تراکتۆری دەخرایە سەر. گەلێ جار کادیری ناوچەیەک بەپێ ی ئارەزووی خۆی بە بێ گوێدانە سەرکردایەتی، زەوی دابەش دەکرد. ئەو زەوی دابەش کردنەش چونکە لەسەر بناغەی زانستی نەبوو. هەڵچوونێکی سەرپێی و نەفامانەی چەپڕەوی بوو، بۆیە دەبووە دروست کردنی گیرو گرفت لە نێوان برا جوتیارەکان. دەیان جوتیار بە هۆی ئەو رەفتارە نا بەجێ یانەوە بوون بە دوژمنی یەکتر. تەنانەت یەکتریان دەکوشت. بەشێکیان تەسلیم بە رژێم بوونەوە. دەیان جوتیاریش کە دوو لات زەوی هەبو هەر لە خۆمانەوە بیانوێکمان پێ دەگرت و تومەتی دەرەبەگ و کۆنەپەرستمان دەدایە پاڵ. ئای چییمان بەو خەڵکە بێگوناهە کرد، چەند ئازاری خەڵکمان دا، چەند زوڵممان لێکردن بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی باشمان بۆ کردبن. ئەگەر ماڵێک کوڕێکی دژی شۆڕش بوایە ئیتر ئێمە هەموو ماڵەکەمان تاوانبار دەکرد، خانوەکەمان دەسوتاند، یان دەمان گرتن. ئایا چەند کەسمان کوشتووە کە براکانیان پیاوی رژێم بوون؟ بەبێ ئەوەی کوژراوەکە هیچ تاوانێکی هەبووبێ، بگرە دۆستی شۆڕشیش بوو.

ئەو هەموو هەڵە و کەم و کوڕیانەی ئێمە بوون بە هۆی دوورکردنەوەی خەڵک لە شۆڕش، دڵ رەنجانی خەڵک لە شۆڕش.

تاکـە رێـگا بـۆ چارەسـەرکردنی برینـەکان ئـازادی و دیموکراتیـە، بەخۆداچوونەوەیە، سـڵ نەکردنەوەیە لە رەئی دەربڕین. ئەگەر بە خۆماندا نەچینەوە و برینەکان ساڕێژ نەکەین داهاتوومان لە رابردوو باشتر نابێت.

## دەقی ڕوونکردنەوەکەم

ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

بۆ/ هەموو پارت و ڕێکخراو و لایەنێکی سیاسی کوردستان

سڵاوێکی گەرم

بەپێویستم زانی بیخەمە بەردەمی ویژدانی هەموو مرۆڤێکی سیاسی و نیشتمانپەروەری کوردستان، لەسەرەتای شەستەکانەوە بەشێوەیەکی نوێتر لەسالان و شۆڕشە کۆنەکانی کورد، بزوتنەوەیەکی چالاکانەی چەکداری لەکوردستانی عێراقدا بەرپابوو، ماوەی ٢٩ ساڵ درێژەی کێشالە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١ هەتا ١٩٨٨، دوو شێوە شۆڕش بەسەرکردایەتی تاکە پارتی و چەندان پارت و ڕێکخراوی سیاسی کوردستانی، بەلام هەر شتێک بووبێت بەهۆی، هەردوو بزوتنەوەکە بەچۆکدا هاتن هەریەک بەشێوەیەک. دیارە لای بەڕێزتان ڕۆشنە بزوتنەوەکەمان بێ دۆست و پشتیوانە، ئەو دۆست و پشتیوانانەی هەشیبوون ئەوەندە بەجدی و بەگرنگ دۆستایەتیەکەیان نەگرتووین، هەروەها دوژمنانی بزوتنەوەکەش لەهەر سێ لاوە ئابلوقەیان داوین، جارجارە کە ناکۆکی لەنێوان دووانیاندا هەبووبێت دەرگایان بۆ خستوینەتە سەر پشت، نە بەنیازی دۆستایەتی، بەڵکو بەنیازی کەڵک لێوەرگرتن و بەکارهێنان، گەلی کوردو سەرکردایەتی بزوتنەوەکانیش بەچارو ناچاری دەستیان لەگەڵ تێکەڵ کردوون بەبیانوی چارە نییەو دەروازەیەک نییە هەتا چارەسەری زامداری جەنگەکەمانی پێبکەین، جگەلەوە هەندێکجار لەوەش ترساون ئەم یان ئەو دەوڵەتیان ئەویتر بڕوخێنێت و پاشان مەجال نەمێنێت ئەمان خەبات و ژیانی تێدا بگونجێنن، لەسەرئەنجامی ئەم بۆچوونانە منیش وەکو پێشمەرگەیەکی کۆنی بەشداربوو لەهەردوو قۆناغەکەو شۆڕشەکەدا ئەوەی بووبێت بەجێگای سەرنجدانی بیرو ویژدانم، ویستم لەسەر چەند لاپەڕەیەک تۆماری بکەم و دەرگایەک بکەمەوە بۆ مشتومڕ لەسەرکردن، بەنیازی ئەوەی خزمەتێک بێت بەگەل و بزوتنەوەکەمان، ئەوەبوو لەلاپەڕە بەناو ئازادەکانی ڕۆژنامەی بەرەی کوردستانی چەند مەقالێکم نووسی، دیارە من شەش مەقالم نووسیوە لەبەردەمی برایانی بەرەدا بوو، زۆر لەوەش زیاترە کە نوسراوە، بەنیازبووم زنجیرەکە تەواو بکەم لەسەر ئەوەی بۆچی شۆڕشەکەمان سەرنەکەوت، هۆیەکانی چیبوون و وام نیشاندابوو کە مەرجەکانی دەستپێکردنی شۆڕش نەهاتبوونە

دی کە شەڕ بەسەر خەڵکی کوردستاندا سەپێندرا، هەروەها هەڵەو کەموکووڕیە خۆییەکان، گەلەکۆمەکێی دەوڵەتە دراوسێکان، بوونی سەرەواتی مەعدەنی خاکەکەمان، سیاسەتی دەولی دەوڵەتە گەورەکان، دەوڵەمەندی و کۆمەک پێکردنی حکومەتەکانی یەک لەدوای یەک هاتووی دوژمنی گەلەکەمان، گەشە نەکردویی کۆمەڵگاکەمان و ناکۆکی و دووبەرەکی توندو کوشتاری بەناهەقکراوی درێژخایەنی نێوان پارت و ڕێکخراوەکانی خۆمان، هەموو ئەمانە بوون بەهۆی شکستەکە، ئەمانەی باسیشم کردن تەنیا ئۆباڵەکەی بۆ یەکێک و دووان ناگەڕێتەوە، بەڵکو دابەشدەبێت بەپێی دەسەڵات و زەمان و زەین واتە بارودۆخ، جا دەربڕینی ڕەئی خۆم تانووت لێدان نەبوو بۆ عەمر یان زەید، بەڵکو بۆ سەرجەم بوو بەخۆشمەوە، ئەگەرچی ڕەنگە من وەک نووسەرێک نەمتوانیبێت باش بیپێچمەوەو بیانوو نەدەمە دەست فرسەت تەڵەبەکان، ئەوانەی بێویژدانانە بەدوای شکانی تێکۆشەرەکاندا دەگەڕێن بۆ شاردنەوەی خوێنڕێژی و بێویژدانی خۆیان و هەر تینوی خوێنڕشتن و پیاوکوشتن و شەڕوشۆڕی ناوخۆیی دروستکردنن لەپاڵ چەپخوازی مارکسی و لینینیدا، ئەوانە لەژێر ئەم پەردانەداو دڵڕەشی و دەستڕەشی و ترسنۆکی خۆیانی پێدەشارنەوە، هەلبازانە فرست دەهێنن و ملی چەندان تێکۆشەر دەشکێنن و فەرمانی کوشتنی چەندانیان داو چەندان کچ و کوڕی بێتاوان بەفەرمانی ئەوان و لەسەر دەستی ماستاوچییە ترسنۆکە دزەکانیان کوژران، هەڕەشەو گوڕەشە لەچەندان جوتیارو کرێکارو کاسبکارو قوتابی و مامۆستاو بیانوو پێگرتنیان و دەرپەڕاندنیان بۆئەوەی نیشانی بدەن ئەو ترسنۆکانە هەرخۆیان پاڵەوانی مەیدانی ڕۆژی ڕەشن، ئەگەرچی هەموو کەس چاک دەزانێت لەڕۆژانی ڕەش و لێقەوماندا پشتیان دەئێشاو هاواری نهێنی کۆبوونەوەی پەنهانیان ئەوەبوو چی لێدەکەن هەوڵی عیلاجی بۆ بدەن وا شەڕ گەیشتە سەر سەری و هاوڕێ مساوەمەچییەکانیشیان بۆ ڕێگە خۆشکردن بۆ خۆیان پاڵیان پێوە دەنا، بەرزتر برۆ ئێمە لێرەین، هیچ غەمت نەبێت، پاش ساڵێک ڕۆیشتنی خۆی قەترەی لێبڕین و چۆلەکەی گوێسوانەی خۆی و خزمانیشی گەیاندە سویدو لەندەن و سووریاو وڵاتانی ئەسکەندەناڤی.

بەڵێ هەموو ئەمانەی باسمانکردن شتێکی پەنگخواردوو بوو لەدەروونی پێشمەرگەیەکی تەمەن ٢٩ ساڵەی خەباتی نەخوێندەوارێکی ماندووی خاوەن کوڵێک ماندوێتی و قوربانی، وەڵامەکەی بە بروسکەیەکی دیکتاتۆریانەی فەردی بۆ درایەوە؟ هاوڕێ ماستاوچی و خۆفشکەرەوە دزەکانی لێی بێدەنگ و قڕوقەپ بوون، جا هەر ئەوە مایەوە بۆ ڕازیکردنی دڵی بێویژدانان بگەڕێن کای کۆن بە بابکەن و پێشمەرگەی ماندو و بێتاوان هان بدەن کە

گوایه ئەم پیاوە بەویژدانە بەرگری لەھەقی گشتی دەکات.

ئەی پارتی و ڕێکخراو و لایەنە نیشتمانپەروەرە تێکۆشەرو بەڕێزەکان، ڕوو لەویژدانـی ئێوە دەکەم، هاناش دەهێنم هەتا کەی خەڵکی کوردسـتان بناڵێن بەدەست تاکە نەفەری دیکتاتۆر، تا کەی گوێ و ویژدان لێی بێدەنگ دەبێت، پاش ٢٩ ساڵ ماندوو بوون، خەڵک بەشەهید دان، زیندان، هیلاکەت، فیـداکاری بێوێنـە، تەنهـا لەسـەر دەربڕینی ڕەئیـک، لەوڵات، لەسـەنگەر، لەکوردسـتانێک ٢٩ سـاڵ خۆمی بۆ بەکوشت دەدەم، ئێستا دیکتاتۆر (میر) بەئاسانی، بە جیهازێک لە هەمووی بێبەریم بکات و هێشتا دڵی ئاونەخواتەوەو داوت بۆ دابنێت بۆ ڕیسـواکردنی زیاتر بەوەشـەوە نەوەستێت و جوێن و هەڕەشـە لەکەسوکارو ناسـیاو و برادەرانت بکات و لەخەبات و ماندوێتی دەرت بکات.

من ناڵێم، ئێوە بڵێن ئەمە ڕەوای هەقە لەسیاسـەتدا؟ یان خۆگێلکردن و بێویژدانییە هەندێک کەس دەیکەن.

لایەنە نیشـتمانپەروەرە بەڕێزەکان، ڕێکخراوی مامۆستایان، قوتابیان و کرێکاران، جوتیاران، ئافرەتان، ئەی ڕێکخراوە حقوقییەکان، ئەی دادپەروەران، ئەی ئەوانەی ویژدانتان هەیە بۆ بێدەنگ دەوەستن، ئەی هێزی پێشمەرگەی هەرگیز نەبەز، ئەی ئەوانەی لەسەر لاشەی ئێوە چی ویستیان کردوویانەو هەر ئێوەش بێبەش و بە بەرچاوتانەوە کەسوکاری خۆیان دەرباز دەبن بە پشـتی فڕۆکەو ئێوەش لەئەنجامدا من ئاسـا بەسواری گوێدرێژو بەڕێگای قاچاغ و بێ پارەوپول مل لەهەندەران دەنێن، ئێوە بۆ بڕوای پێدەکەن و بۆ دەنگی ویژدانتان هەڵناگەڕێتەوە و ڕسوای بکەن.

تـا نامەیەکیتـرو ڕوونکردنەوەیەکیتر هیـوای بەردەوامـی لەخەبات و سەرکەوتن و درێژەدانتان بۆ دەخوازم.

براتان

دەرکراوێک بەزۆر

# بروسکەی بەڕێز مام جەلال بەبۆنەی گەڕانەوەم بۆ کوردستان

ژمارە/ ٢٧
ڕۆژ/ ٢٧/٤
کات/ ١٨/٢

لە/ مام جەلالەوە
بۆ/ جەنابی بەڕێز کاک علی بچکۆل
سڵاوێکی گەرم

بیستم کە تەشریفتان هێناوەتەوە بۆ کوردستان بە خێر بێنەوە سەر چاومان، خۆشحالیشی بووم کە ئێستا باری تەندروستیتان لە چەند مانگەی پێشتر باشترە. لە جیاتی من لە جەنابی عائلەوە و منداڵەکان بپرسە و هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم. دووبارە بە خێر بێنەوە و چاومان ڕوون. هەر شاد و سەربەرز و سەرکەوتوو بن.



یەکەم ڕۆژی هاوسەرگیریمان ساڵی ١٩٨٠

## ئاهەنگی نەورۆز لە چەمچەمال سالی ١٩٦٧









سالّی ١٩٦٧ کۆنفرانسی تیمار لە قەرەداغ



بۆکان ساڵی ١٩٨٠

سەرگەڵو ١٩٨٤





بەرگەڵو لەگەڵ شێرکۆ بێکەس ١٩٨٤

لەگەل جەبارفرمان و سەبیحەخانی هاوسەری





پۆلیک پیشمەرگە زیوی ١٩٨٨

ئەشکەوتی دوو کونی چەمی ڕەزان یەکەم مقەڕی پێشمەرگە





یەکەم بنکە بۆ ئیشوکاری کۆمەڵە لە چەمچەماڵ



لەگەڵ ئیبراهیم سوری، پێشمەرگەی هەمەدان و
شۆڕشی نوێ

## کورتەیەکی ژیانم

- عەلی محەمەد قادر
- ١٩٤٣/٧/١ لەگوندی عەسکەری سەر بەناحیەی ئاغجەلەر، لەخێزانێکی هەژاری گوندنشین چاوم بەدنیا هەڵهێناوە.
- دوای چەند خوشک و برایەکی بێموراد، کەوتومەتە بەر ئازارەکانی ژیان.
- مێردمنداڵیم بەشوانی و بەرخەوانی و سەپانی و دارهێنان و چەندین دەردیسەری دیکە بردۆتەسەر.
- لاوێتیم بەشاخەوشاخ و سەنگەرو بەشێکی چاکیشی بەزیندانەکانەوە بردۆتەسەر، هەروەها ئاوارەییش نیوەی تەمەنی بردووم.
- لە ٩/١١ /١٩٦١دا بەشداری گرتنی دەربەندی بازیانم کردووە لەسەردەمی حکومەتی عەبدولکەریم قاسمدا.
- ٣ /٣ / ١٩٦٢ بۆ یەکەمجار بووم بەپێشمەرگە، ئەوسا بەپێشمەرگە دەوترا کۆمەڵەکان، تا هەرەسی شۆڕشی ئەیلول پێڵاوی پێشمەرگایەتیم دانەناوە، هەر لەو بوارەشدا هەموو جۆرە ئەرکێکی شۆڕشم بینیوە، هەر لە چالێنان بۆ لێپرسراوی گەورەو فەرماندەی دەستەو فەرماندەی کەرت و لێپرسراوی کۆمیتەی ڕێکخستن و جێگری بەتالیۆن و جێگری هێز.
- لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا خەڵکیان بەمن ترساندو ٥٩ ڕۆژ لەچەمی ڕەزان و لەئەشکەوتدا زیندانی بووم.
- ساڵێک ئاوارەی هەمەدان بووم.
- لەسەرەتای ساڵی ١٩٧١ بوومەتە ئەندامی کۆمەڵەی مارکسی لنینی بیروباوەڕ ماو تسیتۆنگ، لەکۆمەڵەشدا تا ئەندامی سەرکردایەتی گەیشتووم.
- لەساڵانی سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانیشدا، بۆ دامەزراندن و گەشەکردنی بەدڵ تێکۆشاوم و تا پلەی ئەندامی سەرکردایەتی و ئەندامێتی دەزگای پێشمەرگایەتی گەیشتووم. لەئەیلولی ١٩٧٩دا پاش ئازادبوونم لەزیندانی عێراق، بەشداریم لەشۆڕشی نوێدا کردووە.
- فەرماندەی هەرێمی دوو بووم، هەروەها لەدامەزراندنی مەڵبەندەکانی یەکێتی نیشتمانی، لەچوار مەڵبەند من لێپرسراوی مەڵبەندی دوو بووم، کە ١١ تیپ لەتیپە ئازاکانی گەرمیان لەژێر کۆنترۆڵیدا بووە.
- چوار ساڵ لەعێراق زیندانی بووم، چوار مانگ لەئێران زیندانی بووم، هاوڕێی زیندانی شەهیدان خاڵە شەهاب و جەعفەرو تێکۆشەرەکانی دیکەی

کۆمەڵەی ڕەنجدەران بووم.
- زیاتر لەچوار مانگ لەپاکستان زیندانی بووم لەسەر داوای سەفەر پێکردنمان لەڕێی یۆئێنەوە بۆ وڵاتانی موعاهەدەی وەرگرتنی پەنابەرانی سەر بەیوئێن.
-نۆ ساڵ لەگێژەنی پاکستان لەگەڵ ماڵ و منداڵمدا لەئاوارەیی و لەگۆڕەوشاردا ژیاین.
- لە١٩٩٩/٤/٦وە لەنیوزلەندا دەژین، ژیانێکی مرۆڤانە، بەڵام ئاوارەین و هەر شوێنێک چەند جوان و خۆشیش بێت ناگاتە وڵاتەکەی خۆمان.
- میدالیای کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانم پێبەخشراوە.
- میدالیای یەکەم پۆلی زیندانیە سیاسیەکانم لەلایەن بەڕێز مام جەلالەوە پێبەخشراوە.

- له راستیدا من هەمیشه رێزی زۆرم له کاك نەوشیروان دەگرت، بەڵام دەرکەوت دەوروبەری ئەو خەڵکی ناحەزی زۆر لێبوو، نەیاندەهێشت دڵی پاکبێتەوە، به داخەوە زۆربەی سەرکردەکانی کورد له ژێر کاریگەریی دەوروبەردان و بێ لێکۆڵینەوەو سەبرگرتن زوو هەڵدەچن و بڕیاری ناتەندروست دەدەن.

- هەر که ئاشکرابوو مەکتەب سیاسی و سەرۆکی پارتی لێکدابڕان، هەوڵدەدرا گەشه به کوشتن بدرێت، بۆ خۆچاککردنی یەکێکی سەر به مەکتەب سیاسی بکوژێت تاکو پلەی بەرزبکرێتەوە و دەریبخات دڵسۆزی سەرۆکی پارتییه. بەم شێوەیه ئەنجامی ئەو ناکۆکییه لەوپەڕی پەرۆشی و دڵسۆزی و خۆشەویستی و خاوەنی بیروباوەڕە گەیشته ئەوەی دەستیان سوور بکەن به خوێنی یەکتری و هەرچی پێی بڵێیت بیروباوەڕ و دڵسۆزییه نەمایەوە!